حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٢٤٧)

# مامۆستا عەزیز

## ژیانێکی پاک و شەهیدی دەستێکی ناپاک

کۆکردنەوەو ئامادەکردنی
محەمەد شێخ عەبدولکەریم سوڵەیی

مامۆستا عەزیز

# ژیانێکی پاک و شەهیدی دەستێکی ناپاک


ئامادەکردنی: محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆڵەیی

تایپ و نەخشەسازی: ئاراس حەمەئەمین

نەخشەسازی بەرگ: دیاری جەمال

سەرپەرشتیاری چاپ: عەتا مەحمود

چاپ: چاپی یەکەم – سلێمانی ٢٠٠٤

چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری

تیراژ: (٢٠٠٠)

ژمارەی سپاردن: (٣٠٦)ی ساڵی (٢٠٠٤)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# پەیڤێـــــــک

گەنجێکی خەڵکی گوندێکی ناوچەی قەرەداغ بووم . لەبەر نەبوونی قوتابخانە ، لەگوندەکەماندا بەمەبەستی خوێندن هاتمە سلێمانی لەقوتابخانەی ناوەندیی جمهوری دەمخوێند ، چەند قوتابییەك بوونە هاوڕێم یەکێك لەو قوتابییانە عەزیز مەحمود بوو .. ساڵانێکمان بەیەکەوە بەسەر برد .. ئەو ساڵانە بەدەیان بیرەوەری تاڵ و شیرینی تیادابوو .. زوربەیانم نووسیبوونەوە ، لەبۆنە و سەیرانەکاندا ، چەندین وێنەمان گرتبوو . بەڵام بەهۆی باری ناهەمواری گەلەکەمان و گوشاری دڕندانەی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عیراقەوە بۆسەر بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد .. نەك وێنە و دەفتەری بیرەوەریمان لەناوچوون ، بەڵکو ماڵ و گوند و شارو شارۆچکەمان وێرانکرا ، بۆ نووسینەوەی هەرکارێکی (سیاسی و مێژویی و ئەدەبی و رۆشنبیری) پێویستمان بەسەرچاوەی زۆر هەیە .. سەرچاوەی نووسینەوەی بیرەوەریش .. دەفتەری ساڵانەو رۆژانەی بیرەوەرییەکان و ئەو وێنە و نامە و بەڵگەنامانەیە کەدەپارێزرێن .. من هەموو ئەو نامە و بەڵگەنامەو وێنانەم بەهۆی رووداوە جۆراو جۆرەکانی کوردستانەوە زوربەی زۆریان لەناوچوون لەو رۆژەوەی (مامۆستا عەزیز) شەهید کراوە ، لەبەرنامەمدایە کە کورتەیەك لەمێژووی ژیانی ئەو هاوڕێ خۆشەویست و تێکۆشەرەم بنووسمەوە .

لەساڵانی هەشتاکاندا .. نووسینێکم لەبارەیەوە نووسی ، لەشێوەی چیرۆکێکدا و ناردم بۆ دەزگای ناوەندی راگەیاندنی کۆمەڵە لەدەرەوە . بەداخەوە ئەو نووسینەم نازانم گەیشتە جێی خۆی ، یان لەناوچوو ؟ ، ئەو نووسخەیەی لای خۆشم بوو ، لەکاتی گرتنمدا لەناوچوو ، ئەو کاتەی

لەزیندانی ئەبوغرێب بووم . کەڵکەڵەی نووسنەوەی مێژووی ژیانی مامۆستا عەزیزم کەوتەوە سەر ، ئەوەش بەهۆی ئەوەوەبوو لەبەندیخانە کەکەوتمە نووسینەوەی بیرەوەرییەکانم لەنووسینەکاندا مامۆستا عەزیز دەبوو بەتیشکێکی پرشنگداری نووسینەکانم . چەند لاپەڕەیەکی بیرەوەریم نووسییەوە ، بەڵام لەبەر بارودۆخی زیندان نەمتوانی کارەکەم تەواو بکەم . بەنیوەناچڵی وازملێهێنا ... دوای بەربونم .. ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی کاری حیزبی و رێکخراوەیی بووم .. سەرقاڵیم بەئیش و کارەوە لەلایەك و ئاڵۆزی لایەنە سیاسییەکان و شەڕی خۆکوژیی کوردستان ، زۆر بەرنامەی لەبیر بردمەوە .

من هاوڕێی خەباتم زۆربوون چەندینیان شەهید بوون ، لەشەهیدەکان دوو کەسیان کاریگەرییان لەسەرم هەبوو ، یەکەم مامۆستا عەزیز وەکو هاوڕێیەکی قۆناغی خوێندنی ناوەندیی و ئامادەیی و زانکۆ و بواری سیاسیی و کوردایەتی ، دووەم مامۆستا جەمال تاهیر وەکو هاوڕێیەکی مەیدانی خەباتی کوردایەتی لەبواری پێشمەرگایەتی و کاری نهێنیدا .

لەئەنجامی نزیکبوونەوەم لەکەسوکارو بەتایبەتی خوشکی شەهید عەزیز ، (نازەنین خان) و سەردانکردنیان بەرنامەی پرۆژەی نووسینەوەی مێژووی ژیانی شەهیدم لا گەڵاڵە بوو .. سەرەتا لەگەڵ نازەنین خاندا چەندجار گفتوگۆمانکرد ، ژمارەیەك وێنەی رۆژانی خوێندنی زانکۆمانی لابوو سەیرمکردن ، لەسەیرکردنی وێنەکانەوە بڕیارمدا پرۆژەکە دەستپێبکەم .. ئەوەشی زۆر هانیدام ، لەراستیدا ئەوەبوو دەمبینی رۆژانە و ساڵانە .. کۆڕی ساڵانە بۆ شەهیدان لەلایەن کەسوکارو حیزب و لایەنە سیاسییەکانەوە دەکرێت بەتایبەتی لەناو (ی.ن.ك)دا ، بووبەنەریتێکی

شۆرشگێری ساڵانە بەدەیان یاد و بیرەوەری دەکرانەوەو دەنووسرانەوە ، هەستم دەکرد کارەکە زیاتر پەیوەندی بەنزیکی شەهیدەکانەوە بوو لەبرادەران ، یان هەڵپەی کەس و کاریان . ئەوەی زۆر سەرنجی راکێشام لەماوەی ئەم هەموو ساڵی ئازادی کوردستانەدا . تەنها یەکجار کۆڕێك بۆ یادی شەهید عەزیز کرا .. لەکاتێکدا سەیرمدەکرد مامۆستا عەزیز هاوڕێی زۆری برادەرانی سەرکردایەتی (ی.ن.ك) بوو ، بەڵام کەس لەو برادەرانەی لەخەمی مامۆستا عەزیزدا نەبوون وەکو پێویست . لەکاتێکدا دەشمبینی شەهیدی وابوو ، نەك جارێ بەڵکو ساڵانە کۆڕی بۆ رێکدەخرا ، نووسینیان لەسەر دەنووسرا . لەکەناڵەکانی راگەیاندندا بەرنامەی تایبەتیان بۆ سازدەکرا و باسی خەبات و رۆژانی شۆڕشگێرییان دەکرا .. ئەو نەریتە کارێکی وەفای شۆڕشگێڕیی بوو ، بەلایمنەوە (شەهید) هەر شەهیدە .. جیاکردنەوەیان بەشێوەیەك کاریگەریی و گازندەی لەناو بنەماڵەکان و کەسوکاری شەهیداندا دروستکردبوو .. وەکو دەڵێم شەهید شەهیدە ئەوەشم لەبەرچاوە کە (پێشمەرگەیەك) جیاوازە لەفەرماندەیەکی خاوەن ئەزموون و کادرێك لەئەندامێکی سەرکردایەتی ، کێشەکە لەوەدایە کە لەنێوان پێشمەرگەیەك و پێشمەرگەیەك و لەنێوان کادرێك و کادرێك و سەرکردەیەك و سەرکردەیەکدا جیاوازیی بکرێت و کرابێت .

نازەنین خان .. زۆر قسەی گلەیی ئامێزی لەو بارانەوە بۆ کردم . لەقسەکاندا هەستمکرد ، تەواو بێزارە لەوەی کەوەکو پێویست کارێکی ئەوتۆ بۆ مامۆستا عەزیز نەکراوە ، بۆیە من بەڵێنم پێدا کەچاوپێکەوتنێکی (سەرۆکی حکومەتی) بۆ رێکبخەم و دەست بەنووسینەوەی ژیاننامەی شەهید بکەم .. بەرنامەکەم واداڕشت ، لەرێگای نووسینی نامەوە بۆ هەموو

ئەو هاوڕێیانەی کەلەگەڵ شەهیددا ژیاون ، بەمەبەستی ئەوەی هەریەکەیان چ بیرەوەرییەکیان لەگەڵیدابووە ، بۆمی بنووسنەوە بانگەوازێکم لەم ڕۆژنامانەدا بلاوکردەوە :-

١- ژمارە (١٦١)ی (٢٠٠٢/٩/١٢)ی ڕۆژنامەی ڕۆژنامەی سلێمانی

٢- ژمارە (٧٩)ی (٢٠٠٢/٩/١٦)ی ڕۆژنامەی هاولاتی

٣- ژمارە (٢٨٦٨)ی (٢٠٠٢/٩/٢٢)ی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ

٤- ژمارە (٢٦)ی (٢٠٠٢/٩/١٦)ی ڕۆژنامەی هەواڵ

نامەکانیشم بەیارمەتی چەند هاوڕێیەکمان گەیاندە زۆربەی هاوڕێکانی .. لەئەنجامی ناردنی نامە و بانگەوازەکەدا ، چەند کەسێك وەلامیان دامەوە ، زۆربەشیان نامەکەیان پشتگوێ خست و بەتەنها دێرێ وەلامیان نەدامەوە ، بەداخەوە دەڵێم .. ئەوانەی نامەم بۆ ناردن ، دوای نامەکان چەند جار بەتەلەفۆن و لەیەکتربینیندا ، پێم وتوونەتەوە کە وەلامی نامەکەم بدەنەوە ، بەلام هیچ کەڵکێکی نەبوو ، بەهەرحاڵ ، دوای ساڵێك چاوەڕوانی هاوڕێیانی عەزیز ، بەنووسینی ئەم بەڕێزانەی کەلەم کتێبەدا دەیخوێنیتەوە کتێبی (مامۆستا عەزیز ژیانێکی پاك و شەهیدی دەستێکی ناپاك) گەلاڵەبوو ، دڵنیام ئەم کتێبە کورتەیەکی زۆر کورتە ، لەسەر شەهید مامۆستا عەزیز ، ئومێد دەکەم دوای خوێندنەوەی ئەم کتێبە لەلایەن هاوڕێکانییەوە ، ببێتە هاندەرێکیان ، بیرەوەرییەکانیان لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا ، بنووسنەوەو بۆمی بنێرن ، بۆئەوەی لەبەرگێکی تردا کۆیبکەمەوەو چاپی بکەم .. حەزدەکەم بزانرێت نزیکەی (١٠٠) نامەم بۆ ئەو کەسانە ناردووە کەزانیومە هاوڕێی مامۆستا عەزیز بوون .. ئەوە دەبینین لەو سەد کەسە تەنها ئەم

کەسـانە دەبیـنین وەڵامیـان داوەتـەوە ، لـەم کتێبـەدا بیرەوەرییـەکانیان نووسراوە ..

لەم پێشەکییەدا بەپەسەندم زانی لەخوێندنەوەی هەر بابەتێك لەم کتێبەدا نووسـراوە ، ئامـاژە بـۆ هەنـدێ بۆچـوونی نووسـەرەکانیان بکـەم، لـەبارەی شەهیدەوە .

## کولێژێریکی نووسینەکان

* کـاك (عومـەر فـەتاح) لەنووسـینەکەیدا دەڵێـت : (عـەزیز یـەکێکبوو لـەو هاورێیانـەی بـڕوای بەدرێـژەدانی خـەباتی چـەکداریبوو ، بۆیـە لـەکاتی هەرەسـی شۆڕشـدا داوای لـەهاورێیانی کۆمەڵـە کـرد کـەخۆڕاگرین و لەشاخەکان بمێننەوە و هێزی چەکدار و مەفرەزەی گەڕۆك دروستبکەن و دەسـتەی چـەکداری زۆر لەکوردسـتاندا پێکبهێـنن . دژی هـەرەس و خۆبەدەسـتەوەدان رابووەسـتن ، هـەر بـەو بڕوایـەوە لەکۆبوونـەوەی کێلـوی پێنجوینی کۆمەڵەدا بەشداریکرد).

* کاك (مولازم عومەر) دەڵێ (بەشانازییەوە دەڵێم سەروەریی بوونم بەکۆمەڵە بەپلەی یەکەم دەگێڕمەوە بۆ شەهید عەزیز و شەهید جەمالە رەش) داننان بەم سەروەرییەدا ، تەنها لەتێکۆشەرێکی وەکو کاك مولازم عومەر چاوەڕوان دەکرێت .. زۆر تێکۆشەر هەیە ، لەرێگای تێکۆشەرێکەوە رێبازی خـەباتی شۆڕشـگێڕیی دۆزیوەتـەوەو لەئەنجامـدا بۆتـە تێکۆشـەرو بـەرپرس و پلەوپایەی لەشۆڕشدا وەرگرتووە ، بەڵام واراشکاوانە و راستگۆیانە ناڵێت سەروەریی بوونم بەکۆمەڵە دەگێڕمەوە بۆ ئەو شەهیدانە .

بەرەنگاری ، کەچووم ئاگادلری شەهید عەزیزم کرد بۆ ئەو مەسەلەیە ، خێرا (١٧٠) دیناری دایە دەستم ، وتی ئەوە پارەی مەسروفاتی ژنهێنانەکەمە خۆشم و پارەکەش دەبەخشمە کۆمەڵە..)

* (مام رۆستەم) لەژیانێکی کەمی خەباتیدا کەلەگەڵ شەهیددا ژیاوە خەباتی بەرجەستەدەکات : (هەرچەندە تەمەنی هەموو بۆ خەبات و تێکۆشان تەرخانکردبوو ، لەپێناوی گەلەکەیدا ، تەمەنی پێشمەرگایەتی لەشۆڕشی نوێدا زۆر کورتبوو ، هەروەها لەتەمەنێکی کورتدا ژیانی بەکوردو کوردستان بەخشی ، بەراستی بەجوانەمەرگی خەباتی نەتەوەیی دەژمێردرێت ..)

* کاك (عومەر غەریب) وەکو هاوڕێیەکی رۆژانی خەباتی دەڵێت : (کوڕە کوردێکی زۆر دڵسۆز بوو ، حەزی لەقسەی خۆش و نوکتەبوو ، هەموو کات دەم بەپێکەنین بوو، هەرگیز بەڕوو گرژی نەماندەبینی ..)

* مامۆستا (ئەحمەد ساڵح) لەنووسینەکەیدا وا باسی شەهید دەکات (دوور بوو لەخۆهەڵکێشان و خۆبەزلزانین و نازکردن و منەتکردن بەسەر هاوڕێکانیدا ، تەنها دەستکەوتی بریتیبوو لەو شادی و خۆشییەی لەکاتی بۆنەو یادەکاندا بەدڵ و دەروون و سەرو سیمایەوە دیاربوو ..)

* لەنووسینەکەی کاك (عومەر فەتاح)دا کەبەناونیشانی (بەڵگەنامەکان باشتر راستییەکان دەسەلمێنن) لەبەڵگەنامەی سێیەمی بەڵگەنامەکاندا .. لە خاڵی (٤)دا پێشنیاز دەکرێت کەهیچ جۆرە لێبوردنێك عەزیز نەگرێتەوە ، ئەمە ئەوە زۆر باش دەسەلمێنێت کە دوژمنە سەرسەختەکەی کورد رژێمی بەعس و دیکتاتۆریەتی سەدام چەند سڵیان لەو جوامێرە کردۆتەوە، چەندێ لێترساون و چەند بەکەسێکی بەتواناو ئازاو بێباکیان زانیوە لەبەرامبەری

سیاسەتەکانی رژێمەکەیاندا ، بۆیە بەبێ شەرمانە و زۆر بەڕاشکاوانە داوا دەکەن ئەگەر لێبوردنیشیان دەرکرد ، ئەو جەربەزەیە بەر لێبوردنەکە نەکەوێت ، چونکە لەگەڵ بەربوو ، دەچێتەوە بۆناو ریزەکانی پێشمەرگە .

* کاک (حەمە چاوشین) لەسەردانێکدا بۆ بەندیخانەی موسڵ ، وا باسی سەردانەکە دەگێڕێتەوە : (عەزیز وتی کەرۆشتنە دەرەوە بەدیقەت سەیری لای دەستە چەپ بکەن ، چەند ژوورێکی تێدایە ، براتان لەوێ هەڵدەواسرێت ، کەچووینە درەوە چوار ژوورمان بینی ، بەکەتیبەی ئەستوور دەرگاکانی دروسکرابوون بەقفڵی گەورە داخرابوون ، چاومان بەقەنارەکان کەوت کە هەرقەنارەیەك (٧) قولاپ و (٧) پەت و (٧) کورسی لەلاوەبوو ، جۆگایەکی ئاویش لەژێریاندا ئەڕۆی ، دەورووبەری زەوییەکە هەمووی دیاربوو ، پاشماوەی لەسێدارەدانی پێوەبوو) .

* کاک (سەلاح باین) وەکو هاوڕێیەکی منداڵیی و خۆشەویستی یەکتری لەسەردانیدا بۆ زیندانەکەی موسڵ ، شەهید عەزیز وا باسی دادگای رژێمی بۆ کردووە : (پێیان گوتم : حوکمەکەی تۆ خنکاندنە تامردن ، بەدوای خنکانیشدا لاشەکەت لەشوێنێکی نادیاردا بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ دەسبەسەر دەبێت ، منیش بەگاڵتەپێکردنەوە گوتم : ئەی نابێ (٢٠) ساڵ بەندبم و لەدوای (٢٠) ساڵەکە ئیعدامم بکەن ؟ من ئەمەیان بەباش دەزانم ، کاربەدەستانی دادگا نارەواکە بەجارێ رەنگیان تێکچوو ، پلارەکەی من زۆر تورەی کردن ، بەخێرایی راپێچی دەرەوەی هۆڵەکەیان کردم و پێیان گوتم تۆ چۆن غیرەت دەکەی لەهۆڵی دادگادا وابڵێی !؟ منیش گوتم : ئەوەی ویستم کردم و گوتم ئێوەش ئەی نامرۆڤینە چ نامەردییەکتان لەدەست دێ درێغی مەکەن) .

* کاك (ئازاد جەلال) لەیەکەم سەردانیاندا بۆ قەسابخانەکەی موسڵ ، شەهید عەزیز پێیوتبوو (ئەو رۆژەی رێگای کوردایەتیو ئەم رێبازەم هەڵبژارد ، سوور دەمزانی ئەم رێگایەشم دێتەرێ و دەمزانی کەرێگای خەبات و تێکۆشان بەگوڵ نەچێنراوە ، دوژمنانمان نازانن هێندەی شاخەکانمان سەرسەختین ، دەیان بەڵکو سەدانی وەکو من سێدارەکانیان شەرمەزار دەکەن ، ئێمە وادەڕۆین ، داوام لەئێوە ئەوەیە ، رێگاکەم بەرنەدەن و درێژە بەخەباتتان بدەن بۆ تەواوکردنی رێبازەکەمان ..)

* (سەبریە خان)ی خێزانی لەکۆتایی نووسینەکەیدا سەبارەت بەعەزیز دەڵێت : (خۆزگە ساڵانە یادی عەزیز دەکرایەوە ، رێز لەکەسوکاری دەگیرا ، وەکو ئەندامێکی سەرکردایەتی حسابی بۆ دەکرا ، خۆزگە شوێنێك لەشوێنە گشتییەکان لەشاری سلێمانی بەناوی شەهید عەزیزەوە ناودەنرا ، خۆزگە من منداڵێکم لەعەزیز دەبوو ، ناوی هەرچی بوایە هەر ناوم دەنایەوە ﴿عەزیز﴾ ..)

* کاك (جەمال شێخ نوری) لەنووسینەکەیدا دەڵێت : (شەهید عەزیز هەمیشە ئامۆژگاریی دەکردین ، پێی لەسەر ئەوە دائەگرت زیاد لەپێویست بایەخ بدەین بەناستی هۆشیاریمان ، لەهەمانکاتدا لەناو خەڵکدا هێمن و لەسەرخۆبین و توندرەو نەبین ..)

* مامۆستا (ئەنوەر مەحمود) سەبارەت بەچۆنێتی یەکترناسینیان بەم شێوەیە باسی دەکات : (سەرەتای ئاشنابوونم لەگەڵ ئەو زاتەدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (١٩٦٤) کە هەردووکمان قوتابیی بووین لەدواناوەندیی وەتەنی کوران ، لەڕیزەکانی یەکێتی قوتابییانی کوردستاندا کارماندەکرد .. لەشانەکاندا هاوڕێیەکی زۆر نزیك و دڵسۆزی یەکتر بووین ..)

* کاک (باپیر محەمەد عەباس) وەکو هاوڕێیەکی زیندانی کەسەرنەمانێك لەزیندانی هەیئەی خاصەی کەرکوك بەیەکەوە بوون .. باسی ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی مامۆستا عەزیز وا دەکات (کاتێ پرسیاری لێدەکات و دەیەوێت بزانێت مامۆستا کێیە ، لەوەڵامدا دەڵێت : (مِن مامۆستا عەزیزم ئەم برادەرەی تەنیشتم کاك عەبدولرەزاقە .. ئینجا کەوتە ڕێنماییکردنم ، پێی وتم کە پێویستە لەوێ چۆن هەڵسوکەوت بکەم ، پێی وتم نابێ ئیعتیراف بکەم ، نابێ نهێنی شوێن و جێگای پێشمەرگە بدرکێنم ، تێیگەیاندم کە ئەگەر نهێنییەکان بدرکێنم ، ئەوا ئیعدام دەکرێم .. تێیگەیاندم درکاندنی نهێنییەکانی شۆڕش کەڵکی نییە و کارێکی خراپە ، خۆڕاگریی کارێکی مەردانەیە ..)

* مامۆستا (عەبدولقادر حەمە ئەمین) لەنووسینە کورتەکەیدا دەڵێت : (کوڕێکی دڵسۆز و دەسپاك و چالاکبوو ، هەمیشە خۆی بەخوێندکارێکی پێشەنگ دەزانی ، هەرلەسەرەتای ساڵی یەکەمی خوێندنەوە زوربەی خوێندکارانی ڕێکخست ..)

* کاك (فایەق شێخ عومەر) لەهەڵوێستی مرۆڤانەی شەهید عەزیزدا ، کە چۆن بەهانایەوە چووە باس دەکات و دەڵێت ( ١٩٧٠/١/١ بوو ، خێزانەکەم تووشی شەلەل نصفی بووبوو ، بردمان بۆ بەغدا بۆلای دوکتۆر ، لەگەڵ خورشیدەخانی دایکی شەهید عەزیزدا ، کەزانیبووی لەبەغداین ، بەپەلە هات بۆلامان و کەخێزانەکەم دەبرد بۆلای دکتۆر ، عەزیز بەکۆڵی خۆی سەرینەخست بۆلای دکتۆرەکان ..)

* مامۆستا (گێلاس عەلی) دەڵێت : (ترسی لەکەس نەبوو ، ترسی بەعس و دام و دەزگاکانی نەبوو ، چاونەترسێکی بێوێنە و برایەکی دڵسۆزی هەموو

کەسێکی دڵسۆز بوو .. کەم ژیا و کەڵ ژیا ، شەهید عەزیز بەراستی هاوڕێ بوو هاوڕێ ..)

* کاك (یونس غەفور) وەکو خزمێکی نزیکی شەهید و هاوڕێیەکی ڕۆژانەی وا باسی عەزیز دەکات : (وەکو هاوڕێ وەکو خزم لەمنداڵییەوە نزیکی یەکبووین ، یەکترمان خۆش دەویست و گوێمان لەبیروڕای یەکتری دەگرت ، زۆر ئامۆژگاری و ڕێنمایی دەکردم و زۆر مەسەلەی سیاسی بۆ شیدەکردمەوە ، متمانەی زۆری پێمبوو ، هیچی لێنەدەشاردمەوە ..)

* (نازەنین خان)ی خوشکی وەکو خوشکێکی لەهەڵوێستێکی ڕۆژانەی خەباتی عەزیزدا ، کەمنداڵبووە وا دەگێڕێتەوە : (ڕۆژێك بەپەلە هاتەوەو خۆیکرد بەژوورا ، نارەق لەگیانی دەتکا ، بەدایکمی وت من لەگەڕەکی دەرگەزێن دەبم ، ئەگەر درەنگ هاتمەوە ، بەدواما مەگەڕێن و هەرکاتێ خۆم هاتمەوە دێمەوە .. ئێمەو دایکم لێمانپرسی ئەوە چییە بۆ شپرزەی ؟ وتی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد رایکردووە ، لەشوێنێکە ئێمەیان داناوە کەئاگامان لێی بێت تا دەرئەچێت . دایکم و ئێمە لەخەمی عەزیزو مامۆستا ئیبراهیمدابووین ، شەو درەنگانێك بەپێکەنین و دڵخۆشییەوە خۆی بەژووراکرد وتی تەواو دەرچوو نەخشەکەمان سەریگرت ..)

* (نەسرین خان)ی خوشکی لەو چاوپێکەوتنەی کەلەگەڵیدا ئەنجامدراوە ، لەهاتنەوەی جارێك لەجارەکانی عەزیزدا وای بۆ باسکردم و وتی : (ئێستاش لەیادمە و هەر لەپێش چاومە ، خۆزگە ئەوکاتە چاوەکانم کوێر ئەبوون ، جارێکیان هاتەوە ، لەپڕ خۆی بەماڵدالکرد ، جامانەیەکی بەسەرەوە بوو ، ڕەش داگیرسابوو ، تەواو لاواز بوو بوو ، باوەشم پیاکرد ، ئەوەندەم ماچکرد تاتاسەم شکا ، وتی (باجە خان) ئەوە بۆ وادەکەیت ..؟ وتم

بــەقوربانت بم ، بــۆ وارەش داگیرســاوی و لاواز بوویــت ؟ وتــی لەگــەڵ تراکتۆرێکدا سواربووم .. سایەقی تراکتۆرەکەش پێیوتم تۆ چیت؟ ئەڵێی خەڵوزفرۆشی ، نانێکی خوارد و چوو نووست ..)

* کـاك (حـاجی مـەمۆ) لەنووسـینەکەیدا وادەنووسـێت (مامۆسـتا عـەزیز و یاسین دوو هاوڕێی جوامێری چالاکی ڕێبازی کوردایەتی بوون ، دوو هاوڕێی خـاکیی و دڵسـۆزی هەڵکـەوتووی خـەباتی ڕۆژانـی سـەرەتای دامەزرانـدنی کۆمەڵەبوون ئەو دوو مرۆڤە لەناو قوتابییـانی کورد لـەزانکۆی بەغدا تابڵێی خۆشەویست و بەرچاو بوون) .

نووسینی هەریەك لەم هاوڕێیانەی شـەهید ، هەرهـەمووی گـەواهی ئـەوەن ، کەعــەزیز چــەند پیــاوێکی کــورد پــەروەری پێشــکەوتووخواز بــووە .. بەڵگەنامـەکان باشتر دەیسـەلمێنن کـەڕژێم چـەند لەچەلەنگی ئـەم قارەمانـە ترسـاوەو سـڵیکردۆتەوە ، ئەگـەر سـەرنجی ژیـانی بـدرێت ، لـەو ڕۆژەوەی چاوی کردۆتـەوە تا دواڕۆژی ژیانی ، بەبەردەوامی لەخەبات و تێکۆشـاندا بووە ، بۆ مەسەلەی ڕەوای گەلەکەی ، هـەموو تەمـەنی خـۆی تـەرخانکردبوو بۆ بەدیهێنانی ئاواتەکانی .

چــۆن لەپێشــەوە وتم .. ئەگــەر هاوڕێکــانی عــەزیز لەگــەڵ بیســتنی بانگەوازەکـەو گەیشـتنی نامەکـە بەنووسـینەوەی بیرەوەرییـەکانیان لەگـەڵ شەهیددا وەڵامیان بدامایەتەوە ، دڵنیام کە کتێبەکە بەقەبارەیەکی گـەورەترو و چڕتر دەوڵەمەندتر دەردەچوو . بەداخـەوە زۆربـەی ئـەو هاوڕێیانـە چۆن لەشـەهیدبوونی عـەزیزەوە ، لەخــەمی عـەزیزدا نـەماون . هـەرواش لـەم پرۆژەیەدا بێخەمانە پاڵیان لێدایەوەو قەڵەمێکیان نەخستەسەر کاغەزێك ... من نامـەکان و بانگەوازەکـە لـەکۆتایی کتێبەکـەدا بڵاودەکەمـەوە . دەمویست

ناوی هەریەك لەوبەڕێزانەش بڵاوبکەمەوە کەنامەم بۆ ناردوون ، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك بەپەسەندم نەزانی ئەو کارە بکەم . بێگومان کاتێ کتێبەکە چاپ دەکرێت و هەریەك لەوبرادەرانە دەیبینن لای خۆیانەوە هەست بەکەمتەرخەمیی و بێوەفاییەك دەکەن بەرامبەر بەهاوڕێکەیان .

من هەرگیز ئەو رۆژانەم لەبیرناچێتەوە کەلەگەڵ عەزیزدا بەسەرمبردوون ، ئەو بانگەی دەیکردم (شێخە دین دە...) هەر لەگوێمدا دەزرنگێتەوە نازانم زۆر جار دەمەوێ لەبۆنەیەکدا عەزیز نەهێنمەوە بیری خۆم ، بەڵام کەگوێم لەقاقایەکی پێکەنین ، لەبانگکردنێ بەدەنگی گەورە دەبێت ، کەبۆنەی یادی جەژنی نەورۆز دێتەوە ، کەباسی سەیران دەکرێت ، کەوێنەگرێك دێت و دەیەوێت وێنە بگرێت ، کەڕانك و چۆغە لەبەردەکەم ، کەپیاوێکی سمێڵ رەشی ئەسمەری چاو و برۆ رەش دەبینم .. کەدەچمە سەر کورسی و مێزی دانیشتن و گوێم لەنوکتەو قسەی خۆش و پێکەنین دەبێت .. کەباسی (قوبڵی) دەکرێت ، یان باسی سەرفرازی و سەربەخۆیی کوردستان دەکرێت یەکسەر عەزیز ... عەزیز .. دێتەوە یادم .. دەبێتە میوانم ، هەموو هەڵس و کەوت و قسەکانیم بیردەکەونەوە .

خوێنەری خۆشەویست .. رەنگە لەم باسکردنەی عەزیز تۆزێ وەرس ببیت .. بەڵام باوەڕ بکە .. ئەوەی من نووسیومەو ئەوەی ئەو هاوڕێیانەی نوسییانە .. هەرهەموو راستی ژیان و هەڵوێستی ئەو پیاوە بوون .. لاتان سەیر نەبێت کەدەڵێم بزووتنەوەی کورد کەتووشی شکست و ئاڵۆزییەك دەبوو زوربەی سەرکردەو بەرپرسەکانی ، سەری دنیایان لێدەهاتەوە یەك و پزەی ئەژنۆیان دەشکاو ورەیان بەردەدا ... بەڵام عەزیز لەهەموو رۆژگارە سەخت و پرکارەسات و نووشستەکاندا ، گەشبینانە ، نەفەس درێژانە

بەورەی بەرزەوە قسەی دەکرد و بەرنامەی هەڵسانەوەی شۆڕشگێرانەی دادەنایەوە .. گاڵتەی بەوانە دەکرد کە زوو دەرووخێن و لەبەردەمی رووداوەکاندا خۆیان ناگرن .

مامۆستا عەزیز .. سەرباری هەموو هەڵوێستە شۆڕشگێرانەکانی ، پیاوێکی بەوەفا بوو بۆ هاوڕێکانی ، گوێی بۆ هەموو کەس دەگرت و وەڵامی گونجاویشی لەسەر مەسەلەکان دەدایەوە .. زۆری حەز بەتەبایی برادەران بوو ، ئاواتی ئەوەبوو ، کەکورد ریزی خەباتی یەکبخات و ناکۆکی لەنێواندا نەمێنێت ، زۆری رق لەوکەسانە بوو کەئاژاوەیان دەگێڕاو یان حەزیان لەئاژاوەگێڕیبوو ، ئەوەندەی من لەگەڵیدا هەڵس کەوتم کرد ... نەمدی لەخۆڕا بەسەر یەکێکدا بچێت ، بەڵام لەبەرامبەری ناهەقی و قسەی رەق و ناکۆك زۆر تووڕە دەبوو ، مەگەر شەڕیان پێبفرۆشتایە ئەگینا قەت حەزی لەشەڕ نەبوو ، من یەکجار دیم شەڕ بکات ئەویش لەگەڵ (ئەنوەر ئەزوەر) بوو، خەتاکەش هەر هی ئەنوەر بوو .

مامۆستا عەزیز کەباسی دایکی دەکرد .. ئەوەندە بەخۆشی و خۆشەویستی و گەورەیی ناوی دەهێنا .. مەگەر هەر ئەو زانیبێتی باسی دایك وابکات . پوورە خورشەش کەعەزیزی دەبینی وایدەزانی ئاسمان کونی تێبووە و عەزیزی لێبەربۆتەوە .. هەمووجار عەزیز دەیوت شێخە .. (دایکم) زۆر گەورەیە .. گەورە .. من ئەگەر دایکم نەبوایە هەرگیز نەدەبوومە ئەم کوڕە .. هەموو جار دەیوت شێخە دایکم سیاسیشە . شەوانە باسی شۆڕشەکانی کوردمان بۆ دەکات ، هانمان دەدات کە گەلەکەمان و وڵاتەکەمان خۆش بوێت .

بەڕێزان .. دەبێت ئەم ڕۆژەی ئێستا وا بۆگەلەکەمان ڕەخساوە . ئەم ئازادییەی لەکوردستاندا هەیە ئەم پەرلەمان و حکومەتی هەرێمی کوردستانە . هەرهەمووی بەری ڕەنجی هەزاران هەزاری ڕۆڵە جەربەزەکانی گەلەکەمانە . کەلەسالانی ڕۆژانەی خەباتی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازیدا خەباتیان کردووە ، گیانبازییان کردووە . بەگژ دوژمناندا چوونەتەوە ، گیانی خۆیان بەختکردووە و سڵیان لەگوللەو سێدارە نەکردۆتەوە .

ئەو شۆڕشەی کەلەدوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول ، هەرەسی بەنسکۆداو دێومەزمەی داگیرکردن و قەلاچۆکردنی کوردستانی سڕییەوە ، شۆڕشی نوێخوازی گەلەکەمان بوو .. کەدایینەمۆی هەڵگیرسانەوەی سەدانی وەکو شەهید عەزیز و بەسەرپەرشتی هەڤاڵی بەڕێز (مام جەلال) و دامەزراندنی (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) بوو .

دڵنیام ئەگەر (یەکێتی نیشتمانی کوردستان) و گیانبازیی یەکەیەکەی سەرکردەکانی نەبوایەو خوێنی گەشی خاڵە شیهاب و ئەنوەر و جەعفەر و ئارام و عەلی عەسکەری و ئیبراهیم عەزۆ و دکتۆر خالید و عەزیز نەبوایە .. ئەم ڕۆژە وابەئاسانی نەدەهاتەدی و ئەو سیاسەتەی ڕژێمی بەعس گرتبوویەبەر بۆ قەلاچۆکردنی کورد و خاپوورکردنی کوردستان .. سەری بگرتایە .. کورد چۆن لەرۆژگارەکانی ئەنفال و کیمیاباراندا ، گەورەترین شکست و ماڵوێرانی توشبوو ، هەر ئاوهاش کورد دووچاری ڕۆژگاری خراپترو ناهەموارتر دەبوو . ئێستاش نابێت هەر بڵێین ئازادین وبەعس نەماوەو عێراق بەسەریەکدا رووخاوە ، ئیتر تەواو ، بەڵکو ئێستا لەهەموو ڕۆژگارەکانی پێشووتر زیاتر کورد و ڕۆڵەکانی گەلەکەمان و حیزب و لایەنە سیاسییەکان پێویستیان بەخەباتی دیبلۆماسی و سیاسی و جەماوەری

هەیە .. بۆ ئەوەی مافی رەوای گەلەکەمان لەم گۆڕانکارییانەی ئێستای عیراقدا ، مسۆگەر بکەین و ئەو پەرلەمان و حکومەتەی هەیە بکرێتە حکومەتێکی سەربەخۆی کوردی واز لەوابەستەیی حکومەتی مەرکەزیی عیراق بهێنرێت ، کوردو هەموو لایەنە سیاسییەکانی کوردستان دەبێت بەشێوەیەك ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانیی جێبەجێبکەن ، کەگیانی شەهیدان ئاسوودە بکەن و رۆڵەو نەوەکانیان بەختەوەر بکەن . ئەو ئاوات و ئامانجەی ئەو جەربەزەو تێکۆشەرانە لەپێناویدا شەهید بوون ، لە باروبۆخی ئێستای کوردستاندا مسۆگەری بکەین .. چیتر لەهەرەشەو گورەشەی نەورووبەر و گروپە شۆڤێنی و تیرۆریستە مێشك پووچەکان سڵنەکرێتەوە .. مامۆستا عەزیز کەیەکێکبوو لەو هەزاران هەزار شەهیدەی لەپێناوی ئامانجەکانی گەلەکەیاندا گیانیان بەخشی . دەبا گیانی مامۆستا عەزیز و هەموو عەزیزەکانی گەلەکەمان ئاسوودە بکەین .

لەکۆتاییدا داوای لێبووردن لەو بەڕێزانە دەکەم کەلەبڵاوکردنەوەی نووسینەکانیاندا لەبەر هۆی زمانەوانی و رێنووسی و داڕشتنەوە ناچار بووین کەدەستکارییان بکەین ، هەروەها داوای لێبووردن لەکەم و کورتییەکان دەکەم . هەروەها زۆر سوپاسی ئەو بەڕێزانە دەکەم کەهاوکارییان کردم بەتایبەتی سوپاسی کەژاڵ ئەحمەدی شاعیرو رۆژنامەنووس و کاك ئاراسی تایپیست دەکەم کەیارمەتییاندام لەپوختەکردنی کتێبەکەدا .

محەمەد شێخ عەبدولکەریم سۆڵەیی

٢٠٠٤/٢/٢٧

دوکان / سلێمانی

## نامەی هەڤاڵ (مام جەلال)

## بۆشەهیدی سەرکردە (مامۆستا عەزیز)

یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان ١٩٧٩/٣/١٨

برای خۆشەویستمان کاك عەزیز مەحمودی بەڕێز

سلاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

شادی و خۆشیتانم داوایە، ئێمەش هەموومان باشین . هەرچەندە هەمیشە دڵمان لاتانە ، بەڵام ئێمە دڵنیاین کەڕۆڵە دڵسۆزەکانی یەکێتی و گەلەکەمان هەردەم دلێرانە و جوامێرانە بەپیر مەرگەوە دەچن ، چونکە لەم راستییە گەیشتوون کەمردن لەپێناوی گەل و نیشتمان و بیروباوەڕی شۆڕشگێڕانەدا ژیانی هەتاهەتاییە لەناودڵی گەورەی گەلدا ، کەخوێنی گەشی شەهیدان ناوی نەمریان بەسەربەرزی و سەروەرییەوە لەمێژوودا تۆمار ئەکات .

خوشکە سەبریە هات و نامەکەتی هێنابوو پاش باسکردنی مەسەلەکە لەگەڵ هەڤالانی م.س و برایانی تر بڕیاردرا کە :

- موافەقەت بکرێت لەسەر بەردانی مولازم جاسم محەمەد مەحمود گەر ئەوان تۆ بەرەڵلابکەن .

- شێوەی بەرەڵلاکردنتان باشتر ئەوەیە کە بەدەستی یەکێکی وەك هەمزاغادا بتان نێرنەوە لامان ئێمەش ئەفسەرەکەی ئەدەینەوە دەست یان بتنێرن بۆ لوبنان یان شام و تەسلیمی (منظمة تحرير فلسطين) تان بکەن و ئێمەش بەتەلەفۆن ئاگاداربکەن تا ئەفسەرەکە بەربدەین .

ئیتر کاکە نەوە ، کاکە عومەر ، مەلا بەختیار ، سەید کەریم ، برایم جەلال و برایانی تر کەلێرە دانیشتوون سڵاویان هەیە بۆتان .

بۆ پێشەوە رەوەو مردن یان سەرکەوتن

برای دڵسۆزتان

مام جەلال

# نامەکەی هەڤاڵ (مام جەلال) بۆ مامۆستا عەزیز

کاتێ مامۆستا عەزیز لەلایەن بەناو دادگای رژێمەوە بڕیاری لەسێدارەدانی دراو ناردیانە بەندیخانەی موسڵ .. ماوەیەك لەو بەندیخانەیە مایەوە ئەو کاتــە هێــزی پێشــمەرگەی کوردســتان ، لەچــالاکییەکی پێشــمەرگانەدا ئەفســەرێکیان بــەناوی (جاســم محەمــەد مــەحمود) بــەدیلگرتبوو ، نــاوبراو خزمی نزیکی دیکتـاتۆر سـەدام حسێن بوو.. مەترسـی ئـەوەیان کردبـوو کە ئەو ئەفسەرە لەلایەن شۆڕشەوە لەناودەبرێت .. ئەوەیان رەچاو نەکردبوو کە شۆڕشـی کـورد دیـل ناکوژێت و لـەناوی نابـات ، لەبـەر ئـەوە سـەرانی رژێـم کەوتبوونـە هەڵپـەکردن بـۆ ئەوەی بەهـەر نرخێك بێت ئـەو ئەفسـەرە لـەلای شـۆڕش قوتـار بکـەن . بـۆ ئەمـەش رێگـای گۆڕینـەوەیان بەمامۆستا عـەزیز هەڵبــژاردبوو . ناردبوویانــە لای عــەزیز و مەســەلەکەیان پێراگەیانــدبوو ، کەئەگـەر ئـەو بـەڕێگای خـۆی بتوانێـت ئـەو ئەفسـەرە لای پێشـمەرگە قوتـار بکات ئەوانیش ئەو ئازاد دەکەن و ئیعدامی ناکەن .

لـەکاتی مواجەهــەدا عــەزیز ئـەم مەســەلەیە بەســەبریە خــانی خێزانــی و خزمەکانی رادەگەیەنێت و ئەوانیش هەر لـەوێ بڕیـار دەدەن کە سـەبریەخان و ئازاد جـەلالی پورزای عـەزیز بنێـرن بەلای ئەو کارەوە عـەزیز نامەیـەك بۆ هەڤاڵ (مام جەلال) و هەڤالانی سـەرکردایەتی دەنووسێت و دەیداتـە دەسـت سـەبریەخان ، بەگەڕانـەوەیان یەکسـەر (سـەبریە و ئـازاد) بـەرەو قـەلادزێ و

ناوزەنگ دەکەونەڕێ .. کەدەگەنە سەرکردایەتی و نامەکە دەدەنە هەڤاڵ مام جەلال و برادەرانی سەرکردایەتی . (مام جەلال) یەکسەر دەڵێ ئێمە رازین و ئامادەین کەئەو ئەفسەرە بەربدەین بەمەرجێ ئەوانیش عەزیز بەربدەن .. بەلام پێی وتبوون من ئەو رژێمە بناسم ئەوەیان لەدەست نایەت مامۆستا عەزیز بەربدەن .. یەکسەر نامەیەك بۆ عەزیز دەنووسێ و بەسەبریەخان دەڵێت بۆ دڵنیایی ئەوان و نیازپاکی ئێمە لەم کارەدا ، ئەو ئەفسەرە مورافیقێکی لەگەڵدایە ئەندازیارە ئێمە هەر ئێستا ئەو دەدەینە ئێوەو ئێوە لەگەڵ خۆتان بیبەن و تەسلیمیان بکەنەوە .. لەونامەیەدا هەڤاڵ (مام جەلال) دوای سلاوناردن بۆی .. بۆی دەنووسێت (خوشکە سەبریە هات و نامەکەتی هێنابوو پاش باسکردنی مەلەسەکە لەگەڵ هەڤالانی (م.س) برایانی تر بڕیاردرا کە موافەقەت بکرێت لەسەر بەردانی ملازم جاسم محەمەد مەحمود گەر ئەوان تۆ بەرەڵلا بکەن) .

لەنامەکەدا بەڕێزی بۆی دەنووسێت (شێوەی بەرەڵلاکردنتان باشتر ئەوەیە کە بەدەستی یەکێکی وەك هەمزاغادا بتان نێرنەوەلامان ئێمەش ئەفسەرەکە ئەدەینەوە دەستیان بتنێرن بۆ لوبنان یان شام و تەسلیمی (منظمة تحرير فلسطين) تان بکەن و ئێمەش بەتەلەفۆن ئاگادار بکەن تا ئەفسەرەکە بەربدەین).

سەبریەخان و ئازاد بەنامەکەو لەگەڵ ئەو مورافیقەی ئەفسەرەکەدا بەرەو قەلادزێ و سلێمانی و بەغدا دەگەڕێنەوە .

بەپێی ئەو گێڕانەوەیەی سەبریەخان ، کەچوونەتە لای سەرانی رژێم بەڵێنیانداوە کە مەسەلەکە جێبەجێبکەن و عەزیز بەو ئەفسەرە بگۆڕنەوە .

بەلآم بەداخەوە لەم کەین و بەینەدا ئەو ئەفسەرە لەدەست پێشمەرگە دەرباز دەبێت و مەسەلەی بەردانی عەزیز تێکدەچێت .

خوێنەری هێژا .. سەرنجی نامەکەی بەڕێز (مام جەلال) بدەو بزانە چۆن باسی عەزیز و رۆڵەدلێرەکانی یەکێتی و گەلەکەمان دەکات .

لەبەرگرنگی نامەکە بەپەسەندمانزانی کە نامەکە لەم کتێبەدا بلآو بکەینەوە.

# کورتەیەك لەژیان و ساڵانی خەباتی شەهید عەزیز

## یەکەم / کورتەی ژیانی

* ساڵی (١٩٤٣) لەگەڕەکی (سەرگۆڵ)ی شاری سلێمانی لەبنەماڵەیەکی هەژار لەدایکبووە .
* قۆناغەکانی خوێندنی (سەرەتایی ، ناوەندیی ، دواناوەندیی) لەسلێمانی تەواو کردووە .
* ساڵی (١٩٦٨) لەکۆلێژی زمان بەشی کوردیی زانکۆی بەغدا وەرگیراوە .
* ساڵی (١٩٧٢) خوێندنی زانکۆیی تەواوکردووە .
* لەمانگی (١٩٧٢/١٠) چۆتە خزمەتی سەربازی لەکەرکوك و بەغدا .
* ساڵی (١٩٧٣) خزمەتی سەربازی لەبەغداد تەواوکردووە .
* ساڵی (١٩٧٣) بەمامۆستای زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پارێزگای کوت دامەزراوە . نێردراوەتە دواناوەندی عەزیزیە لەقەزای عەزیزییە .
* ساڵی (١٩٧٤) لەعەزیزییەوە پەیوەندی بەشۆڕشی ئەیلوولەوە کردووە .
* ساڵی (١٩٧٥) دوای نسکۆ گەڕاوەتەوە بۆ شوێنەکەی خۆی لەعەزیزییە .
* ساڵی (١٩٧٥) ژنی هێناوە .
* ساڵی (١٩٧٦) دوای نسکۆ گەڕاوەتەوە بۆ پارێزگای سلێمانی و نێردراوەتەوە ناوەندیی عەربەت .
* ساڵی (١٩٧٦) سەردانی سوریای کردووە .

* ساڵی (١٩٧٧) لەسلێمانییەوە چۆتە دەرەوەو پەیوەندی بە شۆڕشی نوێوە کردووە و بۆتە پێشمەرگە .
* لە (١٩٧٨/١٠/١٧) لەناوشاری سلێمانی لەلایەن دەزگای ئەمنی رژێمەوە گیراوە .
* لە شەوی ٢٥/٢٤ /١٩٧٩/٣) لەبەندیخانەی موسڵ لەسێدارە دراوە .

## دووەم / ساڵانی خەباتی

* بەمێرد منداڵی و لەپۆلی یەکی ناوەندییەوە چۆتە ریزەکانی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) و (پارتی دیموکراتی کوردستان)ەوە .
* لەساڵانی (٦٠-٦١-٦٢-٦٣)دا جگە لەکاری رێکخستن بۆتە پێشمەرگەی ناوشار و تەتەری گەیاندنی پۆستەکانی شۆڕش بووە لەناو شارەوە بۆ دەرەوەی شار .
* کاتێ باڵی مەکتەبی سیاسی لەپارتی جیابۆوە، لەساڵی (١٩٦٤)دا عەزیز لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا بوو .
* ساڵەکانی (٦٤-٦٥-٦٦-٦٧) کادرێکی چالاکی حزبی و رێکخراوەیی بوو لەناو شاری سلێمانیدا بێ سڵەمینەوە کاریدەکرد .
* ساڵەکانی (٦٨-٦٩-٧٠-٧١-٧٢) وەکو خوێندکارێکی زانکۆ و کادرێکی پێشکەوتوو ، لەبەغداد کاری حیزبی و رێکخراوەیی بەوپەڕی پەرۆشییەوە دەکرد . چەندین ئەرکی خراوەتە ئەستۆ و خۆنەویستانە ئەنجامیداون .

* بەشــداری لەچــەندین (کــۆنفرانس و کــۆنگرەی) یــەکێتی قوتابیــان و (پــارتی)دا کــردووە،بەشــداریی چــەندین دەورەی رۆشــنبیریی و کــادیرانی کردووە .

* لەســـاڵی (۱۹۷۰)وە .. ئەنـــدامێکی چـــالاك و هەڵســـوڕاوی ریزەکـــانی رێکخستنی کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان بووە ، لەبەغداو سلێمانی و شوێنەکانی تر .

* لەناوەڕاســـتی ســـاڵی (۱۹۷٤) لەعەزیزییـــەوە ، وەکـــو مامۆســـتایەك پەیوەندیی بەشۆڕشی ئەیلوولەوە کردوە . لەناوچەی پێنجوێن بەمامۆستا لەقوتابخانەیەك دامەزراوەو پێشمەرگە ئاسا وانەی وتۆتەوە .

* ئەو ساڵە لەناوشۆڕشدا ئەرکی جۆشدانەوەی کۆمەڵەی خراوەتە ئەستۆ و زۆر بەهێمنی و چالاکانە کارەکانی جێبەجێ کردووە .

* لەســالانی ژیــانی خوێنـــدنی زانکـــۆدا ، لەبەغـــداد ، وەکـــو کـــادرێکی پێشـــکەوتوو ، بەشـــداریی قوتابیـــانی لەناوچـــەکانی پارێزگـــای کـــەرکوك و ناوچـــەی خانەقینـــدا کـــردوە ، کـــە لەســـالانی (۱۹۷۱–۱۹۷۲) بەمەبەســـتی هۆشیارکردنەوەی جوتیاران رێکخـراوە لـەو ئۆردوگایانـەدا رۆڵـی بەرچاوی لەهۆشیارکردنەوەو یارمەتی جوتیاراندا بینیوە .

* لـەکاتی نسـکۆی شۆڕشـدا سـاڵی (۱۹۷۵) کەخـەڵك سـەرقاڵی گەڕانـەوەو خۆبەدەسـتەوەدان و شـەرەخۆری بـوون ، عـەزیز .. خـەمخۆرێکی بەهەڵپـەی هەڵسـانەوەی شـۆڕش بـوو لـەڕێگای (کۆمەڵـەی مارکسـی لینینـی)یـەوە ، پەیتاپەیتا پەیوەنـدیی بەهاوڕێیان و پێشـمەرگەوە دەکرد و قسـەی لەگەڵدا دەکردن بۆ ئەوەی دژی هەرەس و خۆبەدەستەوەدان رابووەستن .

* کۆمەڵە لەو ساڵەدا ، بەمەبەستی جۆشدانەوەی کۆمەڵەو راوەستان دژی نسکۆ ، کۆبوونەوەیەکی لەگوندی (کێلوی) پێنجوین ئەنجامدا ، عەزیز وەکو کادرێکی پەرۆشی ئەو کۆمەڵەیە بەشداری ئەو کۆبوونەوەیەی کرد و دوای ئەو کۆبوونەوەیە لەسەر بریارەکانی کۆبوونەوەکە بریاری گەڕانەوەیدا بۆ سلێمانی .

* لەمانگی (٥)ی ساڵی (١٩٧٥)دا گەڕایەوە سلێمانی و لەگەڵ گەڕانەوەیدا کەوتە هەڵپەکردن بۆ پەیوەندیکردن بەهاوڕێیانییەوە بۆ جۆشدانەوەی خەبات لەریزەکانی کۆمەڵەداو دەیوت دەبێت هەرزوو شۆڕش بەرپابکەینەوە ، نەیەڵین بەعس بحەوێتەوە .

* ساڵی (١٩٧٦) بەمەبەستی هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش ، سەردانی سوریای کردووە . لەو سەردانانەیدا چاوی بە بەڕێز (مام جەلال) کەوتووە .

* ساڵی (١٩٧٥/١٩٧٦) کەلەعەزیزییەو بەغدا بووە ، بەردەوام پەیوەندیی بەکەسانی دڵسۆزەوە دەکرد بۆ رێکخستنیان لەریزەکانی کۆمەڵەدا .

* ساڵی (١٩٧٦/١٩٧٧) کەلەسلێمانی بوو ، ماڵەکەی بووبوو بەبنکەو بارەگای هاوڕێیان و زۆربەی ئەرك و کارەکانی (کۆمەڵە) و شۆڕشی نوێی تیادا ئەنجام ئەدرا و خۆشی وەکو کادرێکی پێشکەوتوو و خاوەن ئەزموون ، چالاکانە کاریدەکرد .

* ساڵی (١٩٧٧) لەلایەن دەزگاکانی رژێمەوە گوشاری خرایەسەر .. ویستی بەرێگای تورکیادا خۆی لەو گوشارە دەرباز بکات و بچێتە دەرەوە ، بەلام رێگایان پێنەدا . بۆیە ناچار بوو لە (١٩٧٧/٨/١) پەیوەندیی بەشۆڕشی نوێی گەلەکەیەوە بکات و ببێت بە پێشمەرگە .

* لەکۆبوونەوەکانی سەرکردایەتیدا دەکرێتە ئەندامی سەرکردایەتی شۆڕش و دەکرێتە لێپرسراوی لقی دووی کەرکووک و دەنێردرێتە ناوچەی قەرەداغ .

* ساڵی (١٩٧٨) بۆ ئەنجامدانی کارێکی شۆڕش دێتەوە سلێمانی ، لەلایەن کەسێکی ناپاکەوە ، دەستتیشان دەکرێت و لەلایەن دەزگای ئەمنەوە لەناو شاری سلێمانی و لەگردی عەلی ناجی دەگیرێت .

* لەگرتنەکەیدا ، بەندیخانەکانی سلێمانی و کەرکوك و بەغدای دەگێڕن و هەموو جۆرەکانی ئەشکەنجەی لەگەڵدا بەکاردەهێنن و سەرەنجام لەدادگای خاصەی رژێم حوکمی لەسێدارەدانی بەسەردا ئەدەن .

* دوای بڕیاری لەسێدارەدانی دەینێرنە بەندیخانەی موسڵ .

* چەند مانگێ لەو بەندیخانەیە ماوەتەوە تالە سەعات (١٢)ی شەوی (١٩٧٩/٣/٢٥/٢٤) لەسێدارەی دەدەن و بەیانیی زوو تەرمەکەی بەدزییەوە لەگۆڕستانی (وادی الحجر) دەکەن بەژێر خۆڵەوە .. بەحوکمی نارەوای بەعسیانەو لەدادگایەکی بەناودادگادا ، کردیانە جوانەمەرگی خەباتی نەتەوایەتی ...

## شەهید عەزیز لەشیعرێکی شەهید مەلا عەلی دا

خوێنەری هێژا .. ئەم چوارینانەی لەخوارەوە دەیخوێنینەوە ، یەکێکە لەپارچە شیعرەکانی (حسەین مەولود ئەحمەد) ناسراو بەمەلا عەلی (مەلا عەلی) پێشمەرگەو کادری (ی.ن.ك) بوو ، لەئەنجامی جێبەجێکردنی کارێکی شۆڕشگێڕانەدا لە (١٩٧٩/١/٣٠) لەگوندی کرژەی ناوچەی سورداش ، بەبریندارى کەوتەبەر شالاوی گرتن لەلایەن دەزگا سەرکوتکەر و داگیرکەرەکەی رژێمی دیکتاتۆری بەغداوە لە ١٩٧٩/٧/٢٣/٢٢ لەقەسابخانەکەی موسڵ لەسێدارەدرا ، شەهید مەلا عەلی لەرۆژانەی زیندانیدا چەندین پارچە شیعر و نامەو نووسینی نوسیووە .. ئەوانەی لەچنگی دەزگاکانی رژێم قوتاربوون ، لەدوو توێی نامیلکەیەکدا ، لەلایەن دەزگای راگەیاندنی (ی.ن.ك) لەساڵی ١٩٨١ لەشاخ چاپکراوە ، بۆ جاری دووەم هەمان کتێب لەساڵی ١٩٩٧دا لە (چاپخانەی زاموا) لەکتێبێکی (٨١) لاپەڕەییدا چاپکراوەتەوە لەژێر ناونیشانی (دیوانی شەهید مەلا عەلی) ، لەیەکێك لەشیعرەکانیدا کە (١٤) چوارینەیە و لە ١٩٧٩/٦/١٨ لەبەشی ئیدارەی زیندانی موسڵدا دایناوە ، لەدیوانەکەدا بڵاوکراوەتەوە ، لەو شیعرەدا (٥) چوارینەی پەیوەندی بە(شەهید عەزیز)ەوە هەیە .. بەپێی ناوەڕۆکی شیعرەکە دوای لەسێدارەدانی شەهید عەزیز ، مەلا عەلی خراوەتە شوێنەکەی (عەزیز) .. لەبەرگرنگیی شیعرەکە وەکو بەرهەمی شەهیدێك و شوێنی نووسینی شیعرەکە و پەیوەندیی بەشەهید عەزیزەوە . بەپەسەندم

زانــی تــەنها ئــەو (٥) چــوارینەیە لــەم کتێبــەدا جــارێکیتر بڵاوبکەمــەوە ، لەچوارینەی دووەمی (٥) چوارینەکەدا دەڵێت (پێشڕەوێك) . دیارە پێشڕەو مەبەستی مامۆستا عەزیزە ، فەرموون ئێوەو چوارینەکان ..

## ( هۆنراوەکەی شەهید مەلا عەلی )

پێ لەسەریــان دانەنێــم و نـــەڕوانــم

بەرەو شــــاری جێ هـــەواری کــاروانــم

نەکەم پێیان ، چونکە دیارە جێ پێیان

نێرەیـــەو لێــی لانــادەم تــا ئەتــوانــم

***

ئەوا ئێستا کەوتوومەتە شوێن (پێشڕەوێک)

کە لێرە بووە لەپێش مندا چەند شەوێک

دیـارە منیـش هـەر ئـەوەنــدەی لێ ئەبـم

وا بـــەنوێنی ئــەو ئــەشکێنم سەرخەوێک

***

خۆ بـــەنوێنـی جێمـــــاوی دانـــەپۆشـــم

تا پێی سووک بێ ئێشی لاشەی نەخۆشم

بۆتە بەڵکـــەی بەشوێن ئەودا ڕۆیشتنـم

ئاخۆ کێی تر پێی دێتە شوێنی خۆشـــم

***

دیسان ڕێگای شوێنێکی کەم لەپێشە

ڕێی کۆڕستان کەدڵنیام (ئەو) لـەوێشە

ئەگەر لاشەم نەشـێ بیـرێتە شوێنـی

کیانم لەسەر کوڵی سەر کۆڕی مێشە

***

کە دڵنیـام ئەچێتـە جێـی شانـازیـی

لەو ڕێیـەدا منیش ئەکەم کیانبازی

کە ئـەو خوێنـی خەڵاتـی ڕێی خەباتە

خوێنی منیـش ئەنەخشێنـێ ڕێبـازی

# شەهید عەزیز بۆ هەزاران ژیاو لە پێناوی هەزاراندا شەهید بوو

عومەر فەتاح

مالّی ئێمەو عەزیز لە گەڕەکی سەرگۆڵی سلێمانی بوو ، سالّی ١٩٦٣ هەردووکمان لە پۆلی سێی ناوەندیی بووین .. بە هۆی ئەوەی خەڵکی یەك گەڕەك بووین و هەردووکمان لە ناو ریزەکانی ( پارتی و یەکێتی قوتابیانی کوردستان )دا ئیشمان دەکرد .. یەکترمان ناسی ، لە سەرەتای یەکتر ناسینمانەوە بووینە هاوڕێی یەکتری .. عەزیز گەنجێکی بزێوی قسە خۆشی نوکتە بازو هەمیشە دەم بە قاقای پێکەنین و ئازاو چالاك بوو . لەو تەمەنەیدا پێشمەرگەی ناو شار بوو . زۆر جار باسی پێشمەرگەکان و چالاکییەکانی بۆ ئەکردم.. عەزیز سەرباری کاری پێشمەرگایەتی ئەرك و کارەکانی رێکخستنی پارتی و یەکێتی قوتابیانی کوردستانی زۆر چالاکانە ئەنجام دەدا . زۆربەی کارەکانی بە نوکتەو قسەی خۆش رادەپەڕاند . بێ باك و چاونەترس بوو ، زۆرجار سەرمان دەکردە سەرو تووڕەمان دەکردو ئەویش بە ئارەزووی خۆی لێمان تووڕە دەبوو ..

دوای ئەوەی هەردووکمان قۆناغی ئامادەییمان تەولوکرد ، من لە زانکۆی موسڵ و ئەویش لە زانکۆی بەغدا وەرگیراین .. لە سەردەمی خوێندنی کوللییەماندا ، من لە موسڵەوە بۆ کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی رێکخستنەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستان دەچووم بۆ بەغدا . ئەو رۆژانەی لە بەغدا دەمامەوە میوانی عەزیز دەبووم .. بە هۆی عەزیزەوە ،

(یاسین ئەنوەر )م ناسی ، یاسین خەڵکی کەرکووك و کوڕێکی دڵسۆزو ئازاو ڕۆشنبیرو چاك بوو .. بە داخەوە لە کاتی سەردانیدا بۆ بەسەرکردنەوەی ڕێکخستنەکانی قوتابیان لە پارێزگای کوت بە کارەساتی ئوتومبێل شەهید بوو . کاتێ عەزیز هەواڵی شەهیدبوونی دامێ زۆر دڵگرانی کردم و شەهید بوونەکەی ڕاستەوخۆ کاری لە عەزیز کردو زۆر زۆر بۆی بەداخ بوو .

هاوینان کە دەگەڕاینەوە سلێمانی ، بەیەکەوە لە ڕێکخستنی زانکۆکاندا کارمان ئەکرد . ئەو کاتە ڕێکخستنی زانکۆکانی ( بەغدا ، موسڵ ، بەسرە ) بەیەکەوە بوون . ئێمە دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکتر بووین ، زۆر کاتمان بەیەکەوەو لە ماڵی یەکتر بەسەر ئەبردو گەلێ جاریش کاك محەمەد قەرەداغیشمان لە گەڵدا بوو . عەزیز زۆر حەزی بەسەردان و سەیران و چوونە ناو کۆڕو کۆمەڵ بوو . ڕۆژانی هەینی ئەچووینە دەرەوەی شارو هەر هەفتەیەك نەچوومایە ، بە ئارەزووی خۆی قسەی پێ ئەوتم .

کاتێ خوێندنەوەی کتێبی مارکسی و ماو کرانە بەرنامە . عەزیز خوێنەرێکی چاك و بە تاقەتی ئەو کتێبانە بوو . لەسەر هەر یەکەیان گفتوگۆو لێکۆڵینەوەمان ئەکرد . هەر لەسەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەی مارکسیی و لینینیی کوردستانەوە ، عەزیز یەکێك بوو لە ئەندامە دڵسۆزو کارامەو ئازاو بە پەرۆشەکانی ئەو ڕێکخستنە .. زۆر چالاکانە کاری تیادا دەکرد .

ساڵی ١٩٧٤ بە یەکەوە لە پێنجوێن بووین و جەسوورانە کاری بۆ کۆمەڵە ئەکرد ، مامۆستای قوتابخانە بوو ، لە میانەی وانە وتنەوەدا هەوڵی ئەدا کە خوێندکارەکان بە بیرو باوەڕی کۆمەڵە گۆش بکات و ڕاشکاوانە لە پۆلدا قسەی بۆ دەکردن .. لە ئەنجامی ئەو قسە کردنەیدا زۆر کێشەی لە لایەن

پارتیەوە بۆ دروست نەبوو ، چونکە بیرو بۆ چوونەکانی لەگەڵ ئەو سەردەمەی پارتیدا نەدەگونجان و شەوانەش ئەو کەسانەی سەر بەکۆمەڵە بوون و نەخوێندەوار بوون فێری خوێندنو نووسینی دەکردن .

زۆربەی کاتەکانمان بەیەکەوە بەسەر ئەبرد ، بە تایبەتی نانی ئێوارانمان بەیەکەوە دەخوارد .. عەزیز زۆر حەزی لە برنج بوو ، جارجارە بۆ قوبڵی خواردن خۆی لێ دەشاردەوە بۆ ماڵی کاک عوسمانی حاجی عەلی کە لە ماڵی دایکی بوو . ئەگەر منیش بمویستایە خۆم لەو بشارمەوە پێم ئەوت ئەمشەو نیسکێنەمان هەیە نافەرمووی لە گەڵما بخۆیت .. یەکسەر جنێوێکی بە نیسکێنە ئەداو ئەڕۆیشت : ئێوارەیەک هات بۆ چایخانەکەی (قادر بەگ) من بە نیاز بووم شەو لەگەڵ چەند برادەرێکی تردا بم . وتی مردو ئێوارە چیمان هەیە وتم نیسکێنە ، جنێوێکی بە نیسکێنە داو ، وتی قادر بەگ ، ئادەی جامێ ماستو نانێکو چایەکم بۆ بێنە .. وتم بۆ نانو ماست دەخۆیتو ناچیت بۆ ماڵی کاک عوسمان برنجی کوردییان هەیە ، وتی نەخێر ناچمو نانو ماستەکە ئەخۆمو شەو دێمەوە بۆ لای تۆ ، کە زانیم خۆ دزینەوە لێی بێ سوودە ، وتم نانو ماست مەخۆ بەیەکەوە ئەڕۆینەوەو قبوڵی برنجمان هەیە .

عەزیز زۆر حەزی لە پاقلاوە بوو ، ڕۆژێ وتی دایکم زەرفێک ناردی بۆمباو گوێزی کوتراوو شەکری بۆ ناردوومو وتوویەتی عەزیز گیان لەوێ خۆت بیکەرە پاقلاوە ، دایکم وا ئەزانێ فرنی ئوتۆماتیکم هەیە . لەو ساڵەدا لە گەڵ عەزیزو کاک حەمە قەرەداخی بەیەکەوە خۆشترین سەفەرمان بۆ پاوە کرد ، بە نیازی خوازبێنی (سەبرییەی عارف ئاغا ) بۆی ، کە لە کولیەوە خۆشەویستی یەکتر بوون لەبەر ئەوەی عەزیز بە کەسێکی مارکسی

ناسرابوو ، هـاتوو چـۆو سـەفەرکردن زەحمـەت بـوو . بـە هـەر حاڵێـك بـوو وەرەقـەمان بـۆ کـرد ، سـێ قـۆڵی چـوورین بـۆ پـاوە ، مـاڵی عـارف ئاغـا خزمایـەتیان لەگەڵ کاکە حەمـەدا هـەبوو .بـەو هۆیـەوە کاکە حەمـە چوو بۆ ماڵی عارف ئاغا بۆ قسە کردن لە گەڵیانداو منو عەزیزیش لـە چایخانەیەك دانیشـتین .. بـە ڕێکـەوت یـەکێك لـە زاواکـانی عـارف ئاغـا لـە چـایخانەکە دانیشتبوو .. وتم عەزیز فرسـەتە هەسـتە بچۆ لایـەوەو هەنـدێ ماسـتاوی بۆ بکە ، ئیشەکەت بەدەست ئەمەیە ..تووڕە بوو ، وتی من کەی ماستاو ئەزانم هەتا ئێستا ماستاو بۆ ئەو بکەم ، وتم ساوەڵا تۆبێتو ئەو کچەت نادەنێ عارف ئاغایەك ئاغاو تۆیەك نوێنەری پرۆلیتار چاوت پێی ناکەوێت ، لەم قسەو باسانەدا بووین کاتێکمان زانـی ، کاکە حەمـە هاتـەوە بە تووڕەییـەوە ڕوویکـردە عـەزیزو وتـی : خانـە خوێیـەکم لێـرە هـەبوو ، ئـەویش بـەهۆی جەنابتەوە نەما شەڕێکی قورسم لەگەڵ کردنو گەڕامەوە . دوای ئەوە عەزیز لـە هـەردووکمان تـووڕە بـوو قسـەی خـۆی پـێ وتـین ، ئینجـا کاکـە حەمـە ڕاستیەکەی درکاندو وتی وتوویانە ئێمە ڕازینو پێمان خۆشە ، بەڵام هەندێ خزممان هەیە حەز دەکەین قسەیان لە گەڵدا بکەینو دوای ئەوە ئاگادارتان ئەکەینەوە . ئیتر گەڕاینەوە ، دوا ئەنجام بوونە هاوسەری یەکتری .

عەزیز یەکێك بوو لەو هاوڕێیانەی بڕوای بە درێژەدانی خەباتی چەکداری بوو ... بۆیە لە کاتی هەرەسی شۆڕشدا ، دلوای لە هاوڕێیانی کۆمەڵە کرد ، کە خۆڕاگر بنو لـە شاخەکان بمێننەوە هێزی چەکدارو مەفرەزەی گەڕۆك دروسـت بکـەنو دەستەی چـەکداری زۆر لـە کوردسـتاندا پێـك بهێنـنو دژی هەرەسو خۆبەدەستەوە دان ڕابوەستن ، هـەر بـەو بڕوایـەوە لـە کۆبوونـەوەی کێلوی پێنجوێنی کۆمەڵەدا ، بەشداریی کرد بەڵام لە کۆبوونەوەکەدا بڕیاری

خەباتی سیاسی درا بوو ، بۆیە یەکسەر عەزیز گەڕایەوە بۆ سلێمانی، ئەو ماوەیەی کە لەناو شاردا بوو ، بەو پەڕی جەسووریيەوە کاری بۆ رێکخستن و گەشە کردنی دەکرد ، بە ورە بەرزیيەوە هانی برادەرانی ئەدا بۆ کارکردن ، تا دروست بوونی مەفرەزەکانی پێشمەرگەو چەکدار کردنیان ، زۆر کات لە حاڵەتی خۆشاردنەوەدا بوو ، بە تایبەتی لە کاتێکدا کە شەهید شیهاب و هاورێکانی دەستگیر کران .

عەزیز وەکو وتمان بڕوای بە خەباتی چەکداری هەبوو هەر زوو دوای دروست بوونی هێزی پێشمەرگە ، ناو شاری بەجێهێشت و چووە دەرەوەو بوو بە پێشمەرگە .

دوای چوونە دەرەوەی بە ماوەیەك ، لەگەڵ کاکە حەمە قەرەداخی شەوێك بە یەکەوە چووین بۆ سەردانی ( پوورە خورشید )ی دایکی عەزیز .. کە چووینە ماڵیان ، پوورە خورشید لە ماڵ نەبوو ، وتیان وا لە ماڵی نەسرینی کچی لە سەرچنار ، لەبەر ئەوەی ئێمە بەنیازی بینینی ئەو چووبووین هەرچەند هەوڵیاندا دانەنیشتین و یەکسەر چووین بۆ ماڵی نەسرین خانی خوشکی ، کە چووینە ماڵەوەو دانیشتین سەیرمان کرد پەشۆکاوییەکیان پێوە دیار بوو .. چەند پەرداخێکی ئاو لەسەر تەپڵەکەکان دانرابوو . ئەو پەرداخانە ئەوەی دەردەخست کە میوانی تریان بووە دوای تۆزێك دانیشتن، خوالێخۆشبوو ( کاك رەئوف )ی زاوای وتی کاك عومەر ، دەمەوێت خانوەکەمان تەعمیر بکەمەوە زەحمەت نەبێت سەیرێکی ژوورەکانم بۆ بکە .. کە هەڵسام و لە گەڵیا چوومە ژوورەکەی ئەودیو سەیر دەکەم عەزیز دانیشتووە ، سەرسام بووم ، باوەشمان بەیەکدا کرد وتی بە نهێنی هاتوومەتەوە بۆ ناو شار هەندێ ئیشی ناو شارم هەیە ، ئەو شەوەمان

بەیەکەوە بەسەر بردو پێم وت عەزیز تکات لێ ئەکەم ئاگاداری خۆت بە وەزعی ناو شار باش نییەو زوو بگەڕێرەوە ، وەعدی دامێ کە سبەینێ بگەڕێتەوە ، ئەو شەوە باسی یەکەیەکەی برادەرانی بۆ کردین بە تایبەتی باسی کاك ئارام و کاك حەمە ئەمین پۆلاو کاکەکانی تری کرد کە چۆن کاریان کردووەو دەیکەن چەند ماندوون .. بە چ گیانێکی شۆڕشگێڕانە خەباتیان کردووەو ئەیکەن ، بۆ بەیانی گەڕایەوە بۆ دەرەوە .

شەوێك کاك شازاد تەلەفونی بۆ کردم ، وتی بفەرموو بۆ ماڵمان خۆشەویستێکی هەموومان لێرەیە ، کە چووم سەیر دەکەم عەزیزەو جارێکی تر هاتۆتەوە بۆ ناو شارو لە ماڵی کاك شازاد میوانە ... لە ڕاستیدا بە بینینی زۆر دڵخۆش بووین بەڵام ئەترساین لەوەی کە لەم هاتوو چۆیەدا بکەوێتە داوێکەوەو تووش ببێت ، بۆیە هەر هەموومان پێمان وت عەزیز پیاوی چاکبە ئەوەندە مەیەرەوە بۆ ناو شار ، ناو شار پیاو خراپی زۆری تێدایەو پیاوانی ڕژێم زۆر بە چڕیو بە وردی بە دواتا دەگەڕێن ، بەڵێنی دایێ کە بە زووترین کات دەگەڕێتەوە وتی کارێکی ڕێکخستنم هەیە دەمەوێت هەندێ کەس هەیە بیانبینم بە تەمای کارێکم ئەگەر سەربگرێت سەری هەموومانی پێ بەرز دەبێتەوە ، بە داخەوە هەر لەو سەفەرەدا بە هۆی چەند خۆفرۆشێکەوە کە متمانەی پێیان بوو ، بە نامەردانە دایانە دەست پیاوەکانی ڕژێمەوەو بە گرتیاندا .

دوای چەند مانگێ هەواڵمان پێ گەیشت کە لە بەندیخانەی موسڵەو حوکمی ئیعدام دراوە . منو کافیە تازە بووبووینە هاوسەری یەکتری ، بە یەکەوە ، بۆ سەردانی چووین بۆ موسڵ . لە کاتی مواجەهەکەدا جانتایەکی بە ڕەنگیانە دروستکراوی دەرهێنا کە (لە دیوێکی نووسرابوو کافیەو

دیومکەی تری عومەر) دایە دەست کافیەو وتی کافیەخان داوای لێبوردنتان لێدەکەم ، کە نەمتوانی لە ئاهەنگەکەتاندا بەشداری بکەمو ئەم دیارییە بچووکەم بۆ ئامادە کردوونو پێشکەشتانی دەکەم ، حەز دەکەم لێم وەربگرن هەر لەو مواجەهەیەدا جگە لە منو کافیە ، دایکیو خوشکەکانیو سەبریە خانی خێزانیو چەند کەسێکی تر هاتبوون ، عەزیز سەری بۆ ئیعدام کردن تاشرابوو ، کڵاوێکی لەسەر کردبوو ، خێرا خێرا خەیاری پاك ئەکردو بە پێکەنینەوە دەیدایە دایکیو خێزانیو خوشکەکانی جارجارە بەشی ئێمەشی لێ ئەدا .. دانیشتنەکەمان لە میوانداریيەکی ئاسایی دەچوو .. بە قسەو نوکتە خۆشەکانی بە پێکەنینە بەرزەکەی وای لە میوانەکان کردبوو نەیەهێشت کەس خەمباریی پێوە دیار بێت ، سەرباری ئەوەش خەمی زیندانییەکانی تری ئەخوارد .. کوڕێکی مێردمنداڵ کە ناوی (ئازاد) بوو ، حوکمی ئیعدام درابوو ، کەسو کاری لێی بێ ئاگابوون ، ناونیشانی ماڵەکەیانی دایە (ئێمە) کە لە هەولێر بچینە ماڵیانو کەسو کاری ئاگادار بکەینەوە ، بۆ ئەوەی بچنە سەردانی .

مامۆستا عەزیز لە بەندیخانەی موسڵ نموونەی پیاوی ئازا و خۆڕاگرو قارەمان بوو . لە کاتی تەحقیقدا نەیانتوانی زەفەری پێبەرنو هیچ نهێنییەکی پێبدرکێنن ، تەنها ئەوەندەی لەسەر خۆی وتبوو ، من پێشمەرگەمو لە شاخبووم ئاگاداری هیچ کارو کەسێکی ڕێکخستنی ناو شارەکان نیم ، ئێمە کە سەردانمان دەکرد ، هیچ جۆرە مەترسییەکمان نەبوو، چونکە ئەمانزانی چ پیاوێکی قارەمانە ، عەزیز لە بەرامبەر جەلادەکانی بەعسدا ، لە شێر شێرترو لە پڵنگ پڵنگتر بوو .. کەسێکی پۆڵاینی ناو بەندیخانەکە بوو ، بە قسە خۆشەکانیو بە ورە بەرزییەکەی ،

هـەموو بەندییـەکانی گەشـاندبۆوە و وورەی بـەرز کردبوونـەوە . هـاوڕێی بەندییەکان بوو ، وایکرد بوو بووبووبە هاوڕێی پاسەوانەکانی بەندیخانە زۆریان خۆش دەویست . بۆ هەموو کارێك سەیری قسەی ئەویان دەکرد ، هەرچییەکی بوتایە نەیان وت مامۆستا وا ئەڵێت ئیتر تـەواو . بە قسە خۆش و نوکتە بەلەزەتەکانی سیمای ناو بەندیخانەکەی گۆڕیبوو . ئێمە کە سەردانمان دەکرد ، چەند سەیری بەندییەکانمان دەکرد ، کەسێکی تر وەکو مامۆستا عەزیز وورە بەرزو گەشبین و بێ خەم نەبوو ، زوربەیان کە کەس و کاریان دەهاتن بۆ لایان نەیاندەتوانی کەشێك بخوڵقێنن تا کەس و کارەکەیان دڵخۆش بکەن و لە خەمیان کەم بکەنەوە ، مامۆستا عەزیز بە پێچەوانەوە بە قاقای پێکەنین و قسەی خۆش و گاڵتە باری ناو بەندیخانەکەی گۆڕیبوو .. لە مواجەهەیەکدا ، کە لە گەرمەی قسە کردندا بوو ، مواجەهەکە تەواو بوو ، مامۆستا عەزیز تووڕە بوو ، وتی قسەکانمان تەواو نەکردو مواجەهەکەیان تەواو کرد ، بەڕێوەبەری بەندیخانە وتی لەبەر خاتری مامۆستا نیو سەعات مواجەهە درێژ دەکەینەوە ، چونکە دایکی درەنگ کراوەتە ژوورەوە . ئەوەی لە مامۆستا عـەزیزم دیـوە لـە ڕۆژانـی یـەکتر ناسینمەوە تـا دوا بینینـی لـە بەندیخانـە .. پیاوێکی خاوەن بیرو بـاوەڕ ، کەسێکی خۆشەویست ، ئازا، بەهیمەت، بێ پێچ و پەنا ، قسە لەڕوو، گەشبین، لەناو خەڵك و هاوڕێیانیدا خۆشەویست ، هـەردەم دەم بە قاقـای پێکـەنین و قسـە خـۆش و نوکتـە باز ، باوەڕی تەواوی بە خەباتی چینە هەژارەکانی کوردستان هـەبوو ، بە هـەموو توانایەوە لە ڕیزیاندا تێدەکۆشاو خەباتەکەی بۆ ئەوان بوو . قسەی لە کەس نـەدەخواردەوە ، لـە ئاسـتی ڕاسـتیدا ڕادەوەسـتا ، ناهـەقیی لـە کـەس قبـوڵ نەدەکردو دەچوو بەگژ هـەر کەسێکدا بـە ناهـەق قسـەی بەرامبـەر بکردایە .

دڵسۆزی جووتیاران و کرێکاران و هەژاران و خوێندکاران و مامۆستایان و هەموو هاورێکانی بوو ، پیاوێکی بە وەفاو جەسوورو بە توانا و خۆشەویست بوو .

هەزار سڵاو لە گیانی پاکی شەهید عەزیزو هەموو شەهیدانی کوردستان .

**مولازم عومەر :**

## سەروەریی بوونم بە کۆمەڵە بە پلەی یەکەم دەگێڕمەوە بۆ شەهید عەزیز و شەهید جەماڵە رەش

کاک عومەر عەبدوڵڵا کە هەموومان بە کاک مولازم عومەر بانگی دەکەین، یەکێکە لەو هاوڕێیانەی شەهید عەزیز.. کە لە تەمەنی مێردمنداڵییەوە بوونەتە هاوڕێی یەکتری، هەردووکیان لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تریان دەیان یادەوەری جۆراوجۆریان لەگەڵدا بووە.. من لەبەرئەوەی هاوڕێیەکی نزیکی شەهید عەزیز بووم. دەمزانی کاک عومەر-یش هاوڕێیەکی زۆر دڵسۆزی شەهیدبووە. کاتێ پرۆژەی نووسینەوەی ژیاننامەی شەهیدم کردە بەرنامە. یەکەمجار پرۆژەکەم بۆ ئەو باسکردو ئەویش زۆر دڵسۆزانە، دەستخۆشیی لێکردمو هانیدامو بە کارێکی زۆر بەجێو دڵخۆشکەری لەقەڵەمدا. وتی ئەمجۆرە پرۆژەیەو بەمشێوەیە کارێکی نوێیە لە نووسینەوەی بیرەوەرییدا و ئەمکارە وەفایەکی هاوڕێیانەیەو ئومێد دەکەم تیایدا سەرکەوتووبیت، مامۆستا عەزیز زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێت نەک کتێبێک بەڵکو چەندین کتێبی لەسەر بنووسرێت.. نامەم بۆ کاک عومەر نارد... دوای نامەکە حەزی نەکرد، رۆژێ بەیەکەوە دانیشین و ئەوەی لەبیری ماوە بۆمبگێڕێتەوە... سەرقاڵیی هەردووکمان دانیشتن و یەکتربینینەکەی دواخستین، تا رۆژی ١٥/٤/٢٠٠٤ی رەخساندو لەماڵی خۆیان ماوەیەکی زۆر دانیشتین، لە رێگای چەند پرسیارێکەوە.. رامانکێشا بۆ ئەوەی بکەوێتە گێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی خۆی لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا. دڵنیام بەم بابەتەی کاک

عومەر کتێبەکە زۆر باش دەوڵەمەند دەبێت و ناوەرۆکێکی بەهێزترو خۆشتری دەبێت، چونکە کاک عومەر بەئاگایانەو بێ پێچ و پەنا رووداوەکان دەگێڕێتەوە.

* کاک عومەر.. دەکرێت بپرسین، کەی و چۆن و لەکوێ مامۆستا عەزیز-ت ناسی و بوونە هاورێ؟

– یەکترناسینی من و مامۆستا عەزیز کۆنە، ئەتوانم بڵێم دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٨-١٩٥٩ .. کە ئەو کاتە ئەوان ماڵیان لە گەڕەکی سەرگۆڵ و ئێمەش ماڵمان لە گەڕەکی سەرشەقام بوو. شەقامی بەر خانەقا وەکو شوێنێك لە نێوانی سەرگۆڵ و سەرشەقامدا، بووبوو بە نێوەندی بەیەکگەیشتن و یەکتر بینینمان. لە قۆناغی خوێندنی ناوەندیی هەردووکمان لە قوتابخانەی ناوەندیی جەمهوری و لە قوناغی ئامادەییش لە قوتابخانەی ئامادەیی وەتەن بووین. ئەو ساڵێك لە پێش منەوەبوو. ئێمە کۆمەڵێ هاورێ بووین ، کە هەر هەمووومان لە تەمەنێکدا بووین. ئەو کۆمەڵە هاورێیە (شەهید عەزیزو من و شەهید جەمالەڕەش و شەهید شێخ عەبدولی بەرخانەقاو خوالێخۆشبوو رەئووف بالأبەرزو چەند هاورێیەکیتر) کە تا ئێستا لە ژیاندا ماون و نامەوێت ئەوانە ناو بهێنم. زوربەی کاتمان بەیەکەوە بەسەر دەبرد ، زۆر یەکتریمان خۆشدەویست. شەهید عەزیز لەو هاورێیانەبوو، کە دانیشتن و بەیەکەوە گەڕانمانی بە نوکتەو قسەی خۆش گەرمدەکرد.

* نازانم ئێوە کەتەمەنتان بەیەکەوە بەسەربردووە و هاورێی یەکبوون، کاری سیاسیشتان یان با بڵێین کوردایەتیشتان بەیەکەوە دەکرد؟

– لەسەرەدەمی سالأنی شەستەکاندا، لەناو ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستاندا، بەنهێنی کارماندەکرد. بەلأم

بەیەکـەوە نـا، لەهـەمان کاتـدا یـەک ئاگامـان لـەکاری یـەکتری بـوو.. لـە شەسـتەکاندا.. شـەهیدو مـن و کـاک مەسـعود محەمـەد سـەعید بەیەکـەوە داوامانکرد بمانکەنە پێشمەرگەی ناو شاری سلێمانی.. هەرسێکمان پێکەوە لە شانەیەکی پێشمەرگەی ناوشاردا دانراین و (کاک قادری حاجی فەرەج ئاغا) پەیوەندیی پێوەکردین و پێی ڕاگەیاندین کە ئەو لێپرسراومانە... لەو شانەیەو لە بواری پێشمەرگەی ناوشاردا لە ساڵی ١٩٦٢ەوە تا ساڵی ١٩٦٤ ماینەوە تا ئینشیقاق واتە تائەو کاتەی دووبەرەکی کەوتە ناو پارتییەوە ، ئیتر ئێمـەش وازمـان هێناوهەریەکـە بـە لایەکـدا ڕۆیشـتین و لـە سیاسـەتدا لەیەکتر دوورکەوتینەوە، بەڵام هاوڕێیەتیمان هەر خۆش و گەرم و پتەوبوو.

ئەو کاتەی بەیەکەوە پێشمەرگەی ناوشاربووین، ڕۆژێك کاك قادری حاجی فەرەج هات و پێی وتین دەبێت ئەمشەو یەکە یەکە بچن بۆ گردی سەیوان ، کە ئەوبەری چەمەکە پێیان دەوت (کاسەو کەوچك) ، بە فیکە لێدان بۆ ناو خزنەکان سەربکەون... ئێمە یەکە یەکە لەسەر فەرمانی ئەو بە فیکە لێدان سـەرکەوتین. کـاك قـادر لەسـەرەوە چـاوەڕوانی دەکـردین... لـەدواجاردا پرسیمان ئەمە چیبوو بۆ وامـانکرد؟ کاك قادر وتـی ئـەوە بۆ ئـەوەی بزانین ئـەتوانن و زاتدەکـەن بـەناو گۆڕسـتاندا، بگـەڕێن و نەترسـن... واتـە بـۆ تاقیکردنـەوەمانبوو. تـا بـزانن بـەغیرەتین و ناترسـین... ئـەم ڕووداوە کـاك مەسعود بیری هێنامەوە.

دوای ساڵی ١٩٦٤ بە بەردەوامی لای کاك شەوکەتی مەلاو لە محەلەکەی شەهید جەمالەڕەش بەردەوام یەکمان دەبینی و موناقەشەمان لەگەڵ یەکدا دەکـردو زۆرجـاریش لەیـەك هەڵدەبەزینـەوە ، بـەڵام موناقەشـەو هەڵبەزینەوەمان نەدەبووە هۆی دوورکەوتنەوەو لەیەکجیابوونەوەمان. بەڵکو

بە پێچەوانەوە دوای هەموو موناقەشەیەك هاوڕێیەتی و برایەتیمان گەرمترو پتەوتر دەبوو.

* دەکرێت بزانرێت شەهید عەزیز لە ساڵی ١٩٧٤دا کە هاتە دەرەوە بۆ ناو شۆڕش .. لەو ساڵەدا یەکترتان دەبینی؟

- بێگومان ساڵی ١٩٧٤ کە هاتە دەرەوە من لە ناوچەی چۆمان بووم. عەزیز-یش هاتە ئەو ناوچەیەو لەوێ یەکترمان بینی ؛ عەزیز دەیویست لەناو شۆڕشدا کارێکی بدەنێ... بە داخەوە بەرپرسان ، زۆر گوێیان بۆ داواکەی نەدەگرت و نەیاندەویست کاری بدەنێ. ئەو ماوەیەی لەو ناوچەیەدا مایەوە بە بەردەوامیی یەکترمان دەبینی... زۆر قسەماندەکرد. ڕۆژێ پێم وت (عەزیز من هەست دەکەم ئێوە خەریکی ڕێکخستنێکن و لە ڕێکخستنێکدا ئیش دەکەن... منیش حەز دەکەم کارتان لەگەڵدا بکەم)... هیچ وەڵامێکی پرسیارەکەی نەدامەوەو خۆی نەدا بە دەستەوە.. ڕۆژێکیتر لێم دووبارە کردەوە. ئەمجارەیان وتی ئێمە هیچ ڕێکخستنێکمان نییەو سەربەهیچ ڕێکخراوێك نین. تەنها ئەوەیە ئێمە کۆمەڵێ گەنجین و لەبواری ڕۆشنبیریی و هوشیاریدا کۆدەبینەوە وەکو ئەڵقەیەکی ڕۆشنبیریی... تێی گەیشتم کە نایەوێت لەو بارەیەوە هیچ لای من بدرکێنێ . دوای ماوەیەك کە لەوە بێنومێدبوو هیچ کارێکی نادەنێ گەڕایەوە بۆ ناوچەی سلێمانی، لە پێنجوێن کردیانە مامۆستا . هەرجارێك بچوومایەتەوە بۆ ئەو ناوچەیە ، یەکترمان دەبینی بە تایبەتی کاتێ بە مۆڵەت دەچوومە ناوچەکەو چەندرۆژ دەمامەوە ئەو ڕۆژانە بە بەردەوامی بەیەکەوە دەبووین.

* ئێوە کە ئەوەندە.. هاوڕێی یەکتری بوون.. دەبێت دوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥.. یەکترتان بینیبێتەوە..؟ لەکوێ یەکتان دەبینی؟ لەو یەکتر بینینەتاندا باسی چیتاندەکرد؟

– دوای گەڕانەوەمان بۆ شاری سلێمانی ، لەبەر خانەقاو گەراجەکەی شەهید جەمالەڕەش بە زۆری یەکترمان دەبینی... لەو یەکتر بینینەدا، قسەمان دەکرد، موناقەشەمان لەسەر شۆڕش و بارودۆخی کوردستان و خەڵکی کورد دەکرد، هەڵسوکەوتەکانی بەعسمان تاووتوێدەکردو مەترسییەکانی سیاسەتی بەعسمان شیدەکردەوە... ڕۆژێ ڕاشکاوانە قسەم لەگەڵ شەهید جەمال و شەهید عەزیز–دا کرد وەکو دوو هاوڕێی زۆر نزیک و دڵسۆزو خۆشەویست. پێم وتن ئەوە ئێستا هیچ لەئارادا نەماوە شۆڕش نەماوە. حکومەت وا خەریکی جێبەجێ کردنی سیاسەتی خۆیەتی دژی گەلەکەمان، پێم خۆشە ئەگەر شتێك، تەنزیمێك ، ڕێکخراوێك هەیەو ئاگاتان لێی هەیەو ئێوە ئیشی تیادا دەکەن، حەزدەکەم منیش لە گەڵتانابم و ئیشی تیادابکەم و بەو ڕێکخستنەم بناسێنن. من ئەو کاتە ڕەوانەی خوارووی عیراق کرابووم و لەشاری عەمارە بووم. هەرجارێك بهاتمایەتەوە یەکترمان دەبینی و بەدوای ئەو قسەیەمدا دەچوومەوە. جارێك لە جارەکان کە هاتمەوە.. ماموستا عەزیز پێی ڕاگەیاندم کە قسەی لەگەڵ برادەراندا کردووەو دەیانەوێت بمبینن.

لە ماوەی دوو سێ سەفەری ڕۆیشتنەوەو هاتنەوەمدا، بەسەریا خاڵە شیهاب و هاوڕێکانی گیران.. هەستمکرد شیرزەییەکیان پێوەدیارە ، لە ڕاستیدا من ئەو کاتە شارەزای کۆمەڵەو ڕێکخستنی نەبووم. نەمدەزانی ڕێکخستنیان چۆنەو چۆن نییە...

ڕۆژێ ماموٚستا عەزیز.. منی لەگەڵ خوٚیدا برد بوٚلای (شەهید ئارام) کە ئەو کاتە (شەهید ئارام) لە ماڵی ماموٚستا عەزیز بوو... لەو سەردان و بەیەکگەیشتنەی من و شەهید ئارامدا ئیتر من دەستم بە ئیشکردن کرد لە کوٚمەڵەدا .. (کاک ئارام) پێی ڕاگەیاندم کە بە نیازن دەستەی چەکدار دروستبکەن، وتی بوٚ ئەم کارە پێویستیمان بە کەسانی وەکو توٚیە کە شارەزاییت هەیە، جا نازانم دەتوانیت و تاقەت و توانات هەیە. منیش وتم ئامادەم و هەرچیم پێبسپێرن و پێم بکرێت دەیکەم. وتی زوٚرباشە من پێم باشە کار بوٚ ئەوە بکەین.. ئەو کەسانەی کە ئەفسەر بوون و دەیانناسیت و متمانەت پێیان هەیە قسەیان لەگەڵدا بکەیت، ئەوانەی دەیانەوێ ئیش لەگەڵ کوٚمەڵەدا بکەن، ئیشی پێدەکەین و ئەوەشی دەیەوێت لەناو (ی.ن.ك)دا وەکو پێشمەرگە کاربکات ، دەیاننێرینە دەرەوەو دەیانکەینە پێشمەرگە. دوای ئەو بینینە (شەهید ئارام) ناوبەناو لەگەڵ کاک سالار عەزیزو دواتر کاک مەلا بەختیار لە ماڵی شەهید عەزیزو شەهید جەمالەڕەش و کاك یونس غەفور دادەنیشتین و کوٚبوونەوەمان دەکرد، تا ئەو ڕوٚژەی چوومە دەرەوە من تەنها شەهید عەزیزو شەهید ئارام و کاک مەلا بەختیارو کاك سالار عزیزم دەناسی .

(بەشانازییەوە دەیڵێم سەروەریی بوونم بە کوٚمەڵە بەپلەی یەکەم دەگێڕمەوە بوٚ شەهید ماموٚستا عەزیز و شەهید جەمالە ڕەش) .. هەر چوومە دەرەوە من ئیتر پەیوەندیم لەگەڵیاندا پچڕا ..

* عەزیز دوای چوونەدەرەوەی جەنابت ئەویش چووە دەرەوە . کەی هاتە دەرەوە ، کەهاتە دەرەوە یەکترتان لەکوێ بینی ؟

–ساڵی (١٩٧٧) شەهید هاتە دەرەوە ، ئەو و کۆمەڵێ کادری تری کۆمەڵە کەهاتبوونە دەرەوە ، لەشارباژێڕەوە بەرەو ناوچەی بادینان بەڕێکەوتبوون ، هاتنە سێ کوچکەی نێوان (عیراق – ئێران – تورکیا) من لەوێ بووم لەدامێنی چیای (دالانپەر) لە (دۆڵی گۆستێ) یەکمان بینییەوە .. بارەگای بەڕێز (مام جەلال و کاک نەوشیروان) و ئەو تێکۆشەرانەی تر، کە لەسوریاوە گەڕابوونەوە هەموو بەیەکەوە لەو ناوچەیە دانرابوو . ماوەیەکی زۆر لەو ناوچەیە ماینەوە ، لەو ماوەیەدا تەشکیلاتی عەسکەریی کراو هەم سەرکردایەتی (ی.ن.ك) دامەزرا ، لەیەکەم دامەزراندنی سەرکردایەتی یەکێتیی عەزیز کرایە ئەندامی سەرکردایەتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و بەلێپرسراوی لقی دووی کەرکوك دانرا بۆ ناوچەی قەرەداغ ..

لە(١٩٧٧/١٢/١) بەقافڵەیەکی گەورە لەگەڵ کاك نەوشیروان و کۆمەڵێ کادری کۆمەڵەو یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وەکو لەبیرم بێت (٣٩) کەس بووین و (١٠) بار چەکمان لەگەڵ خۆمان بەڕێخست و بەرەو ناوچەی سلێمانیو قەرەداغ بەڕێکەوتین ، لەو قافڵەیەدا وا دانرا ، هەر (٣) کەس و بەرپرسی بارێك بن ، (٢٥) رۆژ بەڕێوەبووین ، بەسەر سنووری عیراق ئێراندا دەڕۆیشتین ، ئەو شوێنانەی دەکەوتنە سنووری ئێرانەوە بەشەو دەمانبڕین و بەڕۆژ دەحەسباینەوە .. وەرزەکە وەرزی زستانبوو ، زۆر شەو و رۆژ تووشی بەفرو زریان دەبووین ، زۆر ماندووی دەکردین و شپرزە دەبووین ، رووداوی قورس و ناخۆشمان دەهاتەڕێ . رۆژێك لەسەر (چەمی گادەر) شەومان بەسەرداهات .. ئەو شەوە تا بارەکانمان لەچەمەکە پەڕانەوە ئەوەندەمان لەئاوەکەدا .. هەموو جلەکانمان تەڕبوو . بەیانی کەهەستاین و کەوتینەڕێ . من و مامۆستا سەلام عەبدوڵڵا شانبەشانی یەك لەگەڵ

قافڵەکەدا دەڕۆیشتین ، مامۆستا عەزیز و شەهید عەلی ئامەخان بەیەکەوە لەپێشمانەوە بوون ، گەڕانەوەو بەپێکەنینەوە وتیان مژدەیەکی خۆشتان دەدەینێ ، وتمان ئادەی ، وتیان دوو سەعاتی تر دەگەینە شوێنێك داری لێیەو دەتوانین ئاگر بکەینەوە و خۆمان وشك بکەینەوە ، مامۆستا سەلامیش کتوپڕ وا وەڵامی دانەوە ، وتی خەڵکی خواپێداو ئێستا لەتەیارەدایە .. ئاگاداریان دەکەنەوە کە پاش دوو سەعاتی تر لەپاریس یان نیویۆرك دادەبەزن . ئێوەش دەڵێن دوای دوو سەعات دەگەینە شوێنێك تەنیا داری لێیەو ئاگر دەکەینەوەو خۆمان وشك دەکەینەوە ، شوێنەکە نەدیێەو نەئاوەدانییە .. توخوا ئەوە مژدەیە .

ڕووداوێکی تری مامۆستا عەزیز .. قافڵەکەمان لەهەڵشۆوە گەیشتە شێنێ، لەبەر ئەوەی بەفرێکی یەکجار زۆر باریبوو .. ڕۆژێ بوو لەڕۆژە سەختەکانی زستان ، بۆیە ناچاربووین (٣) سێ ڕۆژ لەشێنێ بمێنینەوە ، دوای سێ ڕۆژەکە لەخەڵکی شێنێ (١٥ تا ٢٠) کەسمان لەگەڵ خۆمان برد ، بۆ ئەوەی ڕێگەکەمان بۆ بشکێنن لەشاخی هەڵشۆ .. هەربە شاخەکەدا سەرکەوتین ، کردی بەکڕێوەو زریانێکی زۆر سەخت و هەوا بەتەواوی گۆڕاو ئەو کەسانەی لەگوندی شێنێ لەگەڵماندا بوون ، سەیرمانکرد کەوتوونەتە گریان و هەرهەموو وەزعیان زۆر خراپە ، کەلێمان پرسین بۆ وادەکەن ، وتیان ڕۆژەکەی زۆر سەختە و دەترسین هەموومان ڕەق ببینەوە .. بۆیە ئێمەش بەناچاری لەشاخەکەوە گەڕاینەوە بۆ ناو هەڵشۆ .. لەناو هەڵشۆ من و کاك نەوشیروان چووینە ئاشێکەوە ، بەدیار بارەکانەوە ماینەوە ، بەڵام مامۆستا عەزیز و ئەوان بەسەر ماڵەکاندا تەوزیع بوون ، بەیانی کەڕۆژ بۆوە ، چاوەڕوانی مامۆستا عەزیز و ئەوان بووین ، کە بێن بۆلامان و بکەوینەڕێ ،

بەڵام دیار نەبوون ، لەگەڵ کاك نەوشیرواندا چووین بۆلایان ، کەچووین لەماڵێك خەریکی نانخواردنی بەیانی بوون ، هەندێ دەنگەدەنگمان بوو لەبەر ئەوەی لەکاتی خۆیدا نەهاتبوون . ئەو دەنگەدەنگە کاك نەشیروان لەبیرەوەرییەکانی خۆیدا نووسیویەتی و من نامەوێت دووبارەی بکەمەوە ، چووینەوە سەر شاخ ، بەکۆڵ بارەکانمان هێنایەوە خوارەوە لەوڵاخەکانمان بارکرد و کەوتینەوە رێ ، وەکو وتم قافڵەکە وادابەشکرابوو هەرسێ کەس و مەسئولی بارێك بوو ، مامۆستا عەزیز و شەهید عەلی ئامەخان و فوئاد یاسین کە ناسرابوو بە (هەژار) مەسئولی بارێك بوون ، لەرێگا بارەکەیان زووزوو شل دەبووەوە و دەکرایەوەو دەکەوت .. ناچار دەبوون بارەکە بارکەنەوەو بیبەستنەوە ، لەو قافڵەیەدا حاجی مەحمودی گەورەدێمان لەگەڵدابوو، روویکردە مامۆستا عەزیز و پێی وت مامۆستا عەزیز عەیبە بۆ ئێوە سێ کەسی مەسئولن ناتوانن بارەکەتان وا بار بکەن تا قۆناغەکە تەواو دەکەین ئەوەندە نەکرێتەوەو نەکەوێت وەکو ئێمە لەبارکردنەوە تا قۆناغەکە تەواو دەکەین ناکەوێت ، مامۆستا عەزیزیش ئەیهێناو ئەیبرد ، وتی کاکە حاجی بڵێم چی ، چووزانم رۆژێ بەم رۆژە دەگات دەبمە قەتارچی ، خۆ ئەگەر بمزانیایە دەبمە قەتارچی ، نەدەچوومە قوتابخانە و نەمدەخوێند ، دەچوومە یەکێك لەخانەکان و دەبووم بەخانچی بۆ ئەوەی فێری بارکردن و قەتارچێتی ببم .

کە قافڵەکەمان گەیشتە گەورەدێ و ناوچەی سلێمانی ، دێتەوە یادم کاك نەوشیروان مامۆستا عەزیزی بانگکرد، بۆ هەندێ ئیشوکاری رێکخستن ناردییەوە بۆ سلێمانی بۆلای (شەهید شازاد سائیب) .. کاك نەوشیروان وای ناردەوە دوای ئەنجامدانی کارەکە بەدووسێ رۆژ بگەرێتەوە ، بەڵام شەهید

عەزیز لەکاتی بۆدانراودا نەگەڕایەوە ماوەیەك لەناوشاردا مایەوە و ئێمە هەر چاوەڕوانمان دەکرد بۆ گەڕانەوە .. ناچار من نامەیەکم بۆ نووسی .. نامەکە هەندێ بەتوندی و بەعاجزییەوە بۆم نووسیبوو ، بۆم نووسیبوو ئێمە هێزێکین لەم ناوچەیە ماوینەتەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی تۆ دەکەین و عەیب نییە بۆ تۆ ماویتەتەوەو ئێمەشت لێرە مەعتەلکردووە ، نامەکەمان بەشەهید عەلی ئامەخان دا بۆ نارد .. شەهید عەلی گێڕایەوە .. وتی کەچوومە سلێمانی مامۆستا عەزیزم لەماڵی نەسرین خانی خوشکی لەسەرچنار دۆزییەوە ، کەچوومەلای و نامەکەم دایە ، کردیەوە کەنامەکەی خوێندەوە تووڕە بوو ، نامەکەی دایەدەست سەبریەخانی ژنی و وتی سەیرکە من کاك عومەرم کردووە بەکۆمەڵە ، کەچی وائێستا ئەو موحاسەبەی من دەکات ، بەدوای نامەکەدا گەڕایەوە ، هەر گەڕایەوە دوای ماوەیەك شەهید شەماڵی باخ نامەیەکی شەهید ئارامی هێنابوو ، بۆ کاك نەوشیروان ، کەچەکەکانی بەری قەرەداخ تەسلیمی ئەو بکرێت .. مامۆستا عەزیز لەگەڵ شەهید شەماڵدا گەڕانەوە بۆ قەرەداخ ، کەچووە قەرەداخ ئیتر یەکمان نەبینیەوە تاساڵی داهاتوو ، تا بۆ کۆبوونەوەی سەرکردایەتی هات بۆ نۆکان ، ماوەی مانگێك مایەوە ، ئەو ماوەیە شەوانە هەر بەیەکەوە بووین ، شەوانە بەنوکتەو قسە خۆشەکانی مەجلیسی بۆ گەرم دەکردین ، شەوێك کەبەیەکەوە لەیەك خەیمەدا بووین .. ژیانی ئەو سەردەم و کاتە لەژیانی رۆژانەماندا .. هەمووممان لەخواردن و لەحەراسەتدا وەکو یەکبووین ، جیاوازی لەخواردن و حەراسەتدا لەنێوان مەسئول و پێشمەرگەدا نەبوو ، وەکو ئێستا خواردن یەك خواردن بوو ، هەرهەمووش بەپێی کاتەکان حەراسەت بۆ هەموو دانەنرا، هەموو پێشمەرگەیەك و مەسئولێك حەراسەتی دەگرت ، شەوێك

مامۆستا عەزیز دانرابوو بۆ حەراسەت وتی من ئەمشەو حەراسەت ناگرم ، بەخەنە سبەی شەو ، شەهید شێرکۆ جیدی هەڵیدایەو وتی ئەمە قبوڵ نییە هەرکەس دەبێت لەسەرەی خۆیدا حەراسەت بگرێ ، مامۆستا عەزیز-یش وەڵامی دایەوەو خۆی لێتووڕە کرد (بۆ گاڵتە و سوعبەت) وتی بزانە لەگەڵ کێدا قسە دەکەیت ، من لەسلێمانی و لەبەر خانەقا بەمامۆستا عەزیز نەناسراوم بەعەزەی خورشە ناسراوم .. شەهید شێرکۆ وتی من ئەم ناوەم نەبیستووە لەسلێمانی ، وتی نەتبیستووە لەئێستاوە بیبیستە ، منیش هەڵمدایە بۆ ئەوەی گوڵمەزەکە خۆشکەم .. وتم راستە مامۆستا عەزیز پیاوێکی تێکۆشەری بەناوبانگە ، بەڵام لەبەرخانەقای سلێمانی خەڵك بەم ناوەوە دەیناسن ، کاتێ شەهید شێرکۆ تێگەیشت قسەکان بۆ گاڵتەو پێکەنینە .. ئیتر بوو بەپێکەنین .. لەگەڕانەوەماندا لەبادینانەوە بۆ ناوچەی سلێمانی ، رۆژێ تووشی تەق و تۆق و شەڕێکی بچووك بووین لەگەڵ مەفرەزەیەکی ئەوکاتەی قیادە موەقەتە . مامۆستا عەزیز لەگەڵ کاك فوئاد یاسین بەشانی یەکەوە ئەبن ، کە شەڕەکە تەواودەبێت ، بەکاك فوئاد دەڵێت فوئاد ئەمە دووهەم جارە تووشی شەڕو تەقەبیم و لەهەردووجارەکەدا فریای ئەوە نەکەوتووم سەنگەر بگرم و خۆم بدەم بەئەرزدا .. هەر بەپێوە تەقەمکردووە ، کاك فوئادیش بەپێکەنینەوە وەڵامی دەداتەوەو پێی دەڵێت بۆ جاری سێیەم دەڵێن مامۆستا عەزیز بەپێوە تەقەی دەکرد و شەهید بوو .

ئەو سەردەمە لەو ناوچانە نەکارەبا هەبوو نە تەلەفزیۆن ، شەوانە گیانمان بە مامۆستا عەزیز بوو بەقسە خۆشەکانی مەجلیسی شەوانەی بۆ گەرم دەکردین ..

دەگێڕنەوە کەلەبەری قەرەداخ بووە بۆ حەراسەت دایانناوە ، بەشەهید ئارامی وتووە : کاك ئارام بۆ قازێ نەکرین شەو بیکەین بەحەرەس .. هەر کەسێ بێت بەلایدا ئەو دەیکاتە قیڕەقیڕ و هەرا .. حەراسەتەکەشی پێدەگرین و هەر کاتێکیش برسیمان بوو سەری دەبڕین و گۆشتەکەی دەخۆین و قازێکی تر دەکڕینەوە .

* چی زانیارییەکت لەگرتنەکەی شەهید عەزیز هەیە ؟

من ئاگام لەڕۆیشتنەوەی مامۆستا عەزیز نەبوو بۆ ناوشار ، بەڵام ڕۆژێ من و کاك سەلام عەبدوڵڵا بەنهێنی چووینەوە بۆ سلێمانی ، خەبەرمان بۆ ڕێکخستنی ناوشار نارد ، هەر زوو ڕێکخستنی کۆمەڵە لەناوشاردا ، جوابیان بۆ ناردین کە کارێکی باشیان نەکردووە هاتوونەتە ناوشار ، وەزعی ناوشار زۆر خراپە ، دوێنێ مامۆستا عەزیز گیراوەو داوایان لێکردین کەنەمێنینەوەو هەرزوو بگەڕێینەوە بۆ دەرەوە .. ئێمەش دوای چەند ڕۆژ گەڕاینەوە ، بەڵام لەماوەی ئەو چەند ڕۆژە کەلەسلێمانیماینەوە ، سەبارەت بەمامۆستا عەزیز و شەهید کاك مولازم ستاری سەعید خەڵەف دەمەوێت شتێك بۆ مێژوو بگێڕمەوە ، ئەو کاتەی من و کاك سەلام چووینە ناو شارەوە کە لەناوشاردا ماینەوە . شەهید ( مولازم ستاری سەعید خەڵەف ) کە پێشمەرگەیەکی ئازاو قارەمانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی ( ی . ن . ك ) بوو .. تەسلیم بەرژێم بووبۆوە .. لەبەر ئەوەی من دڵنیا بووم کە خیانەت لە ئێمە ناکات .. خەبەرم بۆنارد .. کە دەمەوێت ببینم‌و کارێکم پێیەتی .. یەکسەر هات بۆلامان . بە ئوتومبێلەکەی شەو بردینی بۆ ماڵی خۆیان .. پێم وت .. کاکە ئەگەر شتێکت لەدەست دێت بۆ مامۆستا عەزیز بەناوی خۆمەوە دلوات لێدەکەم هەوڵی بۆ بدەیت ، چونکە تۆ تازە گەڕاویتەوە ناو ڕژێم ئیحتیماڵە

گوێ لە قسەت بگرن .. شەهید ستار وەڵامی داینەوەو وتی دڵنیابن ئەوەی بەمن بکرێت دەیکەم و هەوڵی جیدی دەدەم ، جگەلەوەی ئێوە داوام لێدەکەن مامۆستا عەزیز هاوڕێیەکی نزیك و خۆشەویستمە و لەیەك گەڕەکدا بەیەکەوە گەورەبووین .. ئەو شەوە کە لەماڵیان بووین هەستمان کرد کە زۆر شڵەژاوەو بێتاقەتە .. پێم وت تۆ پیاوێکی بەهیمەت بوویت بۆ ئێستا واشڵەژاویت پێوە دیارە .. وتی راستت دەوێت من خەمی ئەوەمە کە ئێوە لە ماڵی ئێمەن و تووشی شتێکبن بۆ من زۆر زۆر ناخۆشەو دەبێتە کارەسات .

وتی من هەستدەکەم کارێکی زۆر خراپم کردووە کە تەسلیم بوومەتەوە .. وتی من داواتان لێدەکەم کە دەبێت هەر ئەمڕۆ بگەڕێنەوە و لەناوشار نەمێنن . لەبەر ئەوەی منتان بینیووە . رۆژی دوایی بۆ نیوەڕۆکەی گەڕایەوە ، پێی وتین ئەوەی بەمن کراوە کردوومە بۆ ڕزگارکردنی ، کارێکی وامکردووە لایەنی کەم لەپەتی سێدارە رزگاری بێت ، هەرچەند قەناعەتم نییە هەوڵەکە سەربگرێت لەبەر ئەوەی دەزگاکانی رژێم مامۆستا عەزیز بە باشی دەناسن و دەزانن کە یەکێکە لەسەرکردەکانی شۆڕش و یەکێتی نیشتمانی کوردستان . لەگەڕانەوەیدا مولازم مەنسووری شێخ کەریمی لەگەڵ خۆی هێنابوو ... مولازم مەنسوور وتی ماڵەکەمان لە قەراخی شارە . ماڵەکەتان بۆ چۆڵ دەکەم مانگێ چەند دەتانەوێت بمێننەوە لەماڵی ئێمە بمێننەوە . مولازم ستار وتی نا ئەوەیان لەگەڵدا مەکە . بۆخاتری خوا بابگەڕێنەوە .. هەرئێوارە بە سەیارەکەی خۆی لەگەڵ مولازم مەنسووردا گەیاندینیانە نزیکی قەیوان و ئیتر گەڕاینەوە ، دوای گەڕانەوەمان پەیوەندی پێوە کردینەوەو نامەیەکی بۆناردین . لەنامەکەدا داوای چەکی کاتمی کردبوو .. تا مدیر ئەمن یان مولازم موحسن بکوژێت .. پاش ماوەیەك

لەلایەن رژێمەوە بە شێوەیەك ئیفتیالیان کرد کەکەس نەزانێت چۆن شەهید کـراوە . ئەمـەی گێرامـەوە راسـتییەکی مێژووییـە ، دوای ئـەوەی ئێمـە گەڕاینەوە لەسلێمانی ئیتر ئاگام لەوەزعی مامۆستا عەزیز نەما .

* کاك عومەر وەکو باس دەکرێـت مامۆستا عـەزیز حوکمی لـە سێدارەدانی دراوەو نێردراوەتە موسڵ .. رژێم داوای لێکردووە . نامـە بـۆ سـەرکردایەتی بنووسـێ ، کـە ئەفسـەرێکی خزمـی سـەرەك کۆمـار لای پێشـمەرگە گـیراوە ، بەریبدەن و کەئەو بەردرا مامۆستا عەزیز بەردەدەن .. جـەنابت لـەم بارەیـەوە چی دەزانیت ؟

– وەکو وتم ئێمە هیچ ئاگایەکمان لـە شـەهید عـەزیز نـەما ، تـا رۆژێ کاتێکم زانی سەبرییە خانی خێزانی پەیـدا بوو بۆ ناوزەنگ ..خەبـەریان دایـەمن لـە مقەڕەکەی خۆم . وتیان ژنێك هاتووەو دەڵێت من خێزانی مامۆستا عـەزیزم‌و بە کارێکی تایبەت هاتووم .. منیش یەکسەر چوومە خوارەوە بـۆ پێشـوازی کردنی لەسەر چەمەکە تووشـی بوومو پەرانـمەوەو بە خێرهـاتنم کـرد. پێـی راگەیاندم کە بۆ شتێکی وا هـاتووە . وتـی نامەیـەکی مامۆسـتا عـەزیزم پێیـە بۆ بەرێز (مام جەلال) نامەکە بۆ ئەوەیە .. ئەفسەرێکی خزمی سەرۆك کۆمـار لاتـــان گـــیراوە . ئەگـــەر ئـــەو بەربـــدرێت ئـــەوانیش بـــە موقابیـــل عـــەزیز بەرئەدەن...لە نێوزەنگ کەسەردەکەوتی یەکەم بارەگا بارەگاکەی بـەرێز (مام جەلال) بوو : لەگەڵ خۆمدا بردم بۆلای بەرێز (مام جەلال) ... بەرێزیشـی زۆر بەگەرمی پێشوازی باشی لێکردو ئەویش نامەکەی دایە بەرێز (مام جەلال) ، نامەکەی خوێندەوە ، نامەکـەی وانووسـیبوو (ئەگـەر من بەشایستەی ئەوە ئەزانـن بـەو ئەفسـەرە بمگۆڕنـەوە ؛ ئـەوا داوا لـەمن کـراوە کـەمن ئـەم نامەیـە بنووسـم و داوا لەبـەرێزت و هـەڤاڵانی سـەرکردایەتی بکـەم ، ئـەو ئەفسـەرە

بەربدرێت و ئەوانیش بەموقابیل من ئازاد دەکەن ، دوا بڕیاریش بۆ بەڕێزتان دەگێڕمەوە) جەنابی (مام جەلال)یش بەخێزانی شەهیدی وت خوشکۆڵە من دڵنیام کە مامۆستا عەزیز بەو ناگۆڕنەوە و بەرینادەن و ئازادی ناکەن ، ئەم نامەیەشیان بۆ ئەوە بەو نووسیووە تا بزانن مامۆستا عەزیز ئەهمیەتی چییە لەناو (ی.ن.ك)دا ، من پێم وایە زیاتر زەختی لێدەکەن و سزای قورستری دەدەن ، بەلام بۆ دڵنیایی تۆش و ئەویش من ئەم نامەیەی بۆ دەنووسم ئێمە ئامادەین هەرچی ئەسیرێکمان لایە لەبەر خاتری مامۆستا بەری دەدەین بەمەرجێ ئەو بەربدەن .. بۆیە باسی ناوەڕۆکی نامەکەی بەڕێز (مام جەلال) ناکەم ، چونکە لە کتێبەکەدا بۆ بلاوکردنەوە دانراوە . بەڕێز (مام جەلال) بەسەبریەخانی وت خوشکۆڵە جگەلەوەی مامۆستا عەزیز پیاوێکی تێکۆشەرە ، هەر خۆشەویستی خۆشمەو عەزەکەی خۆمە ، من هەرکاتێ بانگم کردبێ بۆ ئیشێك هەر بەناوی عەزەکەی خۆم بانگم کردووە ، ئیتر سەبریە خان کەنامەکەی بەڕێز (مام جەلال)ی وەرگرت ، گەڕایەوە بۆ ناوشار .

كاك سالار عەزیز :

## مامۆستا عەزیز مەردانە ژیا و نەبەردانە شەهیدبوو

کاك (سالار عەزیز) یەکێك بوو لەهاورێ نزیکەکانی مامۆستا عەزیز ، سالآنێکی تەمەنیان وەکو هاوڕێی خەبات و ڕۆژانەی ژیان بەیەکەوە بەسەر بردووە ، وەکو خۆی دەڵێت دوو هاوڕێی گیانی بەگیانیبوون .. بۆیە کتێبێك لەسەر ڕۆژانەی ژیان و خەباتی مامۆستا عەزیز بنووسرێتەوە و چاپبکرێت، ناکرێت هاوڕێیەکی وا فەرامۆش بکرێت و بواری نەدرێتێ بۆ ئەوەی مافی هاوڕێیەتی عەزیز بەگێڕانەوەی بیرەوەرییەکانی بدات .. بەجێی خۆیمان زانی پەیوەندیی پێوە بکەین .. ڕۆژی (١٥/٤/٢٠٠٤) بەپێی ئەو هەلەی بەڕێز (کاك مولازم عومەر) لەماڵی خۆیان بۆی ڕەخساندین ، توانیمان لەگەڵ کاك سالاردا شێوە چاوپێکەوتنێك بکەین .. بەچەند پرسیارێك رایکێشین بۆ ئەوەی بیرەوەری ڕۆژانەیان بگێڕێتەوە .. بەمەبەستی ئەوەی لەڕێگای گێڕانەوەو نووسینەوەی بیرەوەرییەکانیەوە بتوانین زیاتر و باشتر مامۆستا عەزیز بەنەوەی ئەمڕۆو دواڕۆژی گەلەکەمان بناسێنین .. لەدانیشتنەکەماندا ئەم پرسیارانەمان ئاراستەی کاك سالار کرد و ئەویش بەوپەڕی پەرۆشی و شانازییەوە .. کەوتە بیرکردنەوەو وەڵامدانەوەیان ..

* کاك سالار .. حەز دەکەین بزانین کەی و چۆن لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا یەکترتان ناسی و چۆن بوونە هاوڕێ ؟

– وەکو بیرمبێت لەساڵی (١٩٦٩) بەهۆی کاری سیاسی لەناو ڕیزەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و پارتی دیموکراتی کوردستان ، یەکترمان

ناسی .. هەردووکمان لەریزی قوتابیان و پارتیدا کارماندەکرد .. هەرلەو رێگایەوە لەیەك نزیکبووینەوە و تێکەڵاوی یەکتر بووین و بووینە هاوڕێی یەکتری و هاوڕێیەتی و خۆشەویستیمان بۆ یەکتر رۆژ بەرۆژ و ساڵ بەساڵ زیادی دەکرد .. لەراپەڕاندنی کار و چالاکییەکانماندا متمانەمان بەیەك هەبوو ، هیچمان لەیەك نەدەشاردەوەو رۆژانەش بەبێ کاری سیاسیش وەکو هاوڕێی شەخسی یەکتر بووین .

لەساڵی (١٩٧٠)دا حکومەتی عیراق لەسەر بنەمای رێکەوتننامەی یانزەی ئازار ، بارودۆخێکی لەبارو زۆر خۆش بۆ کورد رەخسابوو .. ترسی پەلامار و گوشاری دام و دەزگاکانی رژێم نەبوو ، ئازادی دەربڕینی بیروڕا هەبوو . کوردستان باڵی ئاشتی و ئارامی بەسەردا کشابوو . باری ژیانی خەڵکی کوردستان باشبوو ، لەبواری سیاسی و ئەدەبی و گەشەی کۆمەڵایەتی ، چالاکی رێکخراوەیی پێشکەوتنێکی زۆر باشی هەبوو ، خەڵکی کوردستان هەستی بەجۆرێك لەسەرفرازیی دەکرد .. ئالەوکات و سەردەمەدا کەلەبەغدا بووین (کۆمەڵەی مارکسی لینینی) دامەزرا .. هەردووکمان کەسانی یەکەم دەستەکانی دامەزرێنەری ئەو کۆمەڵەیە بووین ، هەردووکمان هاوڕێی فیکر و بیرو باوەڕو چالاکیی رێکخستن و رۆژانەی ژیانی ئاسایی بووین .. ئەو سەردەمەمان سەردەمی هەرەتی لاوێتیمانبوو .. رۆژانەو شەوانەمان بەیەکەوە بەسەردەبرد ، پەیوەندیی هاوڕێیەتیمان رۆژ بەرۆژ پتەوتر و بەتینتر دەبوو ، هەردووکمان حەزمان بەسەفەرەو سەیران و دانیشتن دەکرد . زوو زوو سەفەرەو سەیرانمان رێکدەخست و شەوانەش لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی تر دادەنیشتین .. عەزیز کەسی یەکەمی رێکخەری سەفەرەو سەیرانەکانبوو . هەر ئەویشبوو سەفەرەو سەیران و دانیشتنەکانی بەگۆرانی

و نووکتەو قسەی خۆش و پێکەنین مەزاق خۆش دەکرد .. بەداخەوە هەموو سەیران و سەفەرەکانم لەبیر نەماوە ئەگینا لەهەر یەکێکیاندا چەندین یادگارو بیرەوەریی شیرینمان هەبوو .. کەهەرهەمووی پەیوەندیی بە ماموستا عەزیزەوە بوو .

* ئەو سەردەمانەی لەبەغدا کاری سیاسیتان دەکرد ، چۆن کارتان دەکرد و پلەی حیزبیی ماموستا عەزیز چی بوو و رۆڵی لەکارکردندا چۆن بوو ؟

– وەکو وتم : وەکو دوو لاوی خوێنگەرم و کامڵ و هاوفیکر و بۆچوون لەکۆمەڵەدا کارمان دەکرد ، لەڕاستیدا نەك ئەوەی هەر کارمانەکرد ، بەڵکو خۆمان هەڵگری ئەو بیروبۆچوون و فیکرە بووین ، کەسانی خاوەن فیکری دامەزراندنی کۆمەڵەبووین .. عەزیز یەکەم شانەی رێکخستنی کۆمەڵە بوو ، ئەگەر لەشانەیەکیشدا پێکەوە نەبووبین و هەریەکە لەهێڵێکیشدا کارمان بکردایە ، بەڵام هەر ئاگامان لەیەك دەبوو ، رۆژانە بەیەکەوە دەبووین و هەردوولا ئەمانزانی کەلەو رێکخستنەدا کاردەکەین و متمانەی تەواومان بەیەك هەبوو .. ماموستا عەزیز یەکێکبوو لەو کادرانەی خۆی بەدامەزرێنەری فیکری کۆمەڵە دەزانی ، لەڕاستیشدا وابوو ، ماموستا عەزیز وەکو کادرێکی لێهاتووی مەرد و چاونەترس بەوپەڕی دڵسۆزی و پەرۆشییەوە ، کاری بۆ گەشەکردن و پتەوکردنی کۆمەڵە دەکرد ، رۆژانە لەهەموو کۆڕو دانیشتن و کۆبوونەوەکاندا موناقەشەی دەکرد و ئەفکاری نوێی دەردەبڕی .

ئێمە نابێت ئەوەمان بیربچێت کەبەیانی یانزەی ئازار هەلێکی باشی بۆ گەلەکەمان رەخساند لەهەموو رووێەکەوە ، ئەو پێشکەوتن و گەشەکردن و

بەرەوپێشچوونەی کۆمەڵە پەیوەندی بەو بارودۆخە لەبارەوەبوو ، من و مامۆستا عەزیز و کۆمەڵێ هاوڕێی ترمان ، کەلەبەغدا دوو سەرە کاری سیاسی و رێکخراوەییمان دەکرد ، لەلایەك لەکۆمەڵەدا و بۆ کۆمەڵە زۆر بەجیددی کارماندەکرد ، لەلایەکی ترەوە بەهۆی یەککەوتنەوەی پارتی لەریزەکانی پارتی و یەکێتی قوتابیاندا کارماندەکرد .. لەناو یەکێتی قوتابییانی کوردستاندا هەردووکمان لەگەڵ چەند برادەری ترمان رۆڵی بەرچاومان دەبینی ..

لەساڵی (١٩٧٢) کەبڕیاری کردنەوەی ئۆردوگای قوتابییان لەناوچەکانی کەرکوك و خانەقین درا ، بەمەبەستی هۆشیاکردنەوەو تێگەیاندنی خەڵکانی ئەو ناوچانە لەمەسەلەی گەلەکەمان ، داڕێژەری فیکرەکە لەراستیدا ئێمە بووین ، دیارە ئەوەشمان بۆیە هەڵبژارد بەو نیازەی لەم رێگایەوە زیاتر بچینە ناو جوتیارانی کوردستانەوە هەم لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر قوتابیاندا شەوانەو رۆژانە تێکڵاو ببین و بەو تێکڵاوبوونەمان بیروباوەڕی کۆمەڵە لەناویاندا بڵاوبکەینەوە .. هەرچەندە لەکردنەوەی ئۆردوگاکاندا ، لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا بەیەکەوە نەبووین ، بەڵام مامۆستا عەزیز رۆڵی زۆر کاریگەری گێڕا .. جارجار دەمبینی باسی دەکرد ، کە چۆن لەگەڵ جوتیارەکاندا ، کاری دروێنەو گێرەو بژار و ئاودان دەکەن و شەوانەش چۆن بۆ قوتابییەکان کۆڕ دەبەستن و قسەیان بۆ دەکەن .. باسی ئەوەشی دەکرد کەچۆن رۆژانە بۆ جوتیارەکان قسە دەکات ..

مامۆستا عەزیز لەکۆتایی ساڵی (١٩٧٢)دا ، بوو بەسەرباز ، بەسەربازیی هاتەوە بەغدا .. ئەو ساڵەش کەسەربازبوو ، هەر لەیەکەوە نزیکبووین ، کەخزمەتی سەربازیشی لەساڵی (١٩٧٣) دا تەواوکرد ، بەمامۆستا لەقەزای

عەزیزییە دامەزرا ، ئەوکاتەش شەوانە لەبەغدا دەمایەوەو بەڕۆژ دەچووو بۆ عەزیزییەو دەگەڕایەوە ، زوربەی کات یەکمان ئەبینی ، تا سەرەتای ساڵی (١٩٧٤) بەهۆی پەشیمانبوونەوەی حکومەت لەرێکەوتننامەی ئازار ، من چوومە دەرەوە ، مامۆستا عەزیز لەعەزیزییە مایەوە .

* مامۆستا عەزیز ساڵی (١٩٧٤) پەیوەندیی بەشۆڕشەوە کرد و هاتە دەرەوە لەوساڵەدا و لەکوردستان یەکترتان بینی ؟

- لەراستیدا بیرم نەماوە کەچۆن و لەکوێ یەکترمان بینیوە بەڵام کەبیستم هاتۆتە دەرەوە ، چەند جار یەکمان بینی بەڵام هەر بینین بوو ، نەك بەیەکەوە ژیاین و کارمانکردبێت .

* دوای کارەساتی نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ کە گەڕانەوە سلێمانی .. یەکترتان دەبینی ؟ بەرنامەتان لەو ساتەدا چی بوو ؟ ..

- بەڵێ هەربەگەڕانەوەمان رایەڵەی پەیوەندیکردنمان بە گەرم و گوڕیی دەستی پێکرد .. من و مامۆستا عەزیزو ئەو برادەرانەی هەڵگری فیکری کۆمەڵە بووین . هەربەزوویی خۆمان رێکخستەوە و بریارماندا کە بە هەمووشێوەیەك کار بۆئەوە بکەین کە شۆرش هەڵبگیرسێنینەوە سەرکردایەتییەکی نوێ دابمەزرێنین .. مامۆستا عەزیز یەکێك بوو لەو کادرە هەڵکەوتوو و مەردانەی ، کەلەو بارودۆخە ناهەموارو سەختەدا بەو پەڕی دڵسۆزییەوە کاری دەکردو بەهەر چوارلادا هەڵپەی دەکرد ... دەتوانم بڵێم مامۆستا عەزیز یەکێکبوو لەو کەسانەی کەدەوری هەبوو لە هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش و دامەزراندنی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستاندا. ئەو ساڵە هەرچەند مامۆستا عەزیز گەڕابۆوە بۆ ( عەزیزییە ) دەوامی لەوێبوو بەڵام بەزۆریی لە بەغدا دەژیا . بێ باکانە لە نێوان شاری

بەغــــداو ســــلێمانیدا هاتوچــــۆی دەکــــردو هــــەوڵی دڵســــۆزانەی بــــۆ هەڵگیرساندنەوەی شۆڕش دەدا .

* باسی ئەوە دەکرێت کە مامۆستا عەزیز لە ساڵی ١٩٧٦دا سەردانی دەرەوەی کردووە .. وەکو بزانیت سەردانەکەی بۆ کوێ‌و بۆ چی بووە ؟

– بەڵێ ئەوە راستە مامۆستا عەزیز چووە دەرەوە . لە ساڵی ١٩٧٦ دا کــە کۆمیتــەی هەرێمــەکان دروســتبوو . لــە پــەلاماری رژێمــدا بــۆ ســەر رێکخستنەکانی کۆمەڵە .. چەند هاورێیەکمان گیران و هەندێکمان چوونە دەرەوە ، هەندێکیشمان بە نهێنی لەناو شاردا ماینەوە و کاری رێکخستنمان دەکــرد . لەراســتیدا ســەردەمەکە ســەردەمێکی زۆر ســەخت‌و دژوار بــوو . کۆمەڵە لە ژێر گوشارێکی زۆر توندا بوو ... بەهۆی گرتنی ئەو هاورێیانەوە رێکخســتنەکان تووشــی لــێکترازان‌و پــەرتوبڵاویی بــوو بــوون ، زۆری ئــەو کەســانەی لــەناو ریزەکــانی رێکخســتنی کۆمەڵــەدا بــوون ولزیــان دەهێنــاو دەکشــانەوە .. ژمــارەی ئــەو کەســانەی لەکۆمەڵــەدا کاریانــدەکرد کەمبووبوونــەوە ، خــەڵکی کوردســتانیش بەگشــتی تووشــی نائومێــدی بووبــوون ، بــاڵی رەشــی بێهیــوایی بەســەر خەڵکەکــەدا کشابوو ، تــاك و تەرانــەبێ کــەس ئامادەنــەبوو کــار بــۆ شــۆڕش و هەڵگیرســانەوەی بکــات .. لەوبارودۆخە ناهەموارەدا مامۆستا عەزیز بەویــەڕی جەسووریەوە ئامادەی کارکردن بــوو ، بەهــەموو شــێوەیەك کــاری بــۆ کۆمەڵــە دەکــرد ، کاتــێ داوای لێکرا بۆ بینینی برادەران و بەڕێز(مام جەلال) بچێت بۆ سوریا .. بــێ ئەوەی رابوەســتێت یەکســەر قبوڵیکرد و بریــاری ســەفەری سوریایدا ، کە ئەوکاتــە سەفەر و چوونەدەرەوە ، زۆر مەترسیی هەبوو ، بەتایبەتی بۆ وڵاتێکی وەکو سوریا ، کەرژێم باش دەیزانی (مام جەلال) لەسوریایەو بەنیازی شۆڕشــە ..

عەزیزییە دامەزرا ، ئەوکاتەش شەوانە لەبەغدا دەمایەوەو بەرۆژ دەچوو بۆ عەزیزییەو دەگەڕایەوە ، زوربەی کات یەکمان ئەبینی ، تا سەرەتای سالّی (١٩٧٤) بەهۆی پەشیمانبوونەوەی حکومەت لەرێکەوتننامەی ئازار ، مـن چوومە دەرەوە ، مامۆستا عەزیز لەعەزیزییە مایەوە .

* مامۆستا عەزیز سالّی (١٩٧٤) پەیوەندیی بەشۆڕشەوە کرد و هاتە دەرەوە لەوسالّەدا و لەکوردستان یەکترتان بینی ؟

– لەراستیدا بیرم نەماوە کەچۆن و لەکوێ یەکترمان بینیوە بەلاّم کەبیستم هاتۆتە دەرەوە ، چەند جار یەکمان بینی بەلاّم هەر بینین بوو ، نەك بەیەکەوە ژیابین و کارمانکردبێت .

* دوای کارەساتی نسکۆی سالّی ١٩٧٥ کە گەڕانەوە سلێمانی .. یەکترتان دەبینی ؟ بەرنامەتان لەو ساتەدا چی بوو ؟ ..

– بەلێ هەربەگەڕانەوەمان رایەلّەی پەیوەندیکردنمان بە گەرمو گوڕیی دەستی پێکرد .. منو مامۆستا عەزیزو ئەو برادەرانەی هەلّگری فیکری کۆمەلّە بووین . هەربەزوویی خۆمان رێکخستەوە و بریارماندا کە بە هەمووشێوەیەك کار بۆئەوە بکەین کە شۆڕش هەلّبگیرسێنینەوە سەرکردایەتییەکی نوێ دابمەزرێنین .. مامۆستا عەزیز یەکێك بوو لەو کادرە هەلّکەوتوو و مەردانەی ، کەلەو بارودۆخە ناهەموارو سەختەدا بەو پەڕی دلّسۆزییەوە کاری دەکردو بەهەر چوارلادا هەلّپەی دەکرد ... دەتوانم بلّێم مامۆستا عەزیز یەکێکبوو لەو کەسانەی کەدەوری هەبوو لە هەلّگیرساندنەوەی شۆڕشو دامەزراندنی یەکێتیی نیشتیمانیی کوردستاندا. ئەو سالّە هەرچەند مامۆستا عەزیز گەڕابۆوە بۆ ( عەزیزییە ) دەوامی لەوێبوو بەلاّم بەزۆریی لە بەغدا دەژیا . بێ باکانە لە نێوان شاری

بەغـــداو ســـلێمانیدا هاتوچـــۆی دەكـــردو هـــەوڵی دڵســـۆزانەی بـــۆ هەڵگیرساندنەوەی شۆرش دەدا .

* باسی ئەوە دەكرێت كە مامۆستا عەزیز لە ساڵی ١٩٧٦دا سەردانی دەرەوەی كردووە .. وەكو بزانیت سەردانەكەی بۆ كوێ‌و بۆ چی بووە ؟

– بەڵێ ئەوە راستە مامۆستا عەزیز چووە دەرەوە . لە ساڵی ١٩٧٦ دا كـە كۆمیتــەی هەرێمــەكان دروســتبوو . لــە پــەلاماری رژێمــدا بــۆ ســەر رێكخستنەكانی كۆمەڵە .. چەند هاورێیـەكمان گیران و هەندێكمان چوونە دەرەوە ، هەندێكیشمان بە نهێنی لەناو شاردا ماینەوە و كاری رێكخستنمان دەكـرد . لەراســتیدا ســەردەمەكە ســەردەمێكی زۆر ســەخت‌و دژوار بـوو . كۆمەڵە لە ژێر گوشارێكی زۆر توندا بوو ... بەهۆی گرتنی ئەو هاورێیانـەوە رێكخســتنەكان تووشــی لـێكترازان‌و پـەرتوبلاویی بـوو بـوون ، زۆری ئـەو كەسانەی لـەناو ریزەكـانی رێكخســتنی كۆمەڵــەدا بـوون ولزیـان دەهێنـاو دەكشـــانەوە .. ژمـــارەی ئـــەو كەســـانەی لەكۆمەڵـــەدا كاریانـــدەكرد كەمبووبوونـــەوە ، خـــەڵكی كوردســـتانیش بەگشـــتی تووشـــی نائومێـــدی بووبـوون ، بـاڵی رەشـی بێهیـوایی بەســەر خەڵكەكـەدا كشـابوو ، تـاك و تەرانـەبێ كـەس ئامادەنـەبوو كـار بـۆ شـۆرش و هەڵگیرسـانەوەی بكـات .. لەوباروبۆخە ناهەموارەدا مامۆستا عەزیز بەوپـەری جەسوورییەوە ئامادەی كـاركردن بـوو ، بەهـەموو شێوەیەك كـاری بـۆ كۆمەڵـە دەكـرد ، كاتێ داوای لێكرا بۆ بینینی برادەران و بەرێز(مام جەلال) بچێت بۆ سوریا .. بێ ئـەوەی رابوەستێت یەكسـەر قبوڵیكرد و بریـاری سەفەری سوریایدا ، كـە ئەوكاتـە سەفەر و چوونەدەرەوە ، زۆر مەترسیی هەبوو ، بەتایبەتی بۆ وڵاتێكی وەكو سوریا ، كەرژێم باش دەیزانی (مام جەلال) لەسوریایەو بەنیازی شۆرشـە ..

لەگەڵ ئەمانەشدا مامۆستا عەزیزماڵەکەی تەرخانکردبوو بۆ راپەڕاندن و سەرپەرشتیکردنی کارو ئەرکەکانی شۆڕش و کۆمەڵەو وەکو بنکەیەك وابوو بۆ ئەنجامدانی کارەکان .. بەبەردەوامیی ماڵەکەیان پڕبوو لەهاوڕێیان و زۆر لە کۆبوونەوەکان لەماڵەکەی ئەودا جێبەجێ دەکران ، سەردانی سوریای کرد و لەسوریا بەڕێز(مام جەلال) و برادەرانی بینیبوو پاش چەند رۆژ گەڕایەوە راسپاردەو رێنماییەکانی(مام جەلال) و برادەرانی هێنایەوە بۆ برادەرانی سلێمانی .

* مامۆستا عەزیز هاتە دەرەوە و بوو بە پێشمەرگە .. وەکو بزانیت چ ساڵێك هاتە دەرەوە ؟ کەهاتە دەرەوە لەکوێ یەکترتان بینی ؟ پلەی لەناو پێشمەرگەدا چی بوو ؟ چووە چ ناوچەیەك ؟

–ساڵی (١٩٧٧) هاتە دەرەوە ، کەهاتە دەرەوە من لەناوچەی سەرسنووری (تورکیا، ئێران – عیراق) کەپێی دەڵێن (سێ کوچکەکە) بووم . لەوێ یەکترمان بینی ، ئەو کاتەبوو کە بەڕێز(مام جەلال) و برادەران لەسوریاوە گەڕابوونەوە کوردستان و لەو ناوچەیە بوون و ئێمەش چووبووین بۆ لایان .. بەحوکمی ئەوەی زۆر هاوڕێی یەکتری بووین ئەو ماوەیەی کە لەوێ ماینەوە ، بەزۆری هەر بەیەکەوە بووین ، ئەو کاتە هەرهەمووومان هەم پێشمەرگە و هەم مەسئوول بووین ، رۆژگارێکی وابوو نەدەکرا کەس بە حوکمی مەسئولیەت هەڵسوکەوت بکات .. دەبوو هەرهەموومان هەردەم سازو ئامادەبین .. دەستمان لەسەر پەلە پیتکەی تفەنگ بێت .. هەرهەموومان دەبوو حەراسەتمان بگرتایە .. چونکە بارودۆخەکە وابوو ، ئێمە جگە لەوەی کەڕژێم زۆر بەسەختی و دڕندانە دوژمنایەتی دەکردین ، دوژمنی تریشمان لێرەو لەوێ هەبوو .. مامۆستا

عەزیز بەحەراسەت زۆر قارسبوو ، هەر شەوێ حەراسەتی بۆ دانرایە .. بەزۆریش رازی نەدەبوو حەراسەتەکە بگرێ ..بۆ ئەو حەراسەتە چەندین نووکتە لەسەر عەزیز دەگێڕنەوە ، من چەند شتێکم لەسەر ئەو حەراسەتە لایە بەڵام حەز ناکەم بیانگێڕمەوە .

* وەکو باس دەکرێت ، مامۆستا عەزیز کە لەدەرەوە بووە ، چەند جار هاتۆتەوە ناوشار ، وەکو بزانیت بۆ دەهاتەوە بۆ سلێمانی و لەگەڵ کێدا دەهاتەوە دەچووە ماڵی کێ ؟

–من ئاگاداری ئەو هاتوچۆیەی نەبووم ..

* مامۆستا عەزیز کەی گیراو هۆی گرتنەکەی چی بوو ؟ لەماڵی کێدا گیرا ؟

– وەکو بزانم لەساڵی (١٩٧٨) لەماڵێکدا لەناوشاری سلێمانیدا گیرا .. ئەو ماڵەی تیایدا گیرا پیاوەکەیان .. بەئاگاداری کۆمەڵە پەیوەندی بەحکومەتەوە هەبوو . ئیشی زۆر باشی بۆ ئێمە دەکرد ، برایەکی و هەندێ لەخزم و کەسەکانی پێشمەرگە بوون .. کاتێ پیاو بیر لەگرتنەکەی دەکاتەوە، ناتوانێت بڕیاری ئەوە بدات کەهۆی گرتنەکەی ئەو پیاوە بووە ، چەند شتی تر تێکەڵاوی مەسەلەکەبووە کە هێشتا ساغ نەبوونەتەوە ، بەڕاستی گرێیەکە تا ئێستا نەکراوەتەوە ، بەڵام دڵنیام هەموو کارێکی خیانەتکاریی و تاوانباریی ، ئەمڕۆ بێت یان سبەی ئاشکرا دەبێت .

* کاتێ مامۆستا عەزیز حوکمدراو نێردرایە بەندیخانەی موسڵ.. ڕژێم داوای لێکردووە. ئەفسەرێکی خزمی سەرەك کۆمار لای پێشمەرگە گیراوە، ئەگەر ئەو بەربدەن ئەوانیش مامۆستا عەزیز بەرئەدەن. چی لەو مەسەلەیە ئاگاداری؟

- راستە ئەفسەرێك بەدیلگیرابوو. داوا لە مامۆستا عەزیز کرابوو بۆ بەردانی، مامۆستا عەزیز-یش نامەیەکی بۆ بەڕێز(مام جەلال)و برادەران نووسیبوو، بە سەبرییە خانی خێزانیدا ناردبووی.. کە بە گۆڕینەوە ئەو ئەفسەرە بگۆڕنەوە، من بەشبەحالی خۆم ئەو هەوڵەم بە هەوڵێکی بێهودە دەزانی.. دڵنیابووم لەوەی کە رژێم هەرگیز مامۆستا عەزیز بە ئەفسەرێکی عەسکەریی ناگۆڕێتەوە ، من وای بۆ دەچووم ئەو هەوڵەی رژێم زیاتر بۆ ئەوەبوو کە زیاتر بزانن مامۆستا عەزیز لای شۆرش چ بایەخێکی هەیە ، نامەکە دیارە لای بەڕێز (مام جەلال)ە و (مام جەلال)یش نامەیەکی لە وەڵامی ئەو نامەیەدا بۆ مامۆستا عەزیز نووسی بەسەبرییە خاندا بۆی نارد... ئەنجامەکەش هەروابوو مامۆستا عەزیزیان لەسێدارەدا .

* وام پێ باشە لە دوای پرسیارەکان بە کورتی باسێکی شەهید بکەیت .

-بۆ ئەم داوایەت راوەستانێکی دەوێت.. مامۆستا عەزیز بە هەرزەکاریی تێکەڵاوی بزووتنەوەی سیاسیی و کوردایەتی گەلەکەی بوو. بەو هەرزەکارییە ئازایانە، دڵسۆزانە، مەردانە ئامادەبوو هەر کارێکی شۆڕشی پێ بسپێردرێت جێبەجێی بکات.. مامۆستا عەزیز. بەڕاستی پیاوێکی تا بڵێی ئازاو نەبەردو رووخۆش و قسەخۆش و بەوەفاو دڵسۆز بوو، بۆ میللەتەکەی و بۆ یەکەیەکەی هاوڕێکانی، کەسێك بوو بە ئاسانی لەگەڵ هەموو کەسێکدا دەگونجا ، ئێمە ساڵانێکی تەمەنمان لەگەڵ مامۆستا عەزیزو کۆمەڵێ هاوڕێی تر وەکو کوڕی یەك خێزان بەسەربردەبرد. یەکترمان خۆشدەویست و هەرهەموومان لەپێناوی یەك مەسەلەدا خەباتمان دەکرد، ئەویش مەسەلەی گەلەکەمانبوو. ئەو پەیوەندییەی نێوانی مامۆستا عەزیزو ئێمە، پەیوەندییەکی ئەوەندە پتەوو ئەستووربوو، هیچ کێشەو ململانێ و

گوشارێك كاری تێنەدەكردین. متمانەی تەواومان لە هەموو روویەكەوە بەیەك هەبوو... بەلای منەوە ئەو پەیوەندییە ئەوەندە درەوشاوەبوو، ئەوە هەڵەگرێت كە هەمیشە باسبكرێت و بكرێتە نموونە بۆ نەوەكانی داهاتوو ، پایەو نرخی ئەو شێوە تێكۆشانو ئەو جۆرە پەیوەندییە هاوڕێیانەیە ئەو راستگۆیی و متمانەو یەكبوونە بكرێتە دەرسو پەندی لێوەربگیرێت .
كە مامۆستا عەزیز یەكێكبوو لەو كەسە هەڵكەوتووانەی ئەو پەیوەندی و كارانە كە هەرگیز رۆژێ لە رۆژان لە بیر ناچێتەوە.

مامۆستا عەزیز كە لە خەباتی نهێنیدا ئەتبینیو كاری لەگەڵدا دەكردی، ئەوەندە ئازایانەو بێباكانە كاری دەكرد.. تێنو تەوژمێكی بە ئینساندەدا كە بێ سڵكردنەوە، كارو چالاكییەكان ئەنجام بداتو وای لێدەكردیت كە گوێ بە هیچ نەدەیت.. لەسەرووی ئەمانەشەوە مامۆستا عەزیز هەتا حەزكەیت پیاوێكی رووخۆشو قسەخۆشو دڵپاكو گەشبین بوو ، بەئاسانی هەموو كەسێك دەیتوانی ببێتە هاوڕێی.. بڕواناكەم كەسێك هەبووبێ خۆشینەویستبێ یان رقی لێی بووبێ، پیاوێكی ئەوەندە میهرەبانوساغبوو لە هەڵسوكەوتو كاركردندا، یەكسەر سەرنجی هەموو كەسێكی بە ئاسانی بەلای خۆیدا رادەكێشاو وای دەكرد كە یەكسەر خۆشی بوێتو ببێتە هاوڕێی.. من سەدان بیرەوەریو موناسەبەتی خۆشو ناخۆشم لەگەڵیدا هەبووە لەبواری ژیانی شەخسیی رۆژانەو سیاسیدا.. بە جۆرێكە ئێستاش سەرەڕای ئەوەی مامۆستا عەزیز لە ناوماندا نەماوە. كاتێ دادەنیشین قسەخۆشو نوكتەكانی ئەگێڕینەوە لە بۆنە جیاجیاكاندا، وا هەستدەكەین هەروەكو ئەوە وایە لەگەڵماندایەو ماوەو قسەی خۆشمان بۆ دەكات... ئەگەر بە هەق قسەبكەین راستیی مەسەلەكان وەكو خۆی بسەلمێنین دەبێت بڵێین

بەڕاستی مامۆستا عەزیز پیاوێکی شۆڕشگێڕی، کوردپەروەری، دڵسۆزو مەردی ڕۆژە سەختو دژوارەکانی خەباتی نەپساوەی گەلەکەیبوو. مەردانە ژیاو نەبەردانەش شەهید بوو.

# مامۆستا عەزیز
# ژیانێکی پاك‌و شەهیدی دەستێکی ناپاك

مەلا بەختیار

## هەموومان.. قەرزاری (مامۆستا عەزیز)ین

جارێ.. زۆرن ئەو شەهیدە قارەمانانەی شۆڕشی نوێ، کە مافی خۆیان نەدراوەتێ‌و ئەوەی نوێ نایانناسن. مامۆستا (عەزیز مەحمود) یەکێکە لەوانە، بەهەق هەقی بەسەر یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان‌و هاوڕێکانیەوە هەیە. ئەم شەهیدە، هەتا لەژیاندا بوو، نە لەخەباتی نهێنیی‌و، نە لە پێشمەرگەیاتی‌و، نە لەزینداندا نەیهێشت قەرزاری گەلەکەی، کوردستانەکەی، کۆمەڵەی رەنجدەرانەکەی، یەکێتی نیشتمانییە کوردستانییەکەی‌و هاوڕێکانی بێ. بەڵام ئێستا کە لەدونیای نەمریدایە، قەرزی وەفاداریی بەسەر هەموومانەوە هەیە.

**من.. وەکو هاوڕێ هەرەنزیکەکانی لەنزیکەوە هاوڕێی تەمەن‌و پێکەوەخەبات کردن لەلاوێتی‌یەوە لەگەڵیا نیم، بەڵام لەماوەیەکی کەمدا بووین بەدوو هاوڕێی نزیکی یەکتر. شەرەفی هاوڕێیەتیم.. سەرەتاکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای خەباتی (کۆمەڵەی مارکسی – لینینی کوردستان). ئەوکاتە، کۆمەڵە خەباتی لەنهێنیدا بوو، بەڵام لەململانێیەکی بەرچاوی فکری‌و فەلسەفی گشتی‌دا بوو بەئاشکرا. بەزۆریش.. لەناو قوتابیانی ئەوساو لاواندا چالاکیمان دەنواند.**

لەناو یەکێتی قوتابیاندا، دوای بەیانی (١١)ی ئازاری (١٩٧٠) نەریتی ئۆردوگای قوتابیان داهێنرابوو، کە بەڕاستی نەریتێکی جوان و چەپگەرا بوو. ساڵانە لەشوێنێك و دووانــدا، ئۆردوگــای قوتابیــان لەلادێکانــدا دەکرایەوەو قوتابییەکی زۆر خۆبەخش کۆدەکرانەوەو هاوینان، هاریکاریی جوتیارانیان بۆماوەی دوو هەفتەیەك دەکرد. ئیتر.. ڕۆژانە گروپ گروپ قوتابیــان دابەشــدەکرانە ســەر گونــدەکان و هــەتائێوارە یارمــەتیان دەدان لەدروێنەوە بۆ قوڕکاری، جۆگە هەڵبەستن و، گێرە: شەنکردن و.. خەرمان هەڵگرتن. ئیشقێکی زۆر جوان لەو ئۆردوگایانەدا لەناو قوتابیان خوڵقابوو. ئەوکاتەش.. تەنها چەپەکان ناسراوبوون بەخزمەتکردنی جوتیارو کرێکارو زەحمەتکێش، بۆیە ئەم ئۆردوگایانە مۆرکێکی چەپیان وەرگرتبوو.

کۆمەڵــە.. ســاڵانە هاوڕێیــانی خــۆی دەنــاردە نــاو ئۆردوگاکــان، هــەم لەبەرئــەوەی بــاوەڕی بەخزمــەتکردنی جوتیــارانی هــەژار هــەبوو، هــەم لەبەرئەوەی بیروڕای خۆی بڵاوبکاتەوەو باشترین جوتیارو باشترین قوتابیش بخاتەژێر کاریگەری ڕێبازەکەیەوە، سەرەنجام، ڕێکیشیانبخا.

دووساڵ ئەو ئۆردوگایانەی قوتابیان بەر خانەقین کەوت. ساڵێکیان لە (باوەمەحمود) کە منی تیا نەبووم. ساڵی (١٩٧٢)یش لەناوچەی (بنکورە)، تـازە ڕژێـم ئەمری گرتنـی دەرکردبـووم و هـەڵهاتم بـۆ گونـدەکان. کە زانـیم ئۆردوگاکــە هەیــە، بــەبزێوی خــۆم، خــۆمم پیــاکرد. لــەوێ.. شــەوانە کــۆڕ دەبەســترا، هــەم بــۆ تــاوتوێکردنی کاروبارەکانی ڕۆژانــە، هــەم بــۆ مشــتومڕی سیاســی و فکــری و لەکۆتاییشــدا تێکــڕا کۆدەبووینــەوەو دەکرایــە کــۆڕی گۆرانی و گەرەلاوژێ و نوکتە. لەو کۆڕانەدا (مامۆستا عەزیز مەحمود) هەم وەکو چەپێك و هەم وەکو قسەخۆشێك و هەم وەکو سروود گوتن بەدەنگی

بەرزو، هەم وەکو بەزم‌و رەزمی (سلێمانیانە!) سەرنجی راکێشام. دووەم رۆژی ئۆردوگاکە، لەمشتومڕێکدا پاڵپشتم کرد، ئیتر نزیک کەوتینەوەو هەموو رۆژێک.. قسەمان دەکردو بووین بەدۆست.

کۆڕی مشتومڕەکان.. گەرم بوون. چونکە کادری دیاری کۆمەڵە لە سکرتاریەتی خوێندکاران بوون‌و هاتبوون، وەکو (کاک سالار عەزیز) مامۆستا عەزیز خۆی. هەروا، کادرو ئەندام‌و لایەنگری تریش. کادرەکانی کۆمەڵەو ئەندامەکانی لەچاو قوتابیانی تر، وشیارتر بون. ئەو ساڵە، کۆڕە سیاسیەکان بۆیە خۆشترو بەجۆشتربوون، چونکە قوتابیانی فەلەستینی‌و یەمەنی دیموکراتی جاران‌و ئەریتیریش، میوان بوون. زۆربەشیان چەپ‌و چەپی ئەندێشەی ماوتسیتۆنگیش بوون، ئەمەش پشتیوانیەکی باش بوو بۆ هاوڕێیانی کۆمەڵە. بەتایبەتی (بەرەی میللی فەلەستین – جۆرج حەبەش).

مامۆستا عەزیز.. چەند لە مشتومڕەکاندا گەرم‌وگوڕو لەسروودگوتندا دەنگ دلێربوو، هێندەش لەبەزم‌و رەزم‌و گەرەلاوژێدا جێگەی سەرنج بوو. یەکێک بوو لەهەرە خۆشەویستەکان. هەموو شەوێکیش بەدەنگێکی بەرز گۆرانی قۆشمە باوی ئەوکاتە (فەتەڕۆ.. فەتح الله رۆی) چەندجارێک دەچڕی‌و ئۆردوگا بەچەپڵەرێزان لێی‌کۆلەبوونەوە. کە قسەشی دەکردو بیروڕایەکیشی دەردەبڕی، قوتابیان قبوڵیان دەکرد. هەتا لەئۆردوگاکەدا بوین، وەکو بیروباوەڕ لێک ناشکرابووبووین. بەڵام نهێنی رێکخستنمان نەدرکاند. لەدوای ئۆردوگا، ئەوان گەڕانەوە بۆ سلێمانی‌و منیش.. لەبەرئەوەی ئەمری گرتنم دەرچووبوو، رێم گرتەبەر بەرەو دێی (گۆرە شەلە) خانەقین، بیرمە رۆژێکی دڵتەنگ بوو بۆ من. هەژدە ساڵێک بووم.. دینارێکم پێ‌بوو، ناچار، چوومە ماڵە ناسیاوێکم‌و چوارمانگ دالدەیاندام.

## مامۆستا.. نێردراوی سەرکردایەتی کۆمەڵە

مامۆستا عەزیزم نەدیبوو هەتا شۆڕشی ئەیلول (١٩٧٤) دەستی پێکردەوە. هاوڕێیانی کۆمەڵەی خانەقین، کەوتینە دێی (مەحمود قەجەر) ناخۆشییەکەی ئەوەبوو (هەشت – نۆ) مانگێک دابڕاین لەسەرکردایەتی کۆمەڵە. هەمووشمان لەلاواندا کۆبووینەوە. من ئەوکاتە مەسئولی ڕێکخستنی کۆمەڵەبووم لەخانەقین. هاوڕێیان: (مامۆستا جەعفەر، عیماد ئەحمەد، عەلی شامار، شەهید سەلام عەبدولرەزاق)و چەند دۆستێکی کۆمەڵە لەلاواندا بووین. هەر لەناو خۆماندا، خەریکی خوێندنەوەو مشتومڕو چالاکی بووین، بەبێ ئەوەی بزانین سیاسەتی سەرکردایەتی کۆمەڵەش چییە! هاوینەکەی.. زۆرچالاک بووین و کاریگەری باشیشمان لەناو لاواندا هەبوو، ڕۆژێکیان لەپڕ مامۆستا عەزیز خۆی کرد بەبارەگەکەماندا و لەدەرگاوە بەدەنگی بەرز گوتی: کاک حیکمەت لێرەیە؟ تومەزە ناچێتەوە سەرم و بەو دەنگ بەرزکردنەوەیە ویستویەتی وەڵامی بدەمەوەو بمناسێتەوە. من ناسیمەوەو بەرەوپیری چووم، باوەشم پیاکرد. ئەویش وای باوەش پیاکردم کە گوایە باشم دەناسێ. لەکاتی تەوقەدا نامەیەکی بەنهێنی خستەدەسم. دەست بەجێ زانیم هی کۆمەڵەیە، نامەکە زۆر دڵخۆشکەرەبوو. بەبێ ئەوەی بیخوێنمەوە، هەستێکی جوان لام پەیدابوو. کە خوێندمەوە، زانیم کە:

سەرکردایەتی کۆمەڵە ناردبوویان بماندۆزێتەوەو پەیوەندیمان بۆ دروست بکاتەوە. شەوێك لامان بوو، بوو بەئاشنای هەموو هاوڕێیان. بەتەنهاش دانیشتین و دەنگوباسی سەرکردایەتی کۆمەڵەو شەهید شیهابی بۆگێڕامەوە. کاتێکی دیاریکراویشی بۆ دانام کە بچمە پێنجوێن و رەحمەتی (حەمەی میرزا سەعید) ببینم. کاتێك گەیشتمە ئەوێ، رێکەوتننامەی جەزائیر مۆرکرا و دوو رۆژێك سنوور داخرا. قسەوباسمان لەگەڵ (هاوڕێ حەمەی میرزا سەعید) کە ئەندامی سەکردایەتی کۆمەڵە بوو، وابوو کە ئەگەر سەرکردایەتی پارتی سازشی لەگەڵ رژێم کردو ئۆتۆنۆمی راستەقینەی وەرنەگرت، کۆمەڵە مقاوەمەت دەکا. پێش ئەوەش.. کۆمەڵە (لەبەیاننامەیەکی ناوخۆدا پێشبینی سازشێکی سیاسی بەدەستکەوتێکی کەم لەگەڵ رژێمدا کردبوو) لەبەیانەکەدا گیانی مقاوەمەت و درێژەپێدانی خەباتی شۆڕشگێڕانەی چەکداری جۆشدرابوو. کاتێك رێکەوتننامەی جەزائیر مۆرکرا. ئیتر بەبەرنامەی مقاوەمەتەوە گەڕامەوە خانەقین. داخەکەم، نەك سازش، بەڵکو هەرەسیش بەشۆڕشەکە هێنرا، کەچی، مقاوەمەت نەکرا! بەبڕیاری سەرکردایەتی کۆمەڵە، هاوڕێیانی کۆمەڵە گەڕاینەوە کوردستان.

## پەلامارداني كۆمەڵەو بينينەوەی مامۆستا عەزیز

لە (١٩٧٥/٩/٣) شەهید ئەنوەر زۆراب کە لێپرسراوی ئێمە بوو، لەبەغدا گیرا. بەرەبەرە (حەمەی میرزا سەعید)یش گیرا، کە پێشتر لێپرسراومان بوو، هەروا دەیان هاوڕێیتر. ئیتر شیرازەی ڕێکخستن پچڕا. سەرکردایەتی کۆمەڵە خۆی شاردەوە. منیش هەڵهاتم بۆ سلێمانی. تەنها ماڵی کاك سالار-م دەزانی. ئەویش جوامێرانە هاوکاریی کردمو سەرکردایەتی کۆمەڵەی پێناساندم. کاك عومەری سەید عەلیو پاشان کاك فەرەیدون عەبدولقادر-م بینی. تەگبیر، دیسان خۆڕاگریو خۆئامادەکردن بوو بۆ شۆڕش. من ئیتر لەسلێمانیدا مامەوە. چەند مانگێك لەماڵی شەهید جەمالەرەش-یش خۆمشاردەوە. تومەزە شەهید جەمال باسی من لای شەهید مامۆستا عەزیز دەکا، ناوی راستەقینەشم لای‌دەهێنێ. شەهیدیش بیستبوی کە لەسلێمانیدا خۆم شاردۆتەوە، هەرچەندێ هەوڵیدابوو، نەیزانیبوو لەکوێم (ئەوکاتە لەماڵی شەهید بەکری دارتاش بووم) ئێوارەیەکیان.. مامۆستا عەزیز هات بۆلامو لەدورەوە خۆی‌ناسا بەدەنگی بەرز گوتی:

ها کاکە حیکمەت.. چۆنی، ئەوکاتە منیش ناوی نهێنیم بەختیار بوو (نەك مەلابەختیار) هەرچەند چاووم لێ‌داگرت سوودی نەبوو. تازە ناوی‌دەرکاندم. ئیتر لەوڕۆژەوە کە سەرەتای زستانی (١٩٧٦) بوو، شەووڕۆژ یەکمان دەبینی. ئیشەکانیش وایان لێ‌هات، مامۆستا عەزیز کرایە لێپرسراوی هێڵێکی ڕێکخستنی یەکێتیی. منیش سەرپەرشتیم دەکردن.

شەهید جەمالەڕەش و شەهید شێخ عەول و شەهید ئاشتی (ئەبوبەکر) و کاک یونس و کاک مەسعودو شەهید ئاشتی حەمەسەعیدو شوکری خان و ڕووناکی شێخ جەناب و کۆمەڵێك هاوڕێ و هەڤاڵی تر، شەهید مامۆستا عەزیز سەرپەرشتی دەکردن.

ئەم هێڵە.. لەڕووی ڕێکخستنەوە چالاك بوون، لەوەش گرنگتر، کاروباری سەیارەو ماڵ و شوێنی حەوانەوەو کۆبوونەوەو هەڵگرتنی بڵاوکراوە بەزۆریی ئەم هێڵە رایدەپەڕاندن. یەکەمین بەیاننامەی چاپکراویش، هەر لەڕێی کاك مەسعودو یونس-ەوە کە لەم هێڵەدا بوون لەدائیرەی زراعەدا جێبەجێکرا. بەشێکی پارەی قەرزیش بۆ کڕینی چەك و تەقەمەنی، لای ئەمان و جەمالەڕەش، دابین دەکرا. لەهەمووش گرنگتر، پەیوەندیی پێوەکردنی سوریاو دەستەی دامەزرێنەرو (مام جەلال)یش هەر لەڕێی ئەم هێڵەوە بوو (شەهید جەمال، پاشان حاجی عوسمان) یەکەمین جار، جێبەجێیان کرد. مامۆستا عەزیز.. بەڕاستی لەم کارانەو ئەرکانە، بێدریغ کاریدەکرد. هاوڕێکانیشی زۆر متمانەیان پێی هەبوو. خۆیشی ڕێزێکی تایبەتی هەبوو. کە شۆڕشیش بەرپابوو، هەندێك لەئەفسەرو کادرە عەسکەرییەکان لەماڵی مامۆستا عەزیزدا، شەهید ئارام و کاك سالار دەیانبینین و سازیان دەدان بۆ چوونەدەرەوە.

دەوروبەری (٨) مانگ.. لەدژوارترین ڕۆژگاری سەختدا، لەگەڵ مامۆستا عەزیز هەردەم پێکەوە بووین. پێکەوە کارمان دەکرد. ئەرکمان پێدەسپاردن. بەملاوبەولادا دەمان ناردن. بۆدەرەوەی وڵات، بۆ بەغدا، کەرکوك، هەولێر، شارەکانی تر، ڕۆژێ لەڕۆژان لەمامۆستا عەزیزم نەبیست بڵێ:

- ناتوانم ماڵتان بۆ چۆڵ بکەم بۆ کۆبوونەوە.
- یان ناڕۆم بۆ شارەکان.
- یاخود ئەم کارە بەمن ناکرێ.
- یاوەکو نایەم بۆ کۆبوونەوە.
- یا.. پارەم پێ پەیداناکرێ.. تاد.

ڕۆژێـــک.. وەڕســـیی، یـــان کەمتەرخـــەمیی، یـــاوەکو بۆڵەبۆڵێکیشـــم لێ نەبیست و نەدی.

## ماڵێکی بچوک و خانەخوێیەکی گەورە

بەڕاسـتی.. مامۆسـتا عـەزیز.. کـوڕی ڕۆژگـاری تەنگانـەبوو. هەمیشـە ئامادەباش و دەم بەپێکەنین و ورەبەرزبوو. بەقسەی خۆش و گیانی بـەرزی بە دڵسۆزی هەموو کارێکی ڕادەپەڕاند هەموو کێشەیەکیشی چارەسەردەکرد.

زۆرجـار.. لـەماڵیان نانمانـدەخوارد. بەتایبـەتی مـاوەی مانگێـك شـەهید ئارام لەماڵیاندا بوو. هەربەزۆر دەیبردم بۆماڵەوە. ماڵەکەشیان لە (گـاوران) بوو، ماڵێکی بچووک.. بەڵام خانەخوێیەکی گەورەو ئاوەدان.

مامۆستا عەزیز، لەکوڕدا، تاقانەبوو. دایکی زۆر لێی دەترسا. هەرکەسێك بچوایە بـۆ ماڵیـان، وای دەزانـی بـۆ سیاسـەت دەڕوا. خواخوای بوو مامۆسـتا عەزیز توخنی سیاسەت نەکەوێ. کە شەهید ئارام لەوێ دەبێ.. مامۆستا عەزیز پێی دەڵێ:

ئەمـە ئەنـدازیارەو شـوێنی نییـە، یـەك دوو هەفتـە میوانمـان دەبـێ. کـە میوانەکە زۆر دەمێنێتـەوە . دایکـی شـەهید عـەزیز (پـورە خورشـە) گومـانی

لێ پەیدادەکا.. رۆژێکیان لەحەوشە بچووکەکەیاندا، خۆی و شەهید ئارام پێکەوە دادەنیشن. چەند پرسیارێك لەشەهید ئارام دەکا بۆئەوەی راستی مەسەلەکە بزانێ. تومەزە بەگومان ئەزانێ کێیەو یادگاری کۆنی لەبیرماوە. ئاخری ئەیدا لەبنی هەمانەکەو دەڵێ:

- ئەرێ.. تۆ کوڕەکەی ئاتەخان نیت ؟..

پێکابووی، بەلام شەهید ئارام خۆی نەبان کردبوو، گوتبووی:

- نەء.. من دایکم ناوی غوربەتە..

شەهید ئارام.. زۆرحازربەدەم بوو. یەکسەر قسەیبۆدەهات. بۆیە، ناوێکی کۆنی بۆ دایکی هەڵبژاردبوو کە ناوی ژنە قەیمەکانە. هەتا خورشەخان باوەڕبکا. کە گوتبووی دایکم ناوی (غوربەت)ە ئیتر پورە (خورشە) لەسەری نەڕۆیشتبوو. دوای چەند رۆژێك شەهید ئارام ماڵەکەی جێهێشتبوو، چونکە زانیبووی هەمووجارێ لە لێکۆڵینەوەی خورشە خان.. دەرناچێ!

## هەڵهاتنی مامۆستا عەزیز

کاتێك کۆمەڵە.. شالاوێکی بەرفراوانی دوای لێدانی پارێزگاری سلێمانی، کرایەسەر، من ئیتر (١٩٧٦/١٢/١٤) بەرەو قەراغ و گەرمیان و پاشان بەرەو شارباژێڕو دۆڵی جافایەتی رۆیشتم. ئیتر مامۆستا عەزیز بەهەواڵ و بەنامە بەسەرکردنەوە، دەمزانی چی دەکاو چی ناکا. دوای من بەچەند مانگێك، ئەویش و جەمالە رەش-یش و دلێری سەید مەجیدو چەندین هاوڕێی تر، شاریان جێهێشت. نەمبینییەوە هەتا لە (نۆکان) پێش

هەڵمەتی هەکاری، یەکەمین کۆبوونەوەی فراوانی کادرانی کۆمەڵەمان، دوای شەهیدبوونی کاکە ئارام لە(١٩٧٨/١/٣١)دا ئەنجامدا .

مامۆستا عەزیز.. بۆ شەهید ئارام، جەرگی بڕابوو، ئەتگوت ئەو مامۆستا عەزیزە نییە. شەوان لەدەرەوەی کۆبوونەوەکەدا، قسەوباسی زۆری لەگەڵ کردم. بیروڕای خۆی لەسەر کۆمەڵەو سەرکردایەتی کۆمەڵەو مەترسیەکانی لەرووداوەکان‌و ئایندەی کۆمەڵە، بۆدەربڕیم. شەهید، کەمتر تاقەتی خوێندن‌و نووسین‌و مشت‌ومڕی تیۆری‌و فەلسەفیی هەبوو لەهەموو ژیانیشیا، دوو سێ وتاری کورتی نوسیبوو. یەکێك لەو کورتە گوتارانە لە (هاوکاری) لەسەر (روانگە) شانازی پێوەدەکرد. بەڵام پیاوێکی ئەزموندیدەو قاڵبووی کۆڕی خەبات‌و سیاسەت بوو. زوو هەستی بەکێشەکان دەکردو باشیش دەیزانی لەسەر رووداوەکان قسەبکا. بۆیە، بەشێکی بەرچاو لەقسەو بۆچوون‌و پێشبینیەکانی لەسەر رووداوەکان‌و ئایندەی کۆمەڵە، راست دەرچوون.

## هەڵبژاردنی مامۆستا عەزیز بۆ سەرکردایەتی یەکێتیی

ئەوکاتە.. ئاڵوگۆڕێك لەسەرکردایەتی یەکێتی‌دا کرا. کۆمەڵە، مامۆستا عەزیزو کاك ئازاد هەورامی بۆ سەرکردایەتی هەڵبژارد. ئەوەندە دڵی بەو ئەرکە خۆشبوو، هەربەتگوت تازەلەدایك بووە. دوای دەرچوونی بڕیارەکە، یەکەیەکە سەردانی سەرکردایەتی کردو گفتی‌دا هەموو توانای بخاتەکار بۆ خزمەتکردنی یەکێتیی‌و شۆڕش، وا بەجوانی، هێمن هێمن دەدوا.. مامۆستا عەزیز بووبووە هاوڕێیەکی ترو جدیەتێکی زۆری تیابەدی‌کرا، ئیتر لەم شوێن بۆ ئەو شوێن، لەبن دارێك بۆ پاڵ بەردێك، لەگەڵ هەڤاڵاندا قسەی دەکردو

نەیویست هەرچی کردووەو هەرچیەك دەکا، بۆ هەڤاڵو هاوڕێیانی بسەلمێنێ کە بەدڵو بەگیان، زیاترو باشتر لەجاران، درێژە بەخەباتو خزمەت دەدا .

هەر لەوکاتەدا، نەورۆزی (١٩٧٨) پێش بەڕێکردنی کاروانی هەکاری، یەکەمین کۆبونەوەی فراوانی کۆمەڵە بەسترا. مامۆستا عەزیزو کاك ئازاد هەورامیو زیاتر لە (٣٠) هاوڕێی کۆمەڵە بەشدارییان تیاکرد. ئەو کۆبوونەوەیە، دوای شەهیدبوونی کاك ئارام بوو ، لەنامەیەکدا من پێشنیازم بۆ (مام جەلال) کرد، هەتا سەرکردایەتیەکی تازە بۆ کۆمەڵە هەڵبژێرین (مام جەلال دەڵێ نامەکەم هەتا ئێستا هەڵگرتووە) ئەوکاتە، کاك ئارام شەهید بوو، کاك سالار لەدەرەوەی وڵات بوو، منو شەهید ئازاد هەورامی لەکۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵەدا مابووینەوە. لەڕاستیا، سەرکردایەتی کۆمەڵە بەکەسمان نەدەکراو کەسیشمان نەماندەتوانی جێگەی شەهید ئارام بگرینەوە. بۆیە، لەکاتی چوونم بۆ قەراغ بۆ لێکۆڵینەوە لەچۆنیەتی شەهیدکردنی کاك ئارامو نەفەوتانی بەڵگەنامەکانی، ئەو نامەیەم بۆ (مام جەلال) ناردو پێشنیازی کۆبوونەوەکەم بۆکرد. کۆبوونەوەکە بۆ رێکخستنەوەی کۆمەڵەو دارشتنەوەی سیاسەتو راپەراندنی ئەرکەکانی گرنگ بوو. چەندین هاوڕێ خۆیان بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە هەڵبژارد کە هەندێکیان نەیانتوانی کاریگەریەکی ئەوتۆیان لەسەر کۆمەڵە هەبێ، مامۆستا عەزیز. تەکلیفیشی لێکرا خۆی هەڵنەبژارد. گوتی: ئەرکی سەرکردایەتی کۆمەڵە قورسە.

## سەرو پێکەی مامۆستا عەزیز!

ڕۆژێکیان دوو حەیوان سەربڕابوو بۆ کۆبوونەوەکە. مامۆستا عەزیزو چەند هاوڕێیەکی سلێمانی هەردوو سەروپێکەیان پاك کردەوەو لەناو کۆبوونەوەکەدا گوتیان، بەیانی لەنان و چا ڕزگارتان دەکەین و هەموومان سەروپێ دەخۆین. بەڵام بەیانیەکەی زوو، مامۆستا عەزیزو شەهید عەلی ئامەخان و چەند هاوڕێیەکی سلێمانی هەڵسابوون و هەموویان خواردبوو. ئەوەی مابوەوە، کەس پێی ڕازی نەبوو. بۆڵەبۆڵ و (گارەگار)ێك دەستی پێکرد. مامۆستا عەزیزیش.. بەپێکەنین و تەعلیق وەڵامی هەمووی دایەوە.

## مامۆستا عەزیزو دوو عیشق

دوای ئــــەوەی کۆبوونــــەوەی فراوانـــی کۆمەڵــــە کـــراو کۆبوونـــــەوەی سەرکردایەتی یەکێتیی تەواوبوو، کاروانی هەکاری، بەفەرماندەو چەك و بێ چەکەوە، لەبەهارێکی ساردوسڕدا، کەوتنەڕێ بەرەو ناوچەکانی (دۆڵی گوستێ)و (هەکاری)و (برادۆست).. ڕۆیشتنێکی پڕ لەهیوا، بەڵام نەدەزانرا ڕێگای هاتونەهات بوو. ساڵەکەش -- سەبارەت بە شۆڕش، ساڵێکی شووم بـــوو. کـــاروان لــــە (١٤-١٨/٤/١٩٧٨)وە بەرێکـــەوت.. منـــیش، لەگـــەڵ مەفرەزەیـەکی بچووکی هەشت کەسی، کـاك شـێروان شـێرەوەندی-یـش لەگـەڵمان بـوو دەچـوو بـۆ ناوچـەی شـلێر، بەرێکـەوتین بـۆ شـارەزوور و هـەورامان. مامۆسـتا عـەزیز-یـش ئـیتر خۆی ئامـادەدەکرد بەرێبکـەوێ بـۆ

قەراغ. هەر بەرپرس و هێزێك.. ئەركیان بەسەردا دابەشكراو هیوایەكی گەورە هەبوو چەك بگەیەنین و بتوانین پەرە بەشۆڕش و جوتیارانیش بۆ بەرگری جۆش بدەین.

ئەو ئەوڕۆژە.. دڵەڕاوكێی ڕاگواستنی گوندەكان هەمووانی داگرتبوو. نەمانی گوندو جوتیار، بەنیسبەت پێشمەرگەو شۆڕشەوە، لەمێژوودا تاقی‌نەكرابۆوە. لەڕاستیا، هیچ شۆڕشێكی درێژخایەن لەمێژووی كورددا بەرپانەكرابوو. شۆڕشی ئەیلول (١٤) ساڵی خایاندو لەوساڵانەدا، گوند كاول دەكرا، بەڵام ناوچەیەكی فراوان ڕانەدەگوێزران. بۆیە، سەرەتا پێشمەرگە گەرم‌وگوڕ بەرێكەوتن بۆ هەكاری، بەڵكو چەك‌و تفاقی بەرگری فریای جوتیاران بخەن. باقی مەسئولەكانیش هەریەكە بۆ شوێنێك‌و مەسئولیەتیەك، هەم بۆ ڕاپەڕاندنی ئەركەكان‌و، هەم بۆ دەست لەدوژمن وەشاندن‌و، هەم بۆ ئامادەكردنی خەڵك، دابەش بووین.

دەبوو.. مامۆستا عەزیز، بەپێی ئەو گفتەی پێی‌دابووین، بچێ بۆ لقی كەركوك‌و ئیتر لەوێ بێ، هاتوچۆی شار نەكا. خۆی‌و هەڤاڵانیش بپارێزێ هەتا سەرەنجامی كاروانی هەكاری دەردەكەوێ.

لەوماوەیەدا.. مامۆستا عەزیز داخەكەم ئەو بەڵێنەی نەهێنایەدی‌و چەندجارێك خۆی‌كردبوەوە بەسلێمانیدا. عیشقێكی سەیر لەنێوان مامۆستا عەزیزو شاری سلێمانیدا هەبوو. نەیدەتوانی بۆساتەكاتێكیش ناوی شار فەرامۆش بكا. خۆشەویستیەكی لەڕادەبەدەریش لەنێوان مامۆستا عەزیزو سەبری‌خانی هاوسەریدا هەبوو. دووركەوتنەوە، لەدوو عیشقە، عیشقی شارو عیشقی هاوسەر، بۆ شەهید سەخت بوو، نەیدەتوانی بەرگەی بگرێ. چاكم لەبیرە.. كە خواحافیزیم لێكرد، دەستەو دامێنی بوومو پێم گوت:

- مامۆستا عەزیز.. خۆت بگرەو با تووش نەبی. دوژمن گێل نییە. گفتیدا، ئیتر سەری شار نەدا.

هەرکە لە (نۆکان)یش بووین، کاتێك لەگەڵ (مام جەلال) باسی ئەوەمان کرد مامۆستا عەزیز ببێتە ئەندامی سەرکردایەتی گوتی: رازیم، بەومەرجەی نەچێتەشار. کە (مام)یش بینی، خۆیشی پێیگوتەوە. دیسان گفتیدا. هەمووجارێکیش کە (مام) مامۆستای دەبینی، پێیدەگوت تۆ:

- مارکسی لینینیت، یان مریشك لێدەری؟

(مام).. مەبەستی ئەوەبوو کە مامۆستا حەزی لەخواردن و لەشارو لەدلوەت بوو. بۆیە (مریشك لێدەر)یشی پێدەگوت. چونکە مریشك بە (م)م و لێدەریش بە (ل)م دەستی پێدەکرد. مارکسیزم – لینینیزمیش هەر بە (م.ل) کورتدەکرایەوە. بیریشمە، (مام) مامۆستای ئەوەندەخۆشدەویست، هەڕەشەی لێکردو پێیگوت: بچیتەوە شارو بگیرێی و شەهید بکرێی، هیچت لەسەرنانووسم. چونکە مەگەر بڵێم لەسەر (مریشك لێدان) گیراوە.

مەخابن.. هیچی ئەو فشارو هەڕەشەو ترساندنانە، دەستی بەمامۆستا هەڵنەگرت کە ماوەیەك نەچێتەوە شار. ئیتر لەدواسەردانیدا، بۆئەوەی دوژمن گومانی لێنەکا، دەچێتە ماڵی هاوڕێیەکی دڵسۆزی کۆمەڵە، کە بەبڕیاری شەهید ئارام کاروباری تایبەتی ناو دەزگایەکی رژێمی پێسپێرابوو. بەڕاستیش ئەو هاوڕێیە، دڵسۆزانە کاریدەکردو زانیاری سودبەخشی دەنارد، جێگەی متمانەش بوو. پێش دەستپێکردنی شۆڕش، شەهید ئارام و کاك سالارو من و چەندین هەڵسوڕاوی تری کۆمەڵەی دەناسی و دەبینی.

## ناپاکێکی سزانەدراو!

مامۆستا.. بۆ دڵنیابوون ئەو شوێنە بێگومانەی هەڵبژاردبوو، تومەزە، ناپاکێکی خزمی ئەو هاوڕێیە، پێی دەزانێ. زمانی لێدەداو ئەوهاوڕێیەو مامۆستاعەزیز پێکەوەدەگیرێن. هاوڕێکە چەند ساڵێك زیندانی دەکرێ‌و مامۆستا عەزیز-یش لەسێدارەدەدرێ‌و.. کابرای (ناپاك)یش.. ئێستاش بەجامانەی سەری‌و پشتوێنی پشتی‌و جل‌وبەرگی کوردییەوە پێی وایە کەس لەئەو کوردتر نییە. بەداخەوە، شۆڕش‌و شۆڕشگێڕێتی ئەو چیرۆکە دڵتەنگانەشی تیایە. تێکۆشەری پاك شەهیددەکرێ‌و ناپاکیش سزانادرێ!!

مامۆستا.. کە دەشگیرێ.. ئەشکەنجەو تۆقاندن، بچووکترین نهێنی پێ‌نادرکێنن. (فایل)ەکان گیراون‌و گەواهی دەدەن کە مامۆستا عەزیز چەند قارەمان‌و چەندیش بەرامبەر دوژمن بێباك بووە.

## راوەدوونانی جەلادەکان

لەکاتی لەسێدارەدانیشیا.. دەستی بەزنجیر بەستراوە بەپەنجەرەی زیندانەکەیەوە، کاتێك دایك‌و هاوسەرو خوشك‌و کەسوکاری دەچن بۆ دواچاوپێکەوتنی، نموونەی قارەمانی زیندان دەبن‌و لەپشتی پەنجەرەکەوە، هەموو ئەو سرودانەی کۆمەڵە (ڕێی خەبات‌و پێشمەرگەو.. تاد) کە لە نۆردوگاکانی قوتابیاندا، شەوانە بۆ قوتابیانی دەخوێندەوەو تیپەکانی کارکردنی بەو سرودانە دەبردەسەر هەرەوەزی جوتیاران، لەدواساتەکانی

ژیانیشــدا (لــە چــاوپێکەوتنی دایــك‌و هاوســەرو کەســوکارو هاوڕێکانیــا، سرودەکانی بەدەنگی زوڵاڵتر، بۆ عیشقی کوردستان‌و بۆ عیشقی شۆڕش‌و بــۆ عیشــقی رزگــاریی، دەگوتــەوە، پشــتی پەنجــەرەی مــەرگی، کردبــووە بڵندگۆی جوامێری‌و ناسنامەی شۆڕشگێڕی راستەقینە).

ئەوانەی.. شایەتی دواسەردان‌و دواساتی ژیانی مامۆستا عەزیز بوون‌و ئــەو دیمەنــە دەگێڕنــەوە، دەیگێڕنــەوە کــە: مامۆســتا عــەزیز.. بەنــەڕەی مەردانەو بە بیروباوەڕی پۆڵایینی، جــەلادەکانی تۆقانــدبوو، تەنانــەت کــە چوونبوون دەستی لــەزنجیر بکەنــەوە، کــەوتبووە گیــانی جــەلادەکان‌و راوی نابوون.

گریانی سۆزی دایك‌و گریانی عیشقی هاوسەرو گریانی خوشکە جەرگ براوەکــانی‌و گریــانی هــاوڕێ‌و کەســوکاری مامۆســتا عــەزیز.. بەچەشــنێ ناوێتەی نەڕەی شێرانەی شەهید بووە، کەمجار مێژووی زیندانەکانی رژێم.. دیمەنی وایــان بەخۆیانــەوە دیــووە. مەگــەر.. دیمــەنی لەسێدارەدانی مولازم جوامێرو شــەهید ســەلمان‌و، دیمــەنی شــەهیدکردنی جەمالــەڕەش‌و شــەهید مــەلا عــەلی‌و هــاوڕێ شــەهیدەکانی دوای ئــەوان.. دیمــەنی وایــان بەخۆیانــەوە دیبــێ. ئەمــەش بــۆ کۆمەڵــەو یەکێتیی بووبــووە نــەریتێکی بەردەوام چــونکە شــەهید شــیهاب‌و شــەهید جەعفــەر بناغــەی نەریتەکــەیان لەشــەوەزەنگی فاشیەکاندا، داڕشتبوو.

هەر نەڕەی.. ئەو شەهیدانەو.. قرمەژنی چەکی پێشمەرگە قارەمانــەکانی رۆژگــاری ســەختی پــارتیزانی ســەرەتای شــۆڕش‌و دوای ئــەنفال‌و هــاوڕێ‌و هەڵاڵــە بێباکــەکانی رێکخســتن‌و زیندانــەکان بــوو، بەرگــەی کارەســاتەکان‌و

ئەنفال و كيميابارانيان كرت، هەتا رۆژگاريان گەياندە.. ئەم سەركەوتنانەی ئێستا.. و دوژمنيش.. بەسزای تاوانەكانی گەيشت.

- بنوو.. مامۆستا عەزيز.. نووستنی نەمريی بنوو.
- بنوون شەهيدان.. نەمردووە ناوو ناونيشانتان.

# مامۆستا عەزیز کۆمەڵێ خەسڵەتی چاکی بوو

حەمید بلباس

لەپایزی ساڵی ١٩٦٨ دا شەهید عەزیزم لەبەغدا ناسی. ئەو کاتە من تازە لەکۆلیجی قانون و سیاسە وەرگیرابووم ئەویش لەبەشی کوردیی کۆلیجی (ئاداب) بوو.

ئەوکاتە هەردووکمان ئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بووین ، هەروەها هەردووکمان ئەندامی پارتی دیموکراتی کوردستان باڵی مەکتەبی سیاسی بووین .

لەو کاتانەدا کەبەیەکەوە دەبووین، وەك دوو برادەری گەنجی ئەو سەردەمە زۆربەی بەباسکردنی بارودۆخی سیاسی و قسەی خۆش و گەڕان و چوونە سەیران و دانیشتنی شەوانە بەسەرمان دەبرد.

من لەلای خۆمەوە نازانم کەی و لە ڕێگای کێوە شەهید عەزیز تێکەڵاوی خەباتی سیاسی و کوردایەتی بووە ، بەڵام ئەوەی دڵنیام لێی هەر لە منداڵییەوە تێکەڵاوی سیاسەت بووەو پلەی لەکاری حزبی و ڕێکخراوەیدا هەبووە ، پێش هاتنی بۆ بەغدا زۆری لێنازانم ، بەڵام یەکێك بوو لەئەندامە هەرە چالاکەکانی حزب و یەکێتی قوتابیانی کوردستان ، پێش لەوەی بێت بۆ زانکۆ، شەهید عەزیز لەبەغدا، لەکۆنفرانسی یەکێتی قوتابیانی کوردستاندا ، کە لەدوای ڕێکەوتنی ئازار بەنهێنی لەبەغدا گیرا ، شەهید

عەزیز بە ئەندامی (یەنەگ)ی لیژنەی بەڕێوەبەرایەتی (سەرکردایەتی) یەکێتی قوتابیان هەڵبژێردرا.

لەبارەی پێشمەرگایەتی شەهید عەزیز-یشەوە ئەوەی من بیزانم و ئاگادارییم دووجار چووەتە ریزی پێشمەرگەوە جاری یەکەم لەساڵی ١٩٧٤ تا تێکچوونی شۆڕش لە ١٩٧٥ دا و ، لە شۆڕشی نوێشدا هەر لەزووەوە بوو بەپێشمەرگە ڕۆژو ساڵەکەم لەبیر نەماوە. نازانم پێشی ١٩٧٤ هیچ جاری دیکە چۆتە ریزی پێشمەرگەوە یان نا؟ بەڵام لەزۆر کەسم بیستووە کە سەردەمێك لە شەستەکاندا پێشمەرگەی ناوشار بووە.

لەساڵی ١٩٧٨ لەسلێمانی گیرا و ، نازانم پلەی چی بوو لەکاتی گرتنیدا ، دوای گرتنی بەماوەیەك لەموسڵ لەسیدارە درا ، پێم وایە لەساڵی ١٩٧٩ دا بوو ، پرسەکەی لەماڵی زاوایەکی بوو ، نایەتە خەیاڵم نووسینی شەهید عەزیزم لەهیچ بڵاوکراوەیەکدا خوێندبێتەوەو ، خۆشم هیچ نووسینێکی ئەوم لەلا نییە ئەگەر نووسینێکی هەبووبێ دیارە هەر لەبارەی ئەدەبی کوردیەوە بووە، بەڵام جارێك لەکۆلیجەکەی خۆیان لەکۆڕێکدا کەزۆربەی قوتابیانی بەشی کوردیی بەکوڕوکچەوە ئامادەبوون ، باسێکی لەسەر شیعرە هەجوەکانی (شێخ رەزای تاڵەبانی) پێشکەش کردبوو ، دەقەکانی وەك خۆی و بەبێ پەردە خوێندبۆوە و ، باسی لەسەر کردبوون بەبێ ئەوەی گوێ بداتە هەبوونی کچ لە هۆڵەکەدا وەك چەند جار گوێم لێ بووە باسیان دەکرد ، یەکەمجار بووە لەکۆڕێکی گشتیدا کەنێرو مێ بەشداربن ئەو دەقانە بخوێنرێنەوەو باسیان لە سەر بکرێ .

شەهید عەزیز کەسێکی قسەخۆش و دەم بەپێکەنین بوو، کەمجار بەڕووی گرژەوە بینیومە ، لەهەر بینین و لەهەر کۆڕو مەجلیسێکدا کەمن بەشداریم تێداکردبێ چەندان قسەی خۆش و نوکتەی تێدا باسکردووە .

هەروەك لەپێشەوە گوتم نامەوێ درێژە بە باسکردن لەبارەی شەهید عەزیزەوە بدەم ، چونکە کەسانی لەمن شارەزاترو ئاگادارتر لەژیانی ئەو هەن ، ناشمەوێ وەك لەناو کۆمەڵگەی ڕۆژهەڵاتدا باوە وابکەم کە دوای کۆچ کردن هەرچی خەسڵەتی چاك هەیە دەیدەنە پاڵ ئەو کەسەو کە لەژیانیشدا بووە بەپێچەوانەوە باسیان کردووە. بەڵام من بەدڵنیاییەوە دەڵێم شەهید عەزیز کۆمەڵێك خەسڵەتی چاکی هەبوو مرۆڤێکی چاك و ئازاو ڕاستگۆو بێ پێچ و پەنا بوو. لەگەڵ دۆست و هاوڕێ و برادەرانی بەوپەڕی وەفاو ڕاستیەوە هەڵسوکەوتی دەکرد ، نایەتە یادم ڕۆژێك بەخراپە باسی یەکێك لەبرادەرەکانی کردبێ ، زۆر دڵساف بوو کینەی لەکەس هەڵنەدەگرت .

لێرەدا جێی خۆیەتی کەمێك باسی ئەوە بکەم کەلەدوای ئەوەی شەهید عەزیز چووبووە دەرەوە بۆناو پێشمەرگە، لەو کاتەوە تاکو ڕۆژی دەستگیرکردنی من دووجار بینیم جارێکیان لەماڵی خوشکی لەسەرچنار ، جارێك لەماڵی کاك شازاد سائیب. هەردوو جاریش دوای خۆشحالی دەربڕین بەبینینی و بەئارەزووی خۆم دەنگە دەنگم لەگەڵ کرد ، کەوا هاتنەوەی بۆناوشار کارێکی چاك نییەو لەوانەیە تووش ببێ و خۆیی و خانە خوێی و کەسوکاریشی سەریان تێدا بچێ ، ئەویش هەردووجار بەپێکەنینەوەو بەقسەی خۆش پەیمانی دەدا کە بەقسەمان دەکات و جارێکی دی نایەتەوە ناوشار.

جارێکی دیکە کە کاک شازاد ئێوارە هات بۆ مەکتەبەکەمان گوتی (عەزە) هاتۆتەوەو لەماڵی ئێمەیەو دەیگوت شەوبێ بۆلام ، منیش گوتم پێی بڵێ نایەتو نایەوێ بتبینێ ئەی ئەو پەیمانی نەدابوو کەهیچیکە نەیەتەوە سلێمانی، نەچووم بۆلای بەلام شەو پەشیمان بوومەوە ، بڕیارمدا سبەی ئێوارە سەردانی بکەم. بۆ بەیانی کاتێ لەگەڵ کاک شازاد سەرقاڵی کاری خۆمان بووین لەدادگا ، لەماڵەوە تەلەفۆنیان بۆ کردبوو ، کەوا عەزیز چۆتە سەریان لەگەڵ کچە بچکۆلەکەی کاک شازادو یەکێك کەسەر بە ڕێکخستنی (بەعس) بوو ، دراوسێی ماڵی کاک شازاد بوو بینیویانە، کاک شازاد بەپەلە چووبوو شوێنەکەی پێ گواستبووەوە، بەلام ترسی ئەوەی هەبوو کە ئەو کەسە خەبەریان لێبدا، لەدوایدا خزمێکی ئەو پیاوەمان ناردبۆلای ئەویش زۆر بەپیاوانە گوتبووی ، نەك هەر مەترسییان نەبێ من ئامادەم لەماڵەکەی خۆشمدا میوانداریی بکەمو بیشارمەوە ، ئەوجارەشیان خۆیو کاک شازادو ماڵو منداڵی سەلامەت بوون ئەوە بوو دواجار لەماڵی یەکێك گوایە دۆستی بوو و سەر بەڕێکخستنی یەکێتی بووە دەستگیرکرا و سەری تێداچوو ، داخێکی گەورەشی لەدڵی کەسو کار و برادەرانیدا جێ هێشت بەتایبەتی لەدڵی دایکە پیرەکەیدا کەتەنیا یەك تاقە کوڕی هەبوو ئەویش عەزیز بوو ... عەزیزی میللەت و وڵاتو برادەرەکانی.

# هەموو کاتەکانی ژیانی تەرخانکردبوو بۆ کۆمەڵە

**کەمال عەلی**

بیرەوەریم لەگەڵ شەهید عەزیز کورتە و دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٤ ، کاتێک کەشەڕی نێوان حکومەت و پارتی دەستی پێ کردەوە.کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان ئەوکات گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیبوو ، لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە . لەناو شارەکانی کوردستاندا رەگ و ریشەی بەچاکی داکوتابوو، بۆیە کۆمەڵە دەیویست بەهەمان شێوە لەناو دێهاتەکانی کوردستانیشدا گەشە بکات. سەرکردایەتی ئەوسای کۆمەڵە بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو ئەوکادیرو ئەندامانەی هەیبوو کە بەهۆی شۆڕشی ئەیلولەوە یان بەهۆی چالاکی زۆریان لەناو ریزەکانی کۆمەڵەدا دەرکەوتبوون، هەم بۆ ئەوەی نەکەونە بەر دەستی رژێم و هەم بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە رێکخراوەییەی لەدێهاتەکان هەمان بوو، کادیرەکانی بەسەر ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا دابەشکرد. لەڕووی پەیوەندیشەوە، بە شێوەیەکی رێک وپێک بەیەکەوە بەسترانەوە. من یەکێک بووم لەو کادیرانەی بەر ناوچەی پێنجوێن کەوتم ناوی نهێنی و شوێنی ئەو هاوڕێیانەی کە کەوتبوونە بەشەکەی منەوە پێم سپێردرا، تا پەیوەندیان پێوە بکەم و لەشانەدا کۆیانبکەمەوە .

یەکێک لەو هاوڕێیانە (شەهید عەزیز) بوو ، کەپەیوەندیی بەرێکخستنی منەوە هەبوو ، شەهید عەزیز تا بڵێی کوڕێکی رووخۆش و قسەخۆش بوو ،

لەڕووی کۆمەلأیەتیەوە ناوو ناوبانگێکی باشی هەبوو، زۆر کۆمەلأیەتی بوو، بەهۆی ئەو خەسڵەتە باشانەیەوە ، کۆمەڵیَ هاوڕێی زۆرباشی هەبوو ، توانی زۆربەیان بهێنێتە ریزەکانی رێکخستنەوە ، رۆڵێکی باشی ئەبینی لەگەشەکردنی رێکخستنی بەشەکەدا (تا بڵێی دڵسۆزبوو ، بەڕاستی هەمووکاتەکانی ژیانی تەرخانکردبوو بۆ کۆمەڵە ، کۆمەڵەی بەشتێکی بنەڕەتیی دانابوو لەژیانی خۆیدا، هەموو خۆشیو لەزەتێکی ژیانی بەخشیبوو بە کۆمەڵە). ئەوەی لێرەدا دەمەویَ باسی بکەمو هەرگیز بیرم ناچێتەوە ئەوەبوو ، شەهید عەزیز لەژیانی گەنجیی خۆیدا پێش ئەوەی بێتە ریزەکانی کۆمەڵەوە ، وەکو هەموو گەنجەکانی سەردەمی خۆی دڵی بەکچێکەوە بوو زۆری خۆش ئەویست ، ماڵی باوکی کچەکەش ساڵی ١٩٧٤ کە شەڕ دەستی پیَ کردەوە بەخێزانەوە روویان لەناوچەی هەورامانکرد و لەئەنجامدا چوونە شاری پاوەی ئێران ، چەند جارێك پێش هاتنە دەرەوەو دوای هاتنە دەرەوەش دۆستو خزمانیو هاوڕێیانی شەهید عەزیز داخوازی کچەکەیان لەباوکی کردبوو ، هەر رازی نەئەبوو ، تا نزیکی هەرەس ، ئەوسا باوکی رازی بوو، شەهید عەزیز بۆ جیَ بەجیَ کردنی مەسروفاتی ئەو مەراسیمە ، جوابی ناردبوو بۆ شار بۆ کەسو کاری تا پارەی بۆ بنێرن لەبیرم دیَ (١٧٠) دیناری ئەوکاتەیان بۆ ناردبوو ، چەند رۆژیَ پێش هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول ، پارەکەی بەدەست گەیشتبوو.

ئەوەبوو هەرەس بوو کۆمەڵەش ئەوکات خۆی ئامادە ئەکرد بۆ بەرەنگاریی ، دەمانویست بەرگریبکەین لەگەڵ هەرەس ئێمەش نەڕۆینەوە بۆ ئەم مەبەستەش سەرکردایەتی کۆمەڵە تەعمیمێکی دەرکرد بۆ ئەندامەکانی ، کە هەرچی ئەتوانن لەکۆکردنەوەی چەك و تەقەمەنی و ئازوقە و کەرەسەی چاپ

کۆیبکەینەوە و رەوانەی شوێنێکی بکەین کە ئەوکاتە دەستنیشانکرابوو وەکو بنکەیەکی بنەڕەتی ، هەروەها داوامانلێکرا کەهەرچی پارەیەکمان پێیە یان ئەگەر کەس و کاری دەوڵەمەندمان هەیە ، جوابیان بۆ بنێرین پارەمان بۆ بنێرن ، بۆ کڕینی پێداویستییەکانی بەرەنگاری. کەچووم ئاگاداری شەهید عەزیزم کرد بۆ ئەو مەسەلەیە ، خێرا (١٧٠) دینارەکەی دایە دەستم وتی ئەوە پارەی مەسروفاتی ژنهێنانەکەمە خۆشم و پارەکەش دەبەخشمە کۆمەڵە ، زۆریشی پێ خۆش بوو کەئەو هەواڵەم پێڕاگەیاندووە ، بەتایبەتی کە کۆمەڵەش ئەو مقاومەتە ئەکات، ئەو هەڵوێستە گەورەو دڵسۆزانەیە هەمیشە لام زیندووەو هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە ، ئەوەی هەیبوو لەژیانیا بەخشی بەکۆمەڵەو بۆ دواجاریش ژیانی بەخشی بەکوردو کوردایەتی .

•

# بیرەوەرییەکی کورت

مام رۆستەم کەرکوکی

مامۆستا عەزیز تابلێی پیاوێکی چاك‌وئازابوو، لە رێگەی کاك ئارام (شەهید ئارام)ەوە تێکەڵ بەخەباتی سیاسی و کوردایەتی بوو بوو ، من لەقەرەداغ ناسیم، پێمان ئەوت (موحی) چونکە ناوی نهێنی پێشمەرگایەتی (محێدین) بوو مامۆستا عەزیز کە گەیشتبووە پلەی سەرکردایەتی ساڵ‌و نیوێك پێشمەرگە بوو، لە نێوشاری سلێمانیدا لەلایەن رژێمی عیراقەوە گیرا ، ئەگەرچی شارەزای نووسین و بەرهەمی مامۆستا عەزیز نیم‌و نازانم چی هەبووە و چی نوسیوە ، بەڵام پیاوێکی زۆر زیرەك و زانا بوو.

جارێکیان من بریندار بووم ، شەهید ئارام بریارێدا کەڵەشێرێکم بۆ بکرێ، مامۆستا عەزیز-یش وتی با پێکەوە بیخۆین، بۆ بەیانی رەخنەیەکی زۆریان لێگرت ، وتیان خۆتۆ بریندار نەبوویت، نە ئەبوو تۆ لەو گۆشتەت بخواردایە ، زۆر لەسەری رۆیشتن، وتی بابە زەهرم خوارد، وازم لێبهێنن، حەز ئەکەن تاماوم ئیتر گۆشت ناخۆم .

ماوەیەکی بەسەردا تێپەری ، رۆژێکیان عەزیز وتی: مام رۆستەم باقازێك بکرین، وتم قازت بۆچییە ؟ ئەی تۆ نەتووت ئیتر گۆشت ناخۆم؟ وتی بۆ خواردنم نییە، بۆ حەراسەت قاز زۆر وریایە .

•

جارێکیان کاك ئارام بریاری دەرکردبوو کەلەرێگە رۆیشتندا ماوەی نێوان پێشمەرگە تێك نەدرێت، ئەوەی تێکی بدات سەعاتێك زیاتر حەراسەتی

پێدەگیرێ، جا هەرکەسێك ریزی تێك بدایە مامۆستا عەزیز پشتی ملی ئەگرت و ئەیوت : سەعاتەکەی منت حەلاڵ کرد ، چونکە زۆر رقی لەحەراسەت بوو پیاوێکی تا بڵێیت قسە خۆشبوو ئینسان قەت بێتاقەت نەئەبوو لەگەڵیا . ساڵی ١٩٧٧ کەبڕیاردرا بچێت بۆ سەرکردایەتی مەن لەمانگی (٧)ی ئەوساڵەدا بردم بۆ سەرکردایەتی ئەوبردنەم دوابینینم بوو ، لەساڵی ١٩٧٨دا لەلایەن رژێمی بەعسەوە لەناوشاری سلێمانیدا گیرا وەکو بزانم لەساڵی ١٩٧٩ بەداخەوە لەموسڵ لەسێدارەدرا ، لەوکاتەوە زۆر بەداخم بۆ ئەو مامۆستا قسەخۆش و دەم بەقاقای پێکەنینە ، بەلای منەوە هەرچی لەسەر بوترێ و بنووسرێ هەر کەمە ، بەداخەوە هەرچەندە تەمەنی هەموو بۆ خەبات و تێکۆشان تەرخانکردبوو لەپێناوی گەلەکەیدا تەمەنی پێشمەرگایەتی لەشۆڕشی نوێدا زۆر کورتبوو ، هەروەها لەتەمەنێکی کورتدا ژیانی بەکورد و کوردستان بەخشی (بەراستی بەجوانەمەرگی خەباتی نەتەوەیی دەژمێردرێت) هەزار سڵاو لەگیانی ئەو شەهیدە جوانەمەرگە و شەهیدانی کوردستان .

# مامۆستا عەزیز مەحمود و بیرەوەرییەکی کورت

عومەر غەریب

من لە ساڵی ١٩٦١ چوومە قۆناغی ناوەندیی و لە ناوەندیی سلێمانی وەرگیرام ، لەو پۆلەدا کە منی لێ بووم مامۆستا عەزیز-یش خوێندکار بوو ، مامۆستا عەزیز کوڕێکی ئازاو گورج و گۆڵ و قسە خۆش و نوکتە بازو بە جموجوڵ بوو هەر لەو ساڵەدا شۆڕشی ئەیلول لە دایك بوو ، بۆیە کەوتینە خولیای کارکردن ، لە ناو ریزەکانی قوتابیان و پارتیدا ، من لە بەر کەمی تەمەنم لە حزب وەرنەگیرام ، بەڵام لە قوتابیان وەرگیرام ، کاك عەزیز مەحمود-یش یەکێ بوو لەو قوتابیانەی کە خولیای ئیشکردن بوو ، بۆ یەکەمجار لە ماڵی نەجات عبدولستاردا کۆبوونەوەمان کرد ، نزیکەی (١٦-١٧) قوتابی بووین کە ئێستا هەندێکیانم لەبیرماوە لەوانە (مامۆستا عەزیزو حمە سەعید ئەحمەد شێوەکەلی و عەبدوڵڵا مەحمود شێوەکەلی و ئەحمەد محەمەد سلێمان و عەبدوڵڵا حاجی سەعیدو ئازاد جەلال و رەفعەت بابەجان و ئازاد ناوێکی ترو نەوزاد حمە ئاغا لە سابوونکەران) پاش کۆبوونەوەکە ، دابەشکراین بەسەر شانەی کەم کەم و بووین بە بناغەیەکی باش لە خوێندنگەی ناوەندیی کەسەربە ئامادەیی سلێمانی بوو ، پاش ماوەیەك گوێزراینەوە بۆ سەرکارێزو لەو قوتابخانەیەدا قۆناغی ناوەندیمان تەواو کرد، لەو سێ ساڵەدا چەندین جار کۆبوونەوەو کاری حزبی و قوتابیانمان کرد ، ماڵی باوکی مامۆستا عەزیز لە گەڕەکی سەرگۆل بوو ، ئێمە لەبەر

ئـەوەی شـوێنمان نـەبوو ، ئەچـووینە ئـەو ماڵانـە کۆبوونـەوەمان ئـەکرد .
ئەوەنـدە هـۆگری یەکـدی بـووین لەسـەر جـادەی کـاوەی ئێسـتادا زۆربـەی
کاتـەکانمان بـە یەکـەوە بەسـەر ئـەبرد . (کـوڕە کـوردێکی زۆر دڵسـۆز بـوو ،
حـەزی لـە قسـەی خـۆش و نوکتـە بـوو ، هـەموو کـات دەم بـە پێکـەنین بـوو ،
هەرگیز بە ڕوو گرژی نەماندەبینی) .

لە دوای ناوەندیی بە هۆی باری خوێندنەوە لە یەك دابڕاین ، بەڵام ڕۆژانە
یەکترمان ئەبینی ، ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو کوڕە گۆڕانکاری باشی بەسەردا ئەهات،
زیاترو زیاتر دڵسۆزو پەرۆشی کوردایەتی ئەبوو ، بۆ دوا جار من لە جەژنی
ڕەمـــەزانی ســـاڵی ۱۹۷۷ دا ، چـــووم بـــۆ ( ســـوڵەی قـــەرەداغ ) ، لـــەوێ
دانیشـتبووین ، کـاتێکم زانـی پـۆلێ پێشـمەرگە خۆیـان کـرد بـەناو دێکـەدا
خەڵکی گوندەکە لەگەڵ بەخێرهاتنیانـدا تەوقـەیان لەگەڵـدا دەکـردن ، منیش
وەکو ئەوان تەوقەم لەگەڵداکردن و بـەخێرهاتنم کـردن ، کەسـەیرمکرد یـەکێ
لەناو پێشمەرگەکاندا (مامۆستا عـەزیزە) بەنیازبووم باوەشـی پیـادا بکـەم و
ئـەملاولای مـاچ بکـەم ، یەکسـەر بەئیشـارەت تێیگەیانـدم کەوانەکـەم ، لەبەر
ئەوە خەڵکەکە نەزانن یەکتر دەناسین . ئەوەشی دیارە لەبەر خاتری من بوو .
پـاش ماوەیـەك من بـە هـۆی دەموچـاو شـۆرینەوە چـووم بـۆ سـەر حەوزەکـە،
یەکسـەر خـۆی پـێ گەیانـدم پـاش ئـەملاو ئـەولای یـەکتر مـاچ کـردن ، لـە
جموجوڵ و هەڵس و کەوتی شۆڕش ئاگاداری کردم و منیش ئاگادارم کرد کە
من بێ خەبەر نیم لە ئیش و کار ، ئەوەندەی تر باوەشمان بەیەکدا کردو خوا
حافیزیمـان لـە گـەڵ یـەکتر کـرد ، ئـەوەی لـەبیرم مـاوە ئـەوەبوو لەگـەڵ ئـەو
مەفرەزەیەدا (مولازم جوامێر و شەهید حەمە سەعید سێ تەلانی و شەهید
ئەحمەد حارس و شەهید فەرەج سێ تەلانی و شەهید حارس)یان لەگەڵدا

بوو ، کە کەشف بووبوون و ڕایانکردبوو پەیوەندییان بە شۆڕشەوە کردبو هەنـدێکیان بـێ چـەك بـوون .. ئـیتر ئـەوە دوا جـار بـوو کـە ئـەو هـاو خۆشەویسـتەم بینـی و بـە دیـداری شادبووم ، پـاش ماوەیـەك گەڕایـەوە سلێمانی و ، لەوێ لە ماڵی (عومەر مارف) دەستگیر کراو پاشان لـە سێد درا ، هەزار سڵاو لە گیانی پاکی ئەو شەهیدە سەربەرزە .

# بیرەوەرییەکانم لەگەڵ شەهید (عەزیز مەحمود)ی سەرکردە

ئەحمەد ساڵح

ئەگەرچی دەمێک بوو کاکە (عەزیز مەحمود)م وەك لاوێکی رووخۆش و کراوە، خۆش مەعشەرو رەفیق دۆست، وەك لاوێکی خوێنگەرمی هەڵسووڕاوی شاری سلێمانی ئەناسی، کە هاوڕێ‌و هاوخەباتی کۆمەڵێك لاوی تێکۆشەری ریزەکانی (لاوان‌و خوێندکاران) بوو، بەڵام وەك نزیکیی‌و یەکترناسین‌و پێکەوە کارکردن لەڕێکخستن‌و کاروانی تێکۆشاندا، ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی کۆتایی شەستەکان (١٩٦٨ - ١٩٦٩) کاتێ کەبەندە وەك خوێندکارێك لەبەشی (جوگرافیا)ی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا وەرگیرابووم، ئەوەبوو لەسەرەتای ساڵی (١٩٦٩)وە لەڕێگەی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان)ەوە یەکترماننناسی‌و پێکەوە کارمان کرد، ئیتر ساڵی (١٩٧٠) کە بەشی جوگرافیاو بەشی زمانی کوردی‌و چەندین بەشی تر لەچوار چێوەی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغدا کۆکرانەوە، نزیکی‌و پێکەوە کارکردنمان لە (ی.ق.ك) و ڕێکخستنی (پارتی) باڵی مەکتەبی سیاسیدا، وایکرد کەلەیەکتر نزیك ببینەوەو کاری هاوبەش بکەین‌و ، خۆشەویستی‌و هاوڕێیەتیمان زیاترو پتەوتر ببێت .. لەمیانەی هاوڕێیەتییەوە بۆم دەرکەوت کاکە (عەزیز) هاوڕێیەکی بەوەفاو خاوەن کەسایەتی‌و چالاکە . دیارە بۆتەی خەباتیش هێندەی تر ئامادەو قاڵی کردبوو ، بۆ ژیانی سیاسی‌و رێکخراوەیی‌و بووبووبە مرۆڤێکی هۆشیارو جێگەی متمانەو جەربەزەو

لەخۆبوردوو، بۆیە جێگەی خۆی لەدڵ و دەروونی هەمووانداکردبووەو هەموو هاوڕێ و دۆستەکانی ڕێزیان لێئەگرت و لەناخەوە خۆشیان ئەویست و حسابی تایبەتیان بۆ ئەکرد، بۆ سەلماندنی ڕاستی ئەو بۆچوونەشمان ئەتوانین ئەم نموونانە بهێنینەوە:

١-بەدرێژایی ئەو ماوەیەی پێکەوە خوێندکار بووین لەزانکۆی بەغدا، لەهەموو بۆنەو یادە (نەتەوەیی و نیشتمانی و خوێندکاری)یەکاندا، هەڤاڵەکانمان (بەکوڕو کچەوە، بەخەڵکی شاری سلێمانی و هەولێرو کەرکوک و دهۆکەوە) لەسەر ئەوە کۆک بووین کە (کاکە عەزیز) سەرپەرشتیار یان ئەندامی لیژنەی ئاهەنگ و سەیرانەکان بێت، چونکە کەسێکی هەڵسوڕاوو شارەزاو بەتەگبیرو بەهیمەت بوو، ڕۆحسوک و زمان شیرین بوو، کارەکانی بەئاسانی ڕاییئەکرد، هەموو کارە گران و گرنگەکانی بۆ خۆی دائەناو بەگوتەی (کاکە .. ئاسانە جێبەجێ ئەبێت) بەڕێی ئەکرد، کارە ئاسان و نزیکەکانی بۆ هاوڕێکانی دائەنا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا (دوور بوو لەخۆهەڵکێشان و خۆ بەزلزانین و نازکردن و منەتکردن بەسەر هاوڕێکانیدا، تەنها دەسکەوتی بریتی بوو لەو شادی و خۆشییەی لەکاتی بۆنەو یادەکاندا بەدڵ و دەروون و سەرو سیمایەوە دیاربوو) بەو قاقای پێکەنینە بێگەردانەی کە دەیکردنە مەدالیای سەرکەوتنی ئیشوکارەکانی، هەڵبەتە ئاهەنگەکانی (کۆلێژی ئاداب و سەیرانەکانی حەبانییەو سەدەی هیندیەو باقوبە) شایەتێکی ڕاستگۆی ئەم بۆچوونەمانە..

٢-كـاتێ (كاكـە عـەزیزو یاسـین ئـەنوەرو[1] چـەند هـەڤاڵێكی تـر...) خانوویەكیان بەكرێ گرتبوو لەگەڕەكی (راغبە خاتوون)ی بەغدا، ماڵەكەیان بووە مەڵبەندی بەیەكگەیشتن و كۆبوونەوەو خوانی هەڤاڵان، چونكە لای كاكە عەزیزو هاوڕێكانی (ڕووی خۆش و قسەی نەستەق و خوانی ڕازاوەو، ڕێنمایی و پەخشنامەكانی ڕێكخستن و كتێب و سەرچاوەی هەمەچەشن و هەواڵی شارە حەیاتەكە (سلێمانی) دەست ئەكەوت)...

٣-ساڵی (١٩٧٢) كـاتێ بڕیـاردرا هـەردوو باڵەكـەی (یـەكێتی قوتابیـانی كوردستان) لەیەك ڕێكخراودا كۆبكرێنەوەو كۆنگرەی یەكگرتنەوە ببەستن لەهۆڵی زانكۆی سلێمانی، هەر كاكە عەزیز نوێنەرو ڕێكخەری ئیشوكارەكان بوو ؛ لە نێوانماندا چونكە یەكێك بوو لەكادێرە هەرە چالاكەكان و بەهەق ڕێكخـەرو ڕێخۆشـكەرو ئاسـانكاری ئیشـوكارەكانمان بـوو، زۆربـەی پێویستیەكانی ئەو سەفەرو بەشداریكردنەی بۆ دابینكردین هەر لەڕێگەی ئەویشـەوە ڕێنمـایی و بەرنامـەی كاركردنمـان پێدەگەیشـت تـا كۆتـایی كۆنگرەكە، كـاتێكیش گەڕاینـەوە بـۆ بەغـدا هـەر ئـەو ڕێكخـەری سـەفەرو گەڕانـــەوەمان بـــوو، بـــەڵام ئـــەمجارە جگـــە لـــەمزگێنی یەكگرتنـــەوەو یەكخستنەوەی ڕیزەكانی خوێندكارانی كوردستان بێ گوێدانە مەترسی و سەریەشەی ڕێگاو بازگەكانی حكومەتی مەركەزی و ئەمنەكانی، بەچاوقایمی خـۆی دەمانچـەیەكی لەگـەڵ خـۆی هێنـا بـۆ (بەغـدا)، وتمـان (عـەزیز) ئـەو دەمانچەیەت بۆ چیە؟ بۆ هێناوتە؟ چۆنی دەرباز ئەكەیت بۆ بەغدا؟ نازانی چەك قەدەغەیەو مۆڵەتی یاسایی دەوێت؟ خۆ (بەغدا) سلێمانی نیە، وتی

---

[1] كاكە (یاسین ئەنوەر) لێپرسراوی خوێندكارانی باشوور بوو لەسەردانێكیدا بۆ باشووری بەغدا بەكارەساتی ئوتومبیل شەهید بوو.

(کاکە .. هەقتان نەبێت من خۆم دەربازی ئەکەم و لای دەرگای پاسەکەوە دائەنیشمو دەمانچەکە لای خۆم دائەنێم، لەهەموو بازگەکاندا من دائەبەزمو ئەمنی بازگەکە منی لەبیر ئەچێ و داوای (ناسنامە) لەئێوە دەکات، هەروەها وتی کاکە پێویستمان پێیەتی ئێمە سەرئەکەین بە هەموو شوێنێکداو دوژمن و ناحەزمان زۆرە ، با ئەم دەمانچەیە هاورێمان بێت ..، لەراستیدا چۆنی وت وادەرچوو بەوشێوەیەی کەخۆی وەك کەسێکی کردەو لێهاتوو (پێرە دەمانچەی!) گەیاندە بەغدا..

٤-هەمان ساڵ کاتێ (مەکتەبی سیاسی) خولێکی رۆشنبیریی رێکخست بۆ ژمارەیەك کادری خاوەن ئەزموون و خوێندکاری زانکۆی بەغداو فەرماندەکانی پێشمەرگە، کە ژمارەیان (٣٠) هەڤاڵ بوو ، لەبارەگاکەی (شارع فلسطین)لەبەغدا، خولەکە تایبەت بوو بەکتێبی (الجبهة الوطنية...)ی هەڤاڵ مام جەلال هەر بەرپرسیشی وانەکانی ئەوتەوەو کتێبەکەی شیئەکردەوە، کاکە عەزیزو بەندە لەو خوێندکارانە بووین کە بەشداریمان تیاکرد، لەوێش لەکاتی (پشوو)ەکاندا کاك (عەزیز)ی نوکتەبازو قسەخۆش و مەجلیسی گەرمو ئاوەدان بوو ، جارجارە قاقای پێکەنینێکی تێکەڵ ئەکردو تامو چێژێکی ئەدا بەدانیشتنەکانمان و خۆیشی هێندەی تر جێگەی خۆی ئەکردەوە لەناو دڵمانداو هاورێیەتیمان پتەوتر ئەبوو.

٥-ساڵی خوێندنی (١٩٧٢-١٩٧٣)کاتێ زانکۆمان تەواوکرد ، کاکە عەزیز وەك مامۆستای زمانی کوردی لەشارۆچکەی (عەزیزیە)ی سەر بە (پارێزگای کوت)دامەزرا، لەهاتنەوەیدا بۆ سلێمانی لەکاتی پشووی نیوەی ساڵدا یەکترمان بینی و ، ئەو مەوزوعی (کۆمەڵە)و پەیوەندیکردنی لاکردمەوەو داوای پەیوەندیی لێکردم، بەندەش وەڵامم دایەوە کە

بینراوم[1] و پێش گەڕانەوەت برانەرێکی تر ئەو مەوزوعەی لاکردوەتەوە، تۆلای خۆتەوە دڵنیابەو مەوزوعەکە دابخە، ئیتر وازی هێناو ئەو دەرگایەی نەکردەوە.

٦-ئیتر تا دەست پێکردنەوەی شەڕ لە ساڵی ١٩٧٤دا لەنێوان (کوردو رژێم) پاش شکست هێنانی گفتوگۆکانی بەیاننامەی (١١ی ئازار) کە (عەزیز) عەزیزییەی بەجێهێشت و هاتەوە بۆ سلێمانی و داوای لەئێمەش کرد کە بچینە دەرەوەو پەیوەندی بە شاخەوە بکەین و چارەنووسی خۆمان بەشۆڕشەوە ببەستین...

٧-ساڵی (١٩٧٥) دوای هەرەس و بڵاوەپێکردن، (مامۆستا عەزیز) گەڕایەوە باشووری عێراق (عەزیزییە)و وەزعێکی دەروونی و ئاسایشی ناهەمواری گوزەراندبوو ، بێزاربوبوو لەقسەو پلاری پیاوانی رژێم، بۆیە جارێکی تر رێگەی کوردستانی گرتەوەبەرو ، رێبازی (کەم ژیان و کەڵ ژیان)ی هەڵبژاردو چووە شاخ و پەیوەندی کرد بە (شۆڕشی نوێ)وە ، ئێمەش خۆشحاڵ و ئاسوودە بووین چونکە بێزاربوو لەژیانی ژێردەستی و زەبوونی ژێر دەسەلاتی داگیرکەر ، بەلام مەخابن ساڵی (١٩٧٨) لەکاتی گەڕانەوەیدا بۆ ناوشاری سلێمانی بۆ ئەنجامدانی کارێکی رێکخستن، کەوتە (بۆسە)ی دوژمنەوەو لەلایەن دەزگا داپڵۆسێنەرەکانەوە دەستگیرکرا، دوای داستانێکی خۆڕاگری و جوامێری و نهێنی نەدرکاندن ، کە دوژمن هیچ سوودێکی لێ نەبینی و نهێنی هەمووانی پاراست، سەربەرزانە گیانی پیرۆزی بەخشییە

---

[1] مەبەستم لە برادەر هەڤاڵێ رووناکبیری بێسەروشوێنکراو کاکە (فەهمی قەرەداغی) بوو کە هەر زوو پەیوەندیی پێوە کردەو هەموو جارێك لەفەرمانگەکەی خۆی یان لەماڵەوە نووسراوەکانم لێوەردەگرت و کۆنەبووینەوەو زانیاریمان ئەگۆڕییەوە.

سـەروەریی گـەل‌و نیشـتمان بۆیـە دوژمـن لەشـەوی (٢٤/٢٥ /٣/١٩٧٩) لەقەسـابخانە مەرگسـێنەکەی (موسـڵ) لەسـێدارەیدا ، تـەرمی پـیرۆزی کـرا بـەمیوانی گۆڕسـتانی (وادی الحجـر)ی موسـڵ، بـەڵام گیـانی بـەرزو مـەزنی گەیشتەوە بەر قافڵەی کاروانی شەهیدانی شۆڕشی نوێ (خاڵە شیهاب‌و جەعفەرو ئەنوەر ...)و ئەمیش بووە یەکێك لەشەهیدە سەرکردەکان‌و سەری شۆڕشـی نـوێ‌و یـەکێتی‌و کۆمەڵـەو کەسـوکارو ئێمـەی هـاوڕێی بـەرزتر کـردەوەو بووەمایـەی شـانازیمان‌و قـەرزاریاری کـردین‌و ، ئۆبـاڵی درێـژەدان بەڕێگەو ڕێبازەکەی خستە ئەستۆمان....

ئێمـە لەکاتێکـدا یـادی ئـەو شـەهیدە قارەمانـە، ئـەو سـەرکردە جـوامێرە ئەکەینـەوە وێـڕای دانەوانـدنی سـەری ڕێـزو نـەوازش بـۆ خـەبات‌و گیانبەخشینی، ئەڵێین:-

کوردو کوردستان‌و کوردایەتی، کەسوکارو هاوڕێیانی مامۆستا عەزیز مـەحمود .. بەشـەهیدبوونی (هـەڤاڵ‌و تێکۆشـەرێکی خۆشەویسـت‌و بەئەمەك، ڕۆڵەیەکی دلێرو جوامێرو، کادرو سەرکردەیەکی جەربەزەو لێهـاتوو، کوردپـەروەرو نیشـتمانپەروەرێکی پـاك‌و بێگـەردو لـەخۆبوردوویان لەدەسـتدا مەگـەر ڕزگـارکردنی کوردسـتان‌و ئازادی‌و پێشـکەوتنی کـوردو سـەرکەوتنی کوردایـەتی ببێتـە ئازارشـکێنی ئـەو زامـە قووڵـەی کەمـەرگی (عـەزیز) لـەدڵ‌و دەروونمانـدا دروسـتی کـرد، مەگەر هێنانەدی ئاواتەکانمان برینەکەی سارێژ بکات.)

لەکۆتایدا ئەڵێین:

–نەمری و سەروەری بۆ شەهیدی سەرکردە مامۆستا (عەزیز مەحمود)و سەرجەم شەهیدانی رێگەی رزگاری و سەرفرازیی کوردو کوردستان .
–سەربەرزی و رووسووری بۆ کەسوکاریان ، هەزاران دروود و سڵاو لەگیانی بەرزو پیرۆزت ئەی ئەستێرە پرشنگدارەکەی بەشی کوردیی زانکۆی بەغدا، ئەی هاورێ هەڵسوراوو دەم بە پێکەنینەکەی خوێندکاران، ئەی کادری گیان لەسەر دەستی (کۆمەڵەو یەکێتی) ئەی تێکۆشەری رۆژگاری سەختی و مەینەتی، ئەی قارەمانی زیندان و مەرگبەزێنی زیندان و سێدارە، ئەی میوانە ئازیزەکەی گۆرستانە بێنازەکەی (وادی الحجر)ی موسڵ، بنوو بەئاسوودەیی هاکا هاورێبازانت بگەنە لات و سەری رێزو تەعزیم لەسەر مەزارەکەت نەوی بکەن و مزگێنی کۆتایهاتنی دیکتاتۆریەت و مژدەی سەرکەوتنی کوردایەتیت بۆ بهێنن و چەپکە گوڵی بەهاری ئازادی و رزگاری بخەنە سەر جێنزرگەکەت و ، دواتر لەمەراسیمێکی پرشکۆو شایستەدا تەرمی پیرۆزت لەیەخسیریی قوتار بکەن و بیگێرنەوە کوردستانی رزگارکراو تۆی هاورێی خەبات و شەهیدی دوورە نیشتمان لە گردی (شەهیدان – سەیوان) بە مەجلیسەکەی خاڵە شیهاب و مامۆستا جەمال تاهیرو جەمالە رەش و یاسینە رەش و شەهیدە سەروەرەکانی تر شاد ببیت، تا ئەوکات و ساتە رووخسەتت لێ ئەخوازین، جارێ ماڵئاوا و رۆحت شاد ... رۆحت شاد...

لەکاتێکدا کەسەرقاڵی پاکنووسکردنی ئەم بابەتە بووم بەرێز کاك (جەمال حەکیم ئاغا) نوێنەری هەڤاڵ مام جەلال لەمەڵبەندی رێکخستنی سلێمانی، بەسەرهاتێکی سەردەمی خەباتی شاخی (شەهید عەزیز)ی بۆ گێرامەوە بەپێویستم زانی کە ئەمەشیان وەك بەڵگەیەك لەسەر گیانی نوکتەبازیی و

قسەخۆشیی شەهید عەزیز تۆمار بکەم، کە تەنانەت لەکاتی هەل ومەرجی سەخت و نالەباریشدا لەقسەی خۆش و نەستەق نەکەوتووە، بەسەرهاتەکە بەم شێوەیەیە:

ماموستا عەزیز ئەیەوێ بەکارێکی شۆڕش لەسەرکردایەتیەوە دابەزێت و بچێتە ئەو شوێنەی بۆی دیاری کرابوو، بۆ ئەو مەبەستە وڵاخێك بەکرێ ئەگرێ و شتەکانی لێ بار ئەکاو لەگەڵ وڵاخدارەکە ئەکەونەڕێ، لەڕێگە گوریس و قەیاسەکە شل ئەبنەوەو بارەکە ئەکەوێت؛ کابرای وڵاخدار تووڕە ئەبێ لەماموستا عەزیزو ئەڵێ کاکە بەکەڵکی هاوڕێیەتی ئەمجۆرە سەفەرانە نایەیت، (عەزیز)یش هیچ خۆی سەغڵەت ناکات و بەهێمنی وەڵامی ئەداتەوەو ئەڵێت، وەڵڵا بابە تۆ ڕاست ئەکەیت، بەڵام بەخوا خەتای من نەبوو، خەتای کەسوکارم بوو بەزۆر منیان خستە بەر خوێندن و زانکۆیان پێ تەواوکردم، بڕوات بێت بمزانیایە ڕۆژم بەم ڕۆژە ئەگات، ئەچووم لە (خانی حەمە) لەسلێمانی ئەبووم بەشاگردو خۆم فێری وڵاخداری و بار بارکردن دەکرد بەڵام بڵێم چی ناوچەوانم نەیهێنا، ئاوا دەستو پێ سپی دەرچووم، کابرای وڵاخدار کەگوێی لەم قسانە دەبێت، بەسەرسوڕمانێکەوە سەیری دەکاو بێدەنگ بارەکە باردەکات و پێکەوە دەکەونەڕێ....

هاوڕێیەکی شەهید عەزیز ... گێڕایەوە وتی لەدوا سەردانمدا بۆلای شەهید لەزیندانی موسڵ لەژووری ئیعدام، لەکاتی قسەکردنمدا کوڕێکی نیشاندام وتی ئەو برادەرە ئەبینی ئەشەڵێ.. وتم بەڵێ، وتی ئەوە لەچالاکیی حزبێکی کوردستانیدا بەبریندار[ی] دەسگیرکراوە حوکمی ئیعدامی هەیە، کەسوکاری نەیانزانیوەو (مواجەهەی) نییە کردوومە بەبرای خۆم، ئەوەندە یەکترمان خۆش دەوێ و لەیەکتر نزیک بووینەتەوە کە پێش شەهید بوون

بۆتـە (کۆمەڵـە)، راسـتە لەسـەر ئـەو حزبـە گـیراوەو لەچـالاکیی ئەوا دەسگیرکراوە بەبریـنداری، بـەڵام بڕیـاری داوە لـەکاتی ئیعدام کردنـا هوتـ بەگیانی (یـەکێتی و کۆمەڵـە)دا بڵـێ .. لەراسـتیدا زۆر دڵـم خۆشـە بـەوەی لێرەش بەردەوامم لەسەر کاری رێکخسـتن و هێنانـە ریـزی خـەڵك، ئـەوەتا گـیرام تـەنها خـۆم بـووم، ئێسـتا بووینەتـە دوو، گـرنگ ئەوەیـە گـەر بـە ـەرگیش بڕۆین کـاروانی تێکۆشـانمان ئـاوەدان و بەردەوامـە.. ئەمـە هەڵوێستی شـەهید (عـەزیز) لـەپێش ئیعدامکردنیـدا بووبـە مایـەی شـانا هەمووان ...

# بەڵگەنامەکان باشتر راستییەکان دەسەلمێنن

**عومەر فەتاح**

لە نووسینێکمدا وەکو بیرەوەریی لەگەڵ شەهید عەزیزدا ، کە بۆ ئەم کتێبەم نووسیوە .. باسی هەڵوێستی مەردانەو کورد پەروەرانەو قارەمانێتی عەزیزم کردووە .. دوای رزگارکردنی عیراق لە دکتاتۆریەتو رووخانی رژێمی بەعس ، بە هەزاران هەزار بەڵگەنامەی گرنگ ، کەوتنە دەست حزبو لایەنە سیاسیەکانی کوردستانو عیراق .. لەو بەڵگەنامانەی کە دەست ئێمە کەوتن سێ بەڵگەنامەی شەهید مامۆستا عەزیزە ، کە هەر یەك لە بەڵگەنامەکان بە جیاجیا قارەمانێتی عەزیز دەسەلمێننو دەبنە پاڵپشتی نووسینەکەم ، بە پێویستم زانی کە لەسەر ئەو سێ بەڵگەنامەیە چەند دێرێك بنووسمو لەم کتێبەدا بڵاویبکەمەوە ، بۆ ئەوەی هاوڕێیانیو خەڵکی کوردستان بزانن کە ئێمە لە خۆڕا باسی نەبەردیو دلێری ئەو پیاوە ناکەینو بەرهەمی خەباتو جوامێریی ئەوانە ئەم رۆژوئازادییەی بۆ فەراهەمکردووین .. لێرەوە دەچمە ناو هەرسێ بەڵگەنامەکەوە .

<u>**بەڵگەنامەی یەکەم**</u> : بەڵگەنامەی یەکەم بریتییە لە ئیفادە وەرگرتنی لە ڕۆژی ۱۹۷۸/۱۰/۱٤ لەم لاپەڕەی ئیفادەیەی شەهیددا بۆ جەلادەکانی بەعس (۷) پرسیاری ئاراستە کراوە .. من لەو پرسیارانەوە دەست پێدەکەم کە بەلامەوە گرنگن لە ڕووی پرسیارەکان و وەلامەکانی شەهیدەوە ..

لە پرسیاری (۳) ی جەلادەکاندا ، لێی دەپرسن ، پەیوەندیت بە چ حزبێکەوە هەیە ؟ کەی و چۆن پەیوەندیت کردووەو پلەی حزبیت چی بووە ؟

لە وەلامدا .. پێیان دەڵێت : تا ڕۆژی پەیوەندی کردنم بە پێشمەرگەوە هیچ پەیوەندییەکی ڕێکخستنم لە گەڵ هیچ حزب و ڕێکخراوێکی سیاسیدا نەبووە ، کە پەیوەندیم بە بزووتنەوەی یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە کردووە لە ۱۹۷۷/۸/۱ بە سیفەتی ئەندامێکی ( هێلی پان ) بوومە کادر لە قەرەداخ و لە مانگی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۷۸دا ، هەڵبژێردرام بۆ لیژنەی مەرکەزی و ، لە یەکەم کۆبوونەوەی لیژنەی مەرکەزی لە ۱۹۷۸/۷/۲۷ هەڵیانژاردم بۆ مەسئوولیەتی لقی دووی کەرکوك لە قەرەداخ .

شەهید بەم وەلامە هەموو ڕێیەکی لە دوژمن گرتووە ، تا داوای کەسانی ڕێکخستنەکانی ناو شارو چۆنێتی ڕێکخستنی لێ نەکەن ، پێیان دەڵێت لە ڕۆژی چوونە دەرەوەم کە بوومەتە پێشمەرگە بووم بە ئەندامی (هێلی پان) و پێشمەرگەو بەر پرسیم وەرگرتووە ، لە کاتێکدا هەر هەموو دەزانین کە عەزیز لە مێرد منداڵییەوە، بە خەباتی کوردایەتی و شۆڕشگێڕی گۆشکراوە، پێش ئەوەی ببێتە پێشمەرگە ، لە ناو شار بەرپرسیێتی هەبووەو تێکۆشەرێکی چالاك و نەترس و بە هەڵپەی ڕێکخستنەکانی ( کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستان ) بووە ، پەیوەندیی بە دەیان کەسەوە کردووە ، چەندین کەسی ڕێکخستووە ، کۆبوونەوەی بە دەیان ئەندامی کۆمەڵە

کردووەو ناسیونی و ناسیویانە .. لێرەدا ئەوەش دەردەکەوێت کە دوژمن چەند گێل و نەفام بووە .. چۆن کەسێك لە ١٩٧٧/٨/١دا بچێتە ناو بزووتنەوەیەکەوە ، بە پلەی پێشمەرگە .. مانگی حوزەیرانی ساڵی دوایی یەکسەر دەیکەنە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی ئەو حزبەو لە ٧/٢٧ی هەمان ساڵدا دەیکەنە لێپرسراوی لقێکی حزبەکەو دەینێرن بۆ ناوچەیەکی گرنگی وەکو قەرەداخ ؟..

لە پرسیاری (٤)ی ئیفادەکەدا ، لێی دەپرسن ئایا پێشتر پەیوەندیت بە لایەنی جەماعەتی مەلا مستەفاوە لە یاخیبوونی پێشوودا کردووە ؟

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا .. زیرەکانەو دووربینانە ، بە یەك وشە وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێت (نا) نەخێر.. دیارە وەڵامی ئەم پرسیارەش بۆیە بەو شێوەیە دەداتەوە ، چونکە زانیوێتی ئەگەر بیدرکێنێ کە پێشتر پەیوەندیی بە شۆڕشی مەلا مستەفاوە بووە ، دەکەونە سیم و جیم لەگەڵیدا و بە زوویی قوتاری نابێت ، لە کاتێکدا هەموو هاوڕێیانی دەزانن کە شەهید لە ساڵانی شەستەکانەوە ، ئەندامی پارتی بووەو لە ساڵانی شۆڕشدا ڕۆڵی بینیوەو لە ساڵی ١٩٧٤ دا چۆتە دەرەوەو وەکو پێشمەرگەیەکی مامۆستا لە ناو شۆڕشدا بووە ، تا کارەساتی هەرەس .

لە پرسیاری (٥)ی ئیفادەکەدا لێی دەپرسن .. ئایا پێشتر لە گەڵ جەماعەتی بە کرێگیراوان ڕاتکردووە بۆ ئێران و کەی گەڕاویتەوە ؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارەشدا وردەکارانەو زۆر زیرەکانە دێتە دەست و بە یەك وشە وەڵامیان دەداتەوەو دەڵێت (نا) نەخێر .. دیارە بۆیە ئەم وەڵامەشی بەم شێوەیە داونەتەوە .. زانیوێتی کە ئەگەر ناوی ئێران و چوونە ناو ئێرانەوە

بهێنێت .. وا بە زوویی لە لێکۆڵینەوەیان ڕزگاری نابێت ، لە کاتێکدا هەمووتمان دەزانین کە عەزیز ، لە کاتی شۆڕش دا چۆتە ناو ئێرانەوە ..

لە پرسیاری (٦)ی ئیفادەکەیدا جارێکی تر لێی دەپرسنەوە کەی پەیوەندیت بە لایەنی ئەو زومرەیەوە کرد کە ناوی خۆی ناوە (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) لە رووی سیاسی و عەسکەرییەوە ؟ بە بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ پرسیاری سێیەم دەڵێت لە مێژووی ١٩٧٧/٨/١ لە ناوچەی قەرەداغ پەیوەندیم پێوە کردووە ..

لە پرسیاری (٧)ی ئیفادەکەدا لێی دەپرسن . ئەو کاتە ئەرك و کارو پلەت لای یەکێتی نیشتمانی چی بووە ؟ لە وەڵامیاندا دەڵێت یەکەمجار وەکو پێشمەرگەیەك پەیوەندیم پێوەکردن ، لە ماوەیەکی کەمدا کرام بە لێپرسراوی سیاسی لقی دوو و کرامە ئەندامی لیژنەی مەرکەزی .

لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا شەهید زۆر زیرەکانە دوژمنی چەواشە کردووە .. خۆی لە قوڕە شێلەی پرسیاری زۆر دەرباز کردووە . لە کاتێکدا دوژمن زانیویەتی کە عەزیز کادرێکی لێهاتووی ناو ریزەکانی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانە ، بەڵام وەڵامەکانی عەزیز وایلێکردوون بێتاقەتیان بکات و کۆڵی لێبدەن .

<u>بەڵگەنامەی دووەم</u> : ئەم بەڵگەنامەیە نوسراوێکی (لیژنەی باڵای کاروباری شمال) زۆر بەنهێنی کەبەژمارە (٦٨٤٦/٢٧) لەڕۆژی (١٩٧٨/١٢/٧) نێردراوە بۆ مەنزومەی ئیستیخباراتی مەنتیقەی شیمالی بۆ دەربڕینی رایان .. سەبارەت بەنووسراوەکە ژمارە (٤٣٤٠) لە (٢٩/ت١٩٧٨/١) کەنووسیویانە :

(تکایه راتان دەربڕن سەبارەت تێکدەر عەزیز مەحمود کەلێبوردن بیگرنەوە یان نەیگرنەوە و بەزویی ئاگادارمان بکەنەوە کە عەمید روکن سەعدون علوان مصلح سکرتێری لیژنەی باڵای کاروباری شمال ئیمزای کردووە)

ئەم نوسراوە ئەوە دەگەیەنێت کەدەزگاکانی رژێم چۆن سڵیان لەوە کردۆتەوە لەوەی کاتێ لێبوردن دەرچێت کەسێکی وەك (عەزیز) بگرنەوە ، بۆیە ئەوانیش هەرزوو بەنووسراوێك کەلەبەڵگەنامەی سێیەمدا دەردەکەوێت چۆن وەڵامیان دەدەنەوە .

<u>بەڵگەنامەی سێیەم</u> : لە بەڵگەنامەی سێیەمدا کە نووسراوێکی زۆر نهێنی مدیرییەتی ئیستیخباراتی عەسکەریی مەنزوومەی ئیستیخباراتی مەنتیقەی شیمالییە بە ژمارە /س٢/ ق٨ / ٦٠٠٥ لە مێژووی ٢١/ك١/١٩٧٨ نێردراوە بۆ سکرتاریەتی لوجنەی عولیای شئوونی شیمالو بە مەوزوعی / بیان رەئی .

ئەم نووسراوە وەڵامی نووسراوێکی زۆر نهێنییە کە بە ژمارە ٦٨٤٦/٢٧ لە ١٩٧٨/١٢/٧ بۆ مەنزوومەی ئیستیخباراتی مەنتیقەی شیمالی نێردراوە ؛ وەڵامەکە لە (٤) خاڵدا کۆکراوەتەوە بەم شێوەیە ..

١- ناوبراو واتە ( شەهید عەزیز ) ( مراوغو سەڵبە ) پێدەچێت کە بەر عەفو بکەوێت ، لەوانەیە بەو بەڵێنانەی پێی دەدەن پەیوەندیی بە پێشمەرگەوە بکاتەوە ، لەبەر ئەوەی عونسرێکی رۆشنبیری کاریگەرەو لە نموونەی کەمە لە ناو ڕیزەکانیاندا .

٢- ناوبراو دوای بەربوونی هیچ ئیلتیزاماتێك ناکات بێ باك دەبێت .

٣- ناوبرلو خاوەنی لایەنی عەشائیری نییە لە ناوچەکەدا .

٤- پێشنیاز دەکەین کە هیچ جۆرە لێبوردنێك نەیگرێتەوە .

ئەم نووسراوەی دەزگای ئیستیخباراتی رژێم ، دەریدەخات کە زۆر بە وردی هەموو کەسایەتی شەهیدیان خوێندۆتەوەو بە تەواوی لێی شارەزا بوون . داننانی دوژمن بە (زۆرزانی یان زیرەکی وخۆڕاگری ) شەهیدا ئەمە خۆی لە خۆیدا گەواهی کەسایەتی بەهێزی شەهیدە . کەسێك دوژمن پێی بڵێت زۆرزان و خۆڕاگرە . ئەگەر بەر بدرێت یەکسەر دەبێتەوە بە پێشمەرگە، لەبەر ئەوەی کەسێکی رۆشنبیرو کاریگەرە لەناو ریزەکانی ئەو حزبەدا کەسێکی ناوازەو هەڵکەوتووە . دوژمن بە شەهید بڵێت کەسێکی رۆشنبیری ئەوتۆیە کاریگەری لەسەر خەڵك‌و جەماوەر هەیەو کەسێکی (بێ وێنەو بێ باکە) ئیتر چی دەمێنێتەوە ؟ تا هاورێیانی‌و خەڵکی کوردستان پێیبڵێن ، یان دوژمن پێی دەڵێت کەسێکە گوێ بە هیچ نادات لە کاتی لێبوردن‌و بەربوونیدا بەو واتایەی یەکسەر دژی رژێم دەوەستێتەوە ، دەست بەکار دەکاتەوە ، یان دەڵێت شەهید کەسێکی خاوەن عەشیرەت نییە لە ناوچەکەدا. دیارە مەبەستیان ئەوەیە شەهید سەر بە هیچ خێڵ‌و عەشیرەتێکی ناوداری کوردستان نییە، تا گرتن‌و پەشتنەوەی لە زینداندا ، عەشیرەتەکەی لە رژێم‌و داەو دەزگاکانی دڵگیر بکات یان دووریان بخاتەوە .. ئەمەش راستە عەزیز لە بنەماڵەیەکی هەژاری ناو شاری سلێمانی بوو ، خۆی بە هیچ خێڵ‌و عەشیرەتێکەوە نەبەستبۆوە . کۆمەڵەیەکی راستی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بوو .

کاتێ لە خاڵی چواری نووسراوەکەیاندا ، داواو پێشنیازدەکەن کە بە هیچ جۆرێك لێبوردن نەیگرێتەوە . ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە دوژمن لە جەربەزەیی‌و لێهاتوویی شەهید ئەوەندە ترساوەو سڵەمیوەتەوە بۆیە داوا

دەکەن بەر نەدرێت و نەیەڵن بچێتەوە ناو جەماوەری خەڵکی کوردستان و ریزی شۆڕش و پێشمەرگە .

خەڵکینە چی لەوە سەربەرزیترە ، دوژمن دان بەئازایەتی و خۆڕاگری و پاڵەوانێتی کەسێکدا بنێت ، دوژمنێکی سەرسەخت و درندەی وەکو بەعس راشکاوانە بە شەهیدێکی ناو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کوردایەتی و ئەندامێکی سەرکردایەتی (یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان) بڵێت (عونسورێکی خۆڕاگرو زۆرزان و رۆشنبیرو ناوازەو کارایە و کاریگەریی لەسەر ئاشکرا کردنی رژێمەکەیان هەیە . هەموو ئەو نووسین و بیرەوەریانە لەسەر شەهید نووسراون لەم کتێبەدا ، کەمیان بەقەدەر ئەم دوو بەڵگەیە بە هێزن و لە هەمان کاتیشدا دەبنە شایەتحاڵی هەموو نووسین و بیرەوەرییەکان و دەقی هەردوو بەڵگەنامەکە بەعەرەبی سەرنج بدەن ئەوسا قارەمانێتی ئەو سەرکردە خۆنەویستەتان بۆ دەردەکەوێت ، بۆیە لێرەدا بەڵگەنامەکان بەعەرەبی بڵاودەکەینەوە .

**بەڵگەی یەکەم**

١٩٧٨/١٠/١٤

افادة المتهم المخرب عزيز محمود علي واسمه السري شيخ محي الدين من اهالي محافظة السليمانية محلة كويزه قرب جامع بابه علي رقم ٦٣/٢ مهنته السابقة مدرس في متوسطة ناحية عربت التابعة لمركز قضاء السليمانية ومن مواليد ١٩٤٣ .

س١. هل انك متزوج وما عدد اولادك ؟

ج١. نعم متزوج من صبرية عارف امين من سكنة السليمانية وهي معلمة في مدرسة بكره جو الابتدائية للبنات ولاتزال موجودة في بكره جو وليس له اولاد .

س٢. اذكر نبذة عن تاريخ حياتك ؟

ج٢. في عام ١٩٤٣ ولدت في مدينة السليمانية ولكملت الدراسة الابتدائية والمتوسطة والثانوية في السليمانية وفي عام ١٩٧٢-١٩٧٣ تخرج من كلية الاداب ببغداد ثم للتحق الى الخدمة الالزامية في مدرسة الموسيقى العسكرية لمدة سنة واحدة . وفي عام ١٩٧٤ جرى تعينه مدرسا على ملاك تربية محافظة الكوت-العزيزية . وبتاريخ ١٩٧٦/١٠/١ جرى نقله الى تربية محافظة السليمانية ونسب الى متوسطة عربت .

والدى متوفي ووالدتى (خوا رشيده امين) تقيم مع شقيقتي نازنين زوجة علي توفيق وكيل شركة منتوجات الالبان في السليمانية ودارنا تقيم مع شقيقتي الثانية نسرين زوجة رؤوف محمد عامل في معمل السمنت في سرجنار .

س٣. الى اى حزب تنتمي ؟ متى وكيف انتميت وما درجتك الحزبية ؟

ج. الى حد يوم التحاقي الى جانب المخربين لم يكن لي اى ارتباط او تنظيم مع أي حزب أو منظمة سياسية . وانتميت الى حركة الاتحاد الوطني الكردستاني في يوم التحاقي الى جانب المخربين بتاريخ ١٩٧٧/٨/١ بصفة عضو في الخط العريض ثم كادر في منطقة قره داغ

-وفي شهر حزيران ١٩٧٨ . رشحت الى عضوية اللجنة المركزية وفي الاجتماع الاول للجنة المركزية في ١٩٧٨/٧/٢٧ رشحت الى مسئولية الفرع الثاني لمنطة قره داغ وكركوك .

س٤. هل سبق وان التحقت الى جانب زمرة الملا مصطفى في التمرد السابق ؟

ج. كلا .

س٥. هل سبق وان هربت مع الزمرة العميلة الى ايران ومتى عدت ؟

ج. كلا .

س٦. متى انتميت الى جانب زمرة ماتسمى نفسه بالاتحاد الوطني الكردستاني سياسيا وعسكريا ؟

ج. بتأريخ ١٩٧٧/٨/١ التحقت الى جانب المخربين المذكورين في منطقة قره داغ .

س٧. ماذا كان واجبك أو درجتك لدى زمرة الاتحاد الوطني ؟

ج. التحقت في باديء الامر كمخرب ثم انتميت الى حزبهم وتدرجت خلال فترة قصيرة الى مسؤلية الفرع الثاني سياسيا وعضوا في اللجنة المركزية .

**بەڵگەی دووەم :**

بسم الله الرحمن الرحيم

الجمهورية العراقية
مجلس قيادة الثورة
اللجنة العليا لشؤون الشمال ((سري للغاية))

العدد / ٦٨٤٦/٢٧
التأريخ / ٩٧٨/١٢/٧

منظومة استخبارات المنطقة الشمالية
م/ بيان رأى
كتابكم المرقم (٤٣٤٠) في (٢٩/ت١/٩٧٨) نرجو بيان رأيكم بصدد شمول المخرب عزيز محمود علي بالعفو من عدمه اعلامنا بالسرعة الممكنة

العقيد الركن
سعدون علوان مصلح
سكرتير اللجنة العليا لشؤون الشمال

**بەڵگەی سێیەم**

سري للغاية
مديرية الاستخبارات العسكرية
منظومة استخبارات المنطقة الشمالية
العدد/ س٢/ ق٨ / ٥٠٠٦
التاريخ/ ٢١/ك١/١٩٧٨

الى / سكرتارية اللجنة العليا لشؤون الشمال
الموضوع / بيان رأي
كتابكم السري للغاية ٦٨٤٦/٢٧ في ١٩٧٨/١٢/٧

١- الموما اليه مرلوغ وصلب ويحتمل للتحاقه بجانب العصـــاة بعـــد شموله بالعفو من خلال الاغراءات التي سيقدمها لـــه المخـــربين كونه عنصر مثقف ومؤثر ولندرة مثل هذه العناصر في صفوفهم .

٢- سيصبح شخص غير مقيد بعد اعفائه .
٣- ليس لديه ثقل عشائري في المنطقة .
٤- نقترح عدم شموله بالعفو .

يرجى التفضل بالاطلاع مع التقدير

المقدم
طارق زياده
مدير منظومة استخبارات المنطقة الشمالية

سرى للغاية

## قارەمانێتی شەهید عەزیز لەدوا بینیندا

حەمە چاوشین

لەگەڵ کاک عـەزیز مـەحمودا، مێژوویـەکی دووړو درێـژمان بەیەکـەوە بەسەربرد ، کەپڕ بوو لەبیرەوەری خۆش و بیرەوەری زۆرمان کاری خەبات بوو بۆ گەیشتن بەئاواتی رزگاری کوردستانو کامەرانی بۆ گەلەکەمان ، هاوڕێتی تەواومان وایکردبوو بڕوای بەهێزو پتەومان بەیەك بێت ، لەهەموو قۆناغەکانـدا لەیـەکمان نەپرسـیو بۆچوونەکانمان لەیـەك شـاراوە نـەبوو ، هەڵگری بیروباوەڕی کوردایەتی پێشکەوتوانە بووین، قسەی خۆشی لەکاتی چالاکییەکان و گێڕانەوەی هەواڵەکانداو نوکتـە جوانـەکانی هەمیشـە کۆڕو دانیشـتنەکانمانی دەگەشـاندەوە ، هـەر لەسـەرەتای ژیانیـدا ئـەرکی ژیـانی کـەوتبووە سـەر بـاجی خورشـیدی دایکـی، کـە ژنێکـی کـەم وێنـە بـوو ، بەنـەبوونیو دەسـت کـورتی بـەهێزی بـازووی قۆناغـەکانی خوێنـدنی پێـتەواوکرد ، ئەودایکـە ئـەو شـەهیدە دلێـرەی پێگەیانـد ، شـەهید عـەزیز ساڵی ١٩٧٤ لەپایزێکی درەنگدا هاتـەلامان لەگەڵ هـەڤاڵ (عومـەر فەتاح)دا لەپاوە کەشارۆچکەیەکی ئێرانە لەبەردەم دەرگاوە دەستی کرد بەپێکەنینو وتـی فریامکـەون دڵـدارم تووشـبووم ئـەژنۆم شـکاوە ، وتم جاریَ لەکوێتـە . رۆژێکی پڕ لـەبیرەوەریی خۆشبوو کەبەپێکـەنین بردمانەسـەر ، کەوتینە کار لەگەڵ کاك عومەردا خوازبێنییەکی سەرکەوتووانەمان بۆ کرد ، چەندین جار تووشـی دڵـە خورپـەو گاڵتـەو گـەپمان دەکـرد ، تـا دواجـار هەمووشـتێکی

برایەوەو باوکی سەبری‌خان رازی بوو ، لەخۆشیدا ژیانی ماموستا عەزیز لە نوێ نوسرایەوە ، ئەوەندەی تر دانیشتنی بۆ خۆش دەکردین ، لەپاداشتی هەوڵەکانماندا بـۆ خۆشـگوزەرانی ئـەو ، لـەو رۆژانـەدا کەئێمـە لەسـەر هەڵوێستی سیاسیمان هەمیشە لە ژێر چەوسانەوەیەکی زۆردابووین لەو دۆخـە ناخۆشـەدا ، لـەو قۆناغـەی خەباتیـدا شـەهید هـەڤاڵێکی چـالاکی رێکخــراوی کۆمەڵــە بــوو ، هەمیشــە لــەکاردا بــوو ، بــۆ بــەهێزکردن و بڵاوکردنەوەی رێبازی کۆمەڵەو رێکخستن ، بەسـەرهاتی کارەساتی کۆتایی خــەباتی چــەکداریی دوای ۱۹۷٥ ئەرکــەکانی سیاســی زۆر قــورس و بەرفراوانبوو، مـن و هـاورێی تێکۆشـەرم هەمیشە لەیەکەوە نزیک بـووین و لەیەک دانەدەبڕاین .

رۆژگاری پاش کارەساتی گرتنی هـەڤاڵانی پێشکەوتووی کۆمەڵە ، زەنگ لێدانی خەباتی توندوتیژو مەفرەزە سەرەتاییەکانمان و پێکهاتنی (ی،ن،ک) شەهیدان (جەمال تاهیرو عەزیزو شازاد سائیب) بۆ گەلێک لە هەڵسوڕاندنی کارەکان پێکەوە کارماندەکرد ، لەژیانمدا گەلێک تێکۆشەرم بینیوە کە ئەو هەڤاڵانە لەو سات و سەردەمە پڕ لەئەستەم و سەختەی گەلەکەماندا هەموو لایەنێکی گرتبووەوەو وەکو ماڵ کاولکردن ، گرتن ، لێدان و لەسێدارەدان شەهید بوون لەسەنگەری بەرگریدا .

ماموستا عـەزیز کاتــێ لای دوژمــن ئاشـکرابوو، چـاری نـەما دەبوایـە بڕۆیشـتایەتە دەرەوە، یـەکێك بـوو لەهـەرە تێکۆشـەرە بـەتواناو نـەترس و چالاکەکانی ناوشار ، پاش گرتن و لەسێدارەدانی هـەڤاڵ (جەمالە رەش) زۆر غـەمبار بـوو ژیـانی لێتێکچـوو چـونکە لەمناڵییـەوە پێکـەوە بـوون ، ئـەو سەردەمەش کاریان زۆر پێکەوە ئەنجام ئەدا ، پاش چوونە دەرەوەی و دوای

گەڕانــەوەی لەکاروانــە پــڕ کارەســات و نەهامەتییەکــەی (هــەکاری) بــۆ چاوپێکەوتن گەڕایەوە سلێمانی ، جوابی بۆ ناردم خێرا چووم بۆلای لەماڵی هەڤاڵ (حاجی عوسمانی مام ئیبراهیمی) تێکۆشەر بوو ، چەند شەوو ڕۆژێك پێکەوە کاتمـان بردەسەر، زۆرم لێ کـرد کەزۆر زوو بگەڕێتـەوە ، وتـی چـەند چەکێك شـك دەبـەم هەوڵئـەدەم بیـانکڕین و بگەڕێنـەوە، بـۆ شـەوی دوایـی چووبوو بۆ مـاڵی کەسـێك کەخۆی بڕوای پـێ بـوو ، شەهید عـەزیز شێوەی خەباتکردنی وابوو کە هەمیشە لایەنی سوعبەت و نوکتەی تـێ دەهاویشـت ، دوای دوو ڕۆژ حـاجی بەپەلــە هــات و وتــی عــەزیز گــیراوە ، زۆر هــەوڵ و تەقەلامانـداوە بـۆ ئـەوەی هـەوڵی بـزانین کـۆنترۆڵکردنی زۆر قـایم بـووە ، ناردبوویـان بـۆ کـەرکوك بـۆ ماوەیـەکی دوورو درێـژ هـیچ هـەواڵێکی وامـان دەســت نەکــەوت ، حــاجی عوســمــان کەهەمیشــە هاریکـاری دڵســۆزانەی کارەکانمانی ئەکرد بۆ شۆڕش، پێشنیازێکی بۆ کردم کە پیاوێکی عـەرەب هەیە لەموسڵ بەدەوڵەمەندی بەناوبانگە و ئازایە و بەعسییەکان خۆشـیان ئەوێت، وتی بچن بۆلای بیبینن، نەماندەویست خۆمان بچین و هەرچەندمان کرد کەسی وامان دەست نەکەوت کە لـەجیاتی خۆمـان بینێـرین ، لەبەرئـەوە خۆمـان چوین و ئـەو کەسەمان دۆزییـەوە ، وتمـان ئێمە کەسـوکاری نزیکـی ئـەوین مـاڵ و منـاڵی لەوپـەڕی ناخۆشـیان ، چـونکە بـێ سـەرو شـوێنە زۆر شوێن بەدوایدا گەڕاوین تەنیا ئەم سجنەی موسڵ نـەبێت ، ئەوکاتـە جێگـای لەسێدارەدانی کـورد بـوو . ئـەمانزانی پـاش گرتنـی هـەر هـەڤاڵێکمان دوای چـەند مانگێـك ئـەنێردرێت بـۆ موسـڵ ، ئـەمانزانی ماوەکـەی نزیکـە بـۆ سەرهەڵدانی ئەگەر لەسێدارەبدرێت ئەو کەسە بەدەنگمانـەوە هـات و بـەڵێنی داینێ تـا یـەك دوو ڕۆژ چاوەڕێ بین . کە بینیمانـەوە بەپەژارەیـەکی زۆرەوە

پێـی وتـین نـاوی گەیشـتووە بـەڵام خـۆی نـەهاتووە و مەرزوعەکەشـی تێگەیاندین کەلە لیستی سێدارەدان دایە ، بەدڵێکی گوشراو و نارەحەتو ناخۆشـەوە گەڕاینـەوە بـۆ سـلێمانی ، لـە ماوەیـەکی کورتـدا بروسـکەی مواجەهەی هات بۆ کەسوکاری ، ئێمەش لەگەڵ چەند هەڤاڵێکدا چووین بۆلای پاش عەزێتێکی زۆر بردیانین بۆ حەوشەی زیندانەکە ، لەگەڵ کاك عومەر فەتاح راوەستابووین کاتێکمان زانی شەهید بەروویەکی خۆش و پێکەنینـەوە دەستی کـرده ملمـان و لـەکاتی ماچکردنی یەکتردا بەگوێیدا چرپاندم کە کێ تووشی کردووە .

چـەند کەسـێکی زۆر هاتنـەدەرەوە کەهـەموویان ئامـادەکرابوون بـۆ لەسێدارەدان ، ئەوپەڕی ئازایەتی و مەردایەتیان لێ بەدیـدەکرا ، هـەموویان بەهۆی بینینی کەمی رۆژەوە سپی هەڵگەڕابوون ، زۆریـان هۆنراوەی جوان جوانیان وەکو بەرهەمێکی رۆژانی تەعزیب و خۆشەویستییان بۆ نیشتمان و شۆڕش و میللەت بۆ ئەوتین ، شەهید عەزیزمان تووڕەکرد بەوەی کەقافیـەی شـیعرەکەی ئـەو لەنگـە ، ماوەیـەك جێمـان هێشـت بـۆ ئـەوەی خێـزان و کەسوکاری لەگەڵیدابن ، چووینەلای تێکۆشەرانی تر لەسەربان و پەنجەرەی حەوشـەکە لـەژێر چاودێرییەکی توندا بـوو، شـەهید هاتـەوە لامـان وتـی دەسـتبکەن بـەگێرانەوەتانا پـارە دەرکـەن ، وتمـان دیـارە پیشـە کۆنەکەتـە کەپارەت لێ ئەسەندین بۆ سەیرانەکانی ئەحمەدئاوا و بیارەو پیرەمەگرون ، وتـی کوڕینـە وەرن سەیری ئەو دوو بـرا جوامێرەبکەن کە بادینـانین و ژن و منداڵـەکانیان دلوا لـەو دوو هـەژارە ئەکـەن کەماوەیـەکی زۆرە لـە زینـدانن و هیچیان پێ نییە، لێیان نزیك بوینەوە منداڵە بچکۆلەکان خۆیان هەڵواسی بوو بەسـەرو ملیانـدا دوو ژنەکـەو منداڵـە گـەورەکانیش دەگریـان بـەجلی شـڕو

شێواوەوە بێ ئەوەی دیارییەکیشیان پێ بێ بۆیان ، زۆر دوانمانن چونکە ئێجگار بێزار بوون دەریانخست کە پارەی گەڕانەوەیان پێنییە لەبەرئەوەی چیان پێ بووە لەبەردەم دەرگای زیندان لێیان سەندبوون ، بۆیە بەپەلە هەوڵێکی زۆرماندا پارەیەکی باشمان بۆ کۆکردنەوە و زۆر گەشانەوە ، تەنانەت دەیانوت چاکەتانمان لەیاد ناچێت ، بەتایبەتی دوو شەهیدەکە دەیانوت خودا چاکەتان بداتەوە، عەزیز وتی کە رۆشتنە دەرەوە بەدیقەت سەیری لای دەستە چەپ بکەن چەند ژوورێکی تێدایە براتان سبەینێ لەوێ هەڵدەواسرێت ، کەچوونە دەرەوە چوار ژوورمان بینی بەکەتیبەی ئەستوور دەرگاکانی داخرابوون ، چاومان بەقەنارەکان کەوت کەهەر قەنارەیەی (٧) قولاپ و (٧) پەت و (٧) کورسی لەلاوە بوو ، جۆگایەکی ئاویش لەژێریاندا ئەڕۆی ، دەورووبەری زەویەکە هەمووی دیاربوو ، پاشماوەی لەسێدارەدانی پێوەبوو بەدڵشکاوی گەڕاینەوەو پڕبەدڵ ئاواتمان ئەمانی ئەم رژێمە دڕندەیەبوو کەوا ئەم هاوڕێ ئازیز و تێکۆشەرەمانی لەم زیندانە زیندانیکردووەو دەیەوێت لەناویبەرێت .

# بیرەوەریەکانم لەگەڵ مامۆستا ((عەزیز مەحمود))ی نەمردا

سەلاح بایز
((لەندەن))

## ژینگەی لەدایکبوون و گەشەکردن :

گەرەکی دەرگەزێن یەکێکە لەگەڕەکە کۆنەکانی شاری سلێمانی ، بەشێك لەم گەڕەکە بە (سەرگۆڵ) ناودەبرێ ، لەناوەڕاستی سەرگۆڵدا . گۆڕەپانێکی شێوەبازنەیی هەبوو ، مامۆستا عەزیز لەیەکێ لەو ماڵانەدا لەدایکبوو ، پاش هەندێ دەستکاری یەکێك لەو خانووانەی هەتا ئەمڕۆش ماوە ، ئەو خانووەیە کە مامۆستا عەزیزی نەمری تیادا پەروەردە بووە . لەسلێمانیدا خەڵکی سەرگۆڵ بەتێکۆشەر ناسراون ، ئەم گەڕەکە چەندین سیاسەتمەدار و قارەمانی نیشتمانپەروەری تیادا هەڵکەتووە ، وەکو (شێخ شیهابی شێخ نوری و مامۆستا عیززەت رەشید ، مامۆستا موحەرەم موحەمەد ئەمین ، حەمە عەلی ، عوسمانی مەلا ، مامۆستا عەزیز مەحمود .. تاد) . نموونەی چەند شەهیدێکی ئەم گەڕەکەن .. خانەوادەی مامۆستا عەزیزی شەهید لەپێنج ئەندام (باوکی کاکە مەحمود ، دایکی دایە خورشید ، دوو خوشکی بەناوی نازەنین خان و نەسرین خان) پێکهاتبوو ، مامۆستای نەمر برای نەبوو بەڵکو تاقانەی خێزانەکەی بوو ، لەساڵی ١٩٦٤-١٩٦٥ دا ماڵەکەیان

گواستەوە گەڕەکی قاوەخانەی سەرچیمەن ، بۆ بەرامبەر ماڵی ئەنوەری مەجید سوڵتان .

دانیشتوانی گەڕەکی سەرگۆل لەناویەکدا تەبابوون ، پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ڕێزگرتن لەنێوانیاندا تابڵێی بەهێز بوو ، گەڕەکەکە خێزانێکی گەورەبوو ، ئەو خەڵکەی بەمیهرەبانی لەئامێزگرتبوو ، چاوهەڵهێنان و گەورەبوون لەژینگەیەکی وا یەککرتوودا یاریدەی شەهید و زۆر کەسی تریدا بۆ ئەوەی لەناوخەڵکدابن و هەربۆ خەڵکیش بژین .

<u>مامۆستاو من :</u>

مامۆستا (عەزیز مەحمود)ی ئەمر (١٠) ساڵ بەر لەمن واتە لەساڵی ١٩٤٣دا لەدایك بووە بەڵام هەمیشە وەك هاوڕێ و هاوتەمەنی خۆی مامەڵەی لەگەڵدا دەکردم.

هەر لەمنداڵییەوە بەمامۆستای ئەمرەوە پەیوەست بووم. هاتووچۆی خێزانیی گەرم لەنێوان ماڵی ئێمەو ئەواندا هەبوو. کورد گوتەنی یەك خێزان بووین ، بەڵام لەدوو جێ بووین. نەك هەر خودی مامۆستا بەڵکو خۆشەویستیی دایكو خوشکەکانیشی بۆ من مانایەکی گەورەی دەگەیاند . زۆر باش لەیادمە لەعەلومکەی بەریەلەدییەکە کەشاگردی ئەو بووم ، ئەو ماوەیە هاوکاری بووم ، چەندین کارو کاسبیمان بەیەکەوە کردووە ، لەنێشدا خۆی بەخاوەن ئیش دانەدەناو ئەو ماوەیەی بەیەکەوە بوین ڕەفتارێکی دڕێوم لێنەدی ، هیچ شێوەیەکی چەوساندنەوەم بەدەستەوە نەچێشت . ئەم وەسفە بۆ ئەو سەردەمە گەورەیی مامۆستا نیشان دەدات .

مامۆستا کوڕێکی قسەخۆش و نوکتەزان بوو، دەنگی گەورەو دلێر بوو. هەمیشە ڕووخۆش بوو، تووڕەبوون و گرژو مۆنی نەدەزانی. خۆشەویستی چواردەورەکەی بوو. تەواو ڕاستی دەپێکم ئەگەر بڵێم خۆشەویستی یەك بەیەکی گەڕەك و ئەو کەسانەی تریش بوو کەژیان و گوزەران بەیەکی دەناساندن:-

پاش تەواو کردنی قۆناغی دواناوەندی ، مامۆستا لەگەڵ هەندێ خوێندکاری گەڕەکەکە بوونە خوێندکار لەزانکۆی بەغداد . پاش دەرچوون بووە مامۆستای قۆناغی ناوەندی ، ساڵی ١٩٧٥ گەڕایەوە بۆ شاری ((عەزیزییە))ی سەر بەپارێزگای کوت . لەو ماوەیەدا، دووجار لەبەغداد مامۆستام بینی ، هەر لەو ماوەیەدا بوو کە مامۆستا ژیانی هاوسەری پێکەوەنا ، بەداخەوە منداڵیشی نەبوو ، دوای هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشی نوێخوازی گەلەکەمان مامۆستا عەزیزی ڕووناکبیرو بەهەڵوێست. بێ دواکەوتن پەیوەندی پێوەکردو بووە هاوڕێی پارتیزانە سەرەتاییەکان، لەم سەنگەرەدا مایەوە تاکۆتایی ژیانی .

ئەگەرچی دوور بەدوور هەواڵی مامۆستام دەزانی، بەڵام وەك جەستە لەیەك دابڕاین و یەکمان نەدیەوە، تا لەبەندیخانەی موسڵ لەژووری ئیعدام دا ڕوو بەڕوو دیمەوە .

## سەرەتای کارەساتی گیرانی مامۆستا :

ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆر ڕەش و شووم بوو ، کە تیایدا هەواڵی دەستگیرکردنی مامۆستامان بەدەستی ڕژێمی بەعس، پێ گەیشت ،

مامۆستا لەماڵێکدا دەستگیرکرا کە خاوەنەکەی سەر بەدەزگای ئەمنی رژێم بوو ، من بەشەخسی لەوە سەردەرناکەم کەچی ئەوی گەیاندە ئەو ماڵە و بۆ چارەنووسی بەم جۆرەی لێکەوتەوە ؟ گیران و بێ سەروشوێنکردنی یەکێ بوو دڵەڕاوکێی ئێمەو درێژەی کێشا تا رۆژێ لەناکاو، نامەیەک کە لەبەندیخانەی موسڵەوە نێردرابوو، بەدەست کەسوکاری درا ، لەو نامەیەدا هاتبوو کە مامۆستا لەبەندیخانەی موسڵەو بۆتان هەیە لەفڵانە رۆژو بەروارەدا چاوتان پێی بکەوێ ، نامەکە کەسوکار، خۆشەویستان و گەرمکی شێواند چونکە نامەکانی موسڵ بۆ خەڵکی کورد تاکە هەواڵێکی دەگەیاند کە خنکاندن بوو چ دەستبەجێ یان دواتر !

<u>یەکەمین دیدار:</u>

من شاهیدێکی راستگۆی ئەو رۆژەم کە بۆ یەکەمینجار مامۆستامان لەموسڵ بینی، نەک هەر لەخۆیەوە بەڵکو لەدەمی هاوڕێکانی ژووری ئیعدامیەوە، هاوڕێکانی کەوتنە باسی ورە بەرزیی، کۆڵنەدەریی، خۆڕاگریی و ئازایەتی مامۆستای نەمر، ئەوان هێندە شەهیدیان خۆش دەویست تا ئەو رادەیەی دەیانگوت، ژیانی ئێمە کاتێ هێورو روو لە ئاسایی بووە کە مامۆستایان هێناوەتە لامان ، بەهاتنی ئەم ، ژووری ئیعدامان بیر چۆتەوەو بەدەگمەن هەست دەکەین زیندانی و دەستبەسەرین چونکە مامۆستای زیندان بەدەنگە بڵندو قسە خۆش و نوکتەکانی کاتمان لەگەڵدا دەباتە سەر .

دیاربوو هەڵوێستو دڵە گەورەکەی مامۆستا لەو جێگە سامدارو نەگریسەدا بەهانای دەروونو جەستە زامدارو هاوڕێبازو هاوچارەنووسەکانیەوە چوو بوو .

لەو سەردانەدا باسی دادگاو بەندیخانەمان لێ پرسی ، وەڵامی وابوو: "پێیان گوتم حوکمەکەی تۆ خنکاندنە تا مردن، بەدوای خنکاندنیشدا لاشەکەت ، لەشوێنێکی نادیاردا، بۆماوەی (٢٠) ساڵ دەستبەسەر دەبێ، منیش بەگاڵتە پێکەنینەوە گوتم : (ئەی نابێ (٢٠) ساڵ بەند ببمو لەدوای (٢٠) ساڵەکە ئیعدامم بکەن؟ من ئەمەیان بەباش دەزانم) ، کاربەدەستانی دادگا نارەواکە بەجارێ رەنگیان تێکچوو. پلارەکەی من زۆر تووڕەیکردن، بەخێرایی راپێچی دەرەوەی هۆڵەکەیان کردمو پێیان گوتم : (تۆ چۆن غیرەت دەکەی لەهۆڵی دادگادا وا بڵێی؟) منیش گوتم: (ئەوەی ویستم کردمو گوتم ئێوەش ئەی نامرۆڤینە چ نامەردییەکتان لەدەست دێ دریغی مەکەن!".)

ئەمەش بەڵگەی خۆڕاگریی و بەرپەرچدانەوەی ئەو بکوژو دڕندانەیە لەدزێوترین شوێنیاندا !!.

<u>دوا دیدار:</u>

لەمارتی ١٩٧٩دا نامەیەك لەموسڵەوە بەدەست کەسوکاری مامۆستای نەمر گەیشت. لەنامەکەدا ئاماژە بەدوا زیارەت کرابوو بەڕاستی نامەیەکی رەزا تاڵ بوو هەمووومانی تاساند.

من رۆژێ پێش چاوپێکەوتنەکە خۆم گەیاندە موسڵو لەوێ لەبەشی ناوخۆیی لای کۆمەڵێ خوێندکاری دراوسێمان مامەوەو باس هەر باسی

ئیعدامو چۆنیەتی سۆراغ کردنی ئەو شوێنە بوو، کە ئیعدامکراوەکانی لێ دەشارنەوە.

ئەو خوێندکارانە زانیاری ئەوەیان دامێ کە گۆڕستانێك بەناوی گۆڕستانی "الشواف" هەیە تەرمی ئیعدامکراوەکانی تیا دەشارنەوە. ناوی ئەم گۆڕستانە لەناوی ئەفسەرێکی عێراقییەوە هاتووە، کەلەسەردەمی عەبدولکەریم قاسمدا ویستویەتی کودەتایەکی سەربازیی دژ بەقاسم بکات! بەلاّم نشووستی دێننو لەئاکامدا دەکوژرێنو بەرەو ئەم گۆڕستانە رادەکێشرێن. گۆڕستانی "الشواف" لەسەر ڕێگای "تەلەعفەر"ەو پێم وایە نزیکەی نیو سەعاتێ دووره. رەبیەیەکی سەربازیی، کە لەسەر گردێکی نزیکە، بەسەر گۆڕستانەکەدا دەڕوانێ . ئەم رەبیەیە بۆ ئەوە قوتکراوەتەوە تا چاودێریی گۆڕستانەکە بکات، وەك ئەوەی تەرمەکانیش بۆ ئەو ڕژێمە هەر جێی نیگەرانیبنو دەبێ چاوی هەر لەسەریانبێت !

بۆ بەیانی بەرەو بەندیخانەی موسڵ ڕۆیشتین، ژمارەمان زۆر بوو، ئەمە دوا دیدار بوو. ئەو ڕۆژە باران بەلێزمە دەباری، لێپرسراوانی ئەم بەندیخانەو قەسابخانەیە، دوو سەعات لەبەردەم ئەو بارانەدا ڕایانگرتینو هەموو جەستەمان تەڕبوو، ژمارەی زۆری ئێمە ناچاریکردن هەر هەموو پۆلیسەکان بەچەکەوە بکەنە پاسەوان، بەڵکو داوایان لەسەروو خۆیان کرد تا هێزی زۆرتریان بۆ بنێرن. چەند دوکانو چایخانەیەك نزیك بەوێ هەبوون خاوەنەکانیان سەر بە ڕژێم بوون، ئەوانیش بە هیچ شێوەیەك ڕێگەیان نەدەداین بچینە بەردوکانەکانیان بۆ ئەوەی بارانەکە کەمتر بمانشواتەوە، هێزی پۆلیس ئەو ناوەی تەنی. بارانو پاسەواڵو ئەو دوکانداره بێ بەزەییانە، هەریەکەیان بەشێوازی خۆی ئیهانەو، حەشریان پێ دەکردینو

باری سەرشانمانیان گرانتر دەکرد. بەمەشەوە نەوەستان، بەڵکو ئاگاداریانکردین کەدەبێ ئەو ناوە چۆڵ بکەین چونکە چاوپێکەوتن هەر بۆ خێزان، دایک، خوشک، براو ئامۆزایە. ئەوانەی رێگەیان پێ درا بچنە دوا دیدەنی بریتی بوون لەدایکو خێزان و دوو خوشک . (٢-٣) ئامۆزای شەهید ، هەرچەند ئەو هێزە هەوڵیاندا دوورمان بخەنەوە ، نەیانتوانی ، لەکاتی ئەم بەربەرەکانییەدابووین کە دەنگێکی گەورەو بەرز ، بێدەنگ و خامۆشی کردین ، ئەو دەنگە دڵێرە دەنگی مامۆستا عەزیز بوو ، هاواریکرد فاشیستینە، ترسنۆکینە دەمەوێ جەماوەری بەربارانەکە بکەنە ژوورەوە ، ئینجا کەوتە چرینی سروودی شۆڕشگێڕی ، دیمەنێکی وابوو مرۆڤ موچڕکی پیادا دەهات ، هەموو لەوەرەی پۆلایین و جەسووری ئەو واقمان وڕمابوو .

## هەوڵێکی سەرکەوتوو :

چاوپێکەوتنی کەسوکار کۆتایی پێ هێنراو، بەشێوازێکی زۆر ناشیرین، هەموومانیان لەو ناوە دەرکرد. ئەو خەڵکە دڵزامداروپڕ حەسرەتە بە ناچاری رووەو سلێمانی گەڕانەوە، من لەموسڵ مامەوە، بۆ ئەوەی سۆراغی لاشەکەی مامۆستای نەمر بکەم. شەو تا بەیانی هەر لەبیری ئەوەدا بووم چۆن سبەینێ ئەم کارە جێ بەجێ بکەم. ئەم گۆڕستانە چۆن بێ‌و ئاخۆ ئەو زانیاریانەی خوێندکارەکان دوێنێ شەو پێیان دام تا چەند راست بن‌و تا چەند بەکەڵکم بێن‌و زۆر لێکدانەوەی تری لەو جۆرە ! لەهەوڵی کۆکردنەوەی زانیاریدا لەوە حاڵی بووم کە زۆرجار پیاوەکانی رژێم لە ژێر پەردەی

تــاریکی شــەودا تەرمــەکان لەقەســابخانەکەوە بــەنهێنی دەبەنــە نــاو گۆڕســتانەکەو پــێش هــەڵهاتنی ڕۆژ کارەکــەیان تــەواو دەکــەن ، هــەروەها لەوەش گەیشتم کە کارگەیەکی گەچ نزیك بەگۆڕستانەکە هەیە . ژمارەیەك کرێکــار کــاری تێــدا دەکــەن ، ئــەوان کــەم تــا زۆر ئاگــاداری ڕووداوەکــانی دەورووبەرن! سەعات (٩)ی بەیانی ئۆتۆمبێلێکم بەکرێ گرتو بەرەو جێی مەبەست کەوتمەڕێ. بەشۆفێرەکەم گوت: دەمەوێ سەردانی فلانە گۆڕستان بکەم، ئەوە بوو تا بەردەمی کارگەی گەچەکەی بردم ، هەر خۆشی پرسیاری گۆڕستانەکەی لەکرێکارەکان کـرد ، گوتیان لەپشتەوەیە. شـۆفێرەکە منـی گەیانـدە گۆڕسـتانەکەو گەڕایـەوە بـەلای کاسـپی خۆیـەوە ، بـەم لاو ئـەولای خۆمدا ڕوانیم پیرەمێردێکم بینی و کەوتمە پرسیار کردن لێی. پیرەمێردەکە پاسەوانی بیناو شارەزای ئەو ناوە بوو ، ناوبراو ویژدان زیندو و پیاو چاك بوو، ماندووبوونی خۆی بۆ گێڕامەوە و لەدرێژەی قسەکانیدا پێـی گـوتم کـە: "ئەم بەیانییە بەئۆتۆمبیلێکی ڕەشی پیکابی دوو جەنازەی لـەوێ ناشتووەو ڕاسـتەوخۆش گـوتی: ئـەوەی تـۆ بەدوایـدا وێڵـی ئەوانەیـە"و پەنجـەی بـۆ ئارامگاکان ڕاکێشا، پیرەمێردەکە یان ڕاستتر بڵێم دەلیلەکە ڕاستی فەرموو، دڵنیا بووم کەئەو دوو گۆڕە یەکێکیان گۆڕی مامۆستایەو ئەوی تریان گۆڕی "شـەهید کـەمال"ە کـە دانیشـتووی شـاری هـەولێر بـوو ، لەگـەڵ مامۆسـتادا لەسـێدارە درابــوو، ئــەم "شــەهید کــەمال"ە هێنــدە ئەشــکەنجە درابــوو، ناونیشـانی کەسـوکاری لـە بیر چـووبۆوە ، بەداخـەوە تـا لەسێدارەدانیشـی کەسێکی نـەهات بەلایـدا ! پیـاوە بەساڵاچـووەکە خواحـافیزیی لێکـردمو منیش ڕاستەوخۆ گەڕامەوە بەرەو سلێمانی و هەواڵەکەم بەکەسوکار گەیاند. هاوکـات کـاك (حەمـەی وەسـتا عـەباس) کـەپورزای مامۆسـتا بـوو هـەروەها

(محەمەد فەرەجی) ئامۆزای وەك من مشوریان خواردبوو ئەوانیش بەهەمان ئاکام گەیشتبوون تەنانەت گۆڕەکانیشیان نیشانە کردبوو. لەبەر شپرزەیی کەس نەدەپەرژایە سەر کەس، نە من ئەوانم بینیبوو نە ئەوانیش منیان بینیبوو ! کێبەرکێمان دەکرد لەسەر دۆزینەوەی ئارامگای شەهیدانی ڕێگای سەرفرازی ، تۆقاندن ویستی کەس و کار و تێکۆشەرانی نەدەگلاند بۆ گەیشتن بەراستی سۆراغ و دۆزینەوەی جەستەی هەمیشە زیندوویان .

## دۆزینەوەو ساغکردنەوە:

ڕژێم نەیهێشت پرسەی بۆ دابنێین. بەنهێنی لەماڵی ئازەنین خانی خوشکی لەتووی مەلیك بۆی دانیشتین. بڕیاردرا هەرچی زووترە بە کۆمەڵ سەردانی گۆڕەکەی بکەین. بەرەو موسڵ بەڕێکەوتین و نزیك نیوەڕۆ گەیشتینە ئەوێ. کات بەهار بوو، زۆر بووین و بازنەیەکمان بەدەوری هەردوو گۆڕەکەدا دروستکرد ، بۆ ئەوەی تەواو دڵنیابین و بەجیا دەستنیشانیان بکەین. زۆریی ژمارەمان سەرنجی دوو پاسەوانەکەی سەرەوەی ڕاکێشاو ، هاتنە خوارەوەو گوتیان: "بۆتان هەیە فاتحە دابدەن و بەس، بۆتان نییە دەستکاری گۆڕەکان بکەن، دەنا تووشی کێشەی گەورە دەبن و ئێمە لەم گۆڕستانە بەرپرسیارین". ئەمەیان پێراگەیاندین و هەردووکیان گەڕانەوە شوێنەکەی خۆیان. پورزایەکی مامۆستا کەناوی کاك ئازاد شەپۆلەو برادەرێکی نزیکمە گوتی "دەبێ ساغیبکەینەوە کامیان مامۆستایە".

بۆ ئەنجامدانی کارەکە ڕێکەوتین، لەسەر ئەوەی بەجۆرێ ژنەکان لەیەکتر نزیك بخەینەوە دەستەی ناوەوە بەهیچ جۆرێ لەدەرەوە "واتە لای

رەبیەکـەوە" نـەبینرێ. ئینجـا داوامـانکرد هەرکەسـەو لـەجێی خۆیـەوە بەدەستبێ یان بەجام بکەوێتە گڵ لادان. کات کاتی نانخواردنی نیوەڕۆ بوو، رەبایەکە سەرقاڵی نانخواردن بوون‌و ئێمەش بە گورجیی خەریکی کارەکەی خۆمـانبووین ، ئـازاد لـەلای سـەرەوە و منیش لـەلای خـوارەوە دەبـوو سـەری شـەهید لەولایـەوە بـێ کـەمن کـارم تیـادا دەکـرد . کەچـی قاچـی شـەهیدی تیادەرکـەوت ، واتــە نێــژەرانی تــەرمی ئــەو شــەهیدانە بــێ گوێدانــە هــیچ رێورەسمێکی ئاینیش قوربانییەکانیان دەشاردەوە، لەکاتێکدا من سـەرقاڵی داپۆشینەوەی لای خۆم بووم کاك ئازاد گەیشتە سەر کفنەکەو کاتێ دڕانمان دەم و چـای مامۆسـتا دەرکـەوت ، خـوێنێکی زۆر چـاوەکانی داپۆشـیبوو ، بەخێرایی وەکو خۆیمان لێکردەوە ، من یەکەمجار بـوو کارەساتی لـەوجۆرە ببیـنم ، گریـانی کـاك ئـازاد نەدەوەسـتا بـەدایکی بووایـە هـەر ئـەو سـاتە تەرمەکەی لەگەڵ خۆیدا ببردایەوە بۆ سلێمانی ، هـەموو قووڵایی گۆڕەکە لـە (٤٠) سم تێپەڕی نەدەکرد . ئەم دیمەنە تا بڵێی گورجکبڕ بوو، کەسوکارو خۆشەویستانی ئـەو شـەهیدە نـەمرەی لەناخـەوە واهەژانـد پرمـەی گریـان سـەدای دایـەوەو گەیشتە رەبیەکە. چـەند سەربازێ، جارێکی تـر، هاتنـەوە خوارێ‌و گوتیان: ماوەی سەردان تەواو بووەو دەبێ بڕۆن .

هـەردوو گۆڕەکـەمان بـەووردە بـەرد دیـاری‌و نیشـانە کـرد. دوای ئـەوەی لەچارەنووسـی کـەم ژیـاوو کـەڵ ژیاوەکانمـان دڵنیـابووین ، بـەدڵێکی پـڕ لەغەم‌و پـەژارەوە بۆ لـە دەسـتدانی ئـەم قارەمانانـە بەناچاری ماڵئاواییمـان لەگیانی بەرزو لەگۆڕی دوورە کەس‌و خۆشەویستانیانکردو ڕێی سلێمانیان گرتەوەبەر.

## کۆتایی:

خوێنەری بەڕێز ئەم چەند لاپەڕەیەی خوێندتەوە دەربارەی مامۆستا عەزیز مەحمودی نەمر وشە بەوشەو دێڕ بەدێڕی زادەی چەند هەڵوێستو ڕووداوێکە کەنووسەرەکەی ڕاستەوخۆ لەگەڵیاندا ژیاوە، مەبەستی من لەم بەشداریو نووسینە ئەوەیە هەندێ بابەت بەخوێنەرو بە بەشداربووانی تر بگەیەنم، کە بە هەر هۆیەك بێ من بەتەنیا یان لەگەڵ چەند کەسێکدا کە بەپەنجەی دەست دەژمێردرێن ئاگادلریانم. ئەمەش بچووکترین وەفایە بۆ گیانی هاوپیشەی لاویمو مامۆستای ئایندەو شەهیدی سەربەرزی هەمیشە زیندوو دەریببڕم سەبووریيەك چەندە بچووکیش بێ بە دڵما گوزەرەدەکات بۆ یادی خۆیو بۆ گۆڕە دوورە جێو دەستبەسەرەکەی !

## شەهید عەزیز قوتابخانەیەك بوو بۆ وانەی کوردایەتی

ئازاد جەلال

پاش تێپەڕبوونی (٢٣) ساڵ بەسەر لەسێدارەدانی، شەهید مامۆستا عەزیز مەحموددا، کە لەقەسابخانەی فاشییەکان لەموسڵ لەسێدارە درا ، وا ئەمڕۆ لەسەر داوای بەڕێز شێخ محەمەد عەبدولکەریم سۆڵەیی، ئەم چەند دێڕە بۆ مێـژووی نەتەوەیـەك دەنووسـم کـە رۆڵەیـەکی جەربـەزەی وەکـو عـەزیزی پەروەردە کردووە .

مامۆستا عـەزیز ئەوەنـدە بیرەوەریـی لەلامـە نازانم لەکەی‌و لـەکوێوە دەست پێبکەم . عـەزیزی قارەمان‌و دڵسۆزو خۆبەختکـەری گەلەکـەی، مامۆسـتای رابەرو رێنیشاندەرو فێرکەری رێبازی کوردایەتی‌و نیشتمانپەروەریمان بوو ، ئێمـە قوتابیـەکی گوێڕایـەڵ‌و خۆشەویسـتی بـووین ، بۆیـە کـە لەلایـەن جەلادەکانی بەعسـەوە لـەناو شاری سلێمانیدا، دەسـتگیر کـرا .. بەڕادەیـەك شپرزەو سـەر لێشـێوا بـووین، لەهەڵپـەکردن‌و هـەڵس‌و کەوتەکانمانـدا بـۆ سۆراخی وەکو شێتمان لێهاتبوو.

ئێمەو هەموو خزمان‌و هاوڕێبازانی مامۆستا، کەوتینە هەڵپەو هەوڵدان، بۆ دۆزینەوەی بەپارەو بەرتیل ، بەڵام هەموو هەوڵـەکانمان بێ سود بوو، دوای شەش مانگ بێ سەروشوێنکردن ، دوای شەش مانگ ئازارو ئەشکەنجەدان، دوای شـــەش مـــانگ خـــۆڕاگریی، دوای ئـــەوەی جـــەلادەکانی ئـــەمن‌و ئیستخباراتی سلێمانی‌و کەرکوك‌و موسڵ نەیانتوانی وشـەیەکی پێبدرکێنن

، هەواڵی بڕیاری لەسێدارەدانیمان لەقەسابخانەکەی موسڵەوە پێگەیشت ، بەبیستنی هەواڵەکە چووین بۆ سەردان و بینینی .

<u>یەکەم سەردانمان :</u>

بەبیستنی هەواڵی ئەوەی کەوا لەقەسابخانەکەی موسڵە ، لەگەڵ کۆمەڵێ لەخزمان و هاوڕێیانی مامۆستادا، کۆبووینەوەو چووین بۆسەردانی ، ئای لەو رۆژە چەند خۆشبوو کە دوای شەش مانگ ونبوونی، لەبەندیخانەی موسڵ بەوپەڕی خۆشی و بەپێکەنینەوە هات بەپیرمانەوەو پێشوازییەکی زۆر گەرمی خۆ ئاسایی لێکردین ، ئێمە بەبینینی هەر هەموو دڵ پڕ لەگریان و چاو بەفرمێسک بووین. بەلام ئەو بەپێچەوانەی ئێمەوە ئەم بەپێکەنین و دڵی ئێمەی ئەدایەوەو ئەیوت : (ئەو رۆژە رێگای کوردایەتی و ئەم رێبازەم هەڵبژارد سوور دەمزانی ئەم رێگایەشم دێتەڕێ و دەمزانی کە رێگای خەبات و تێکۆشان بەگوڵ نەچنراوەو دوژمنانمان نازانن هێندەی شاخەکانمان سەرسەختین و ، دەیان بەڵکو سەدانی وەکو من سێدارەکانیان شەرمەزار ئەکەن. ئێمە وا ئەڕۆین و داوام لەئێوە ئەوەیە رێگاکەم بەرنەدەن و درێژە بەخەباتتان بدەن بۆ تەواو کردنی رێبازەکەمان) ، دوای ئەوانەوە کەوتینە پرسیار کردن لەچۆنێتی گرتنی و ئەشکەنجەدانی .

وتی : (حکومەت و دام و دەزگاکانی هەموو زانیارییەکیان، لەڕێگای خۆفرۆشە کوردەکانەوە، بەناوی نهێنی پێشمەرگایەتیشمەوە لاەبوو دەیانزانی ، هەرچی جۆرو شێوەی ئەشکەنجە هەیە لەگەڵما بەکاریانهێناوە. خۆم هەڵنانێم بەلام سوپاس بۆ ئەو بیروباوەڕەی کە پێی پەروەردە کرابووم ،

نەیانتوانی یەك وشەو یەك زانیاریی لەمن وەربگرن و سوودی لێوەربگرن) ، هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: (ئەو کەسەی منی بەگرتدا، ئەو شتانەی لەسەر منی زانیبوو هەر هەمووی دابووە دەزگاکانی حکومەت ، پیاو هەق بڵێت ئەوەندە بەدڵسۆزی بۆ حکومەت کاریانکردبوو، حەزیاننەکردبوو وشەیەك لەبیر بکەن و نەیدەنە دەزگا سیخوڕییەکەیان ...)
لەو سەردان و مواجەهەیەدا لەسەر قسەی مامۆستا خۆی بۆمان دەرکەوت کە کێ بەگرتیداوەو چۆن گیراوەو چیی پێکراوە .

<u>سەردانی دووەم:</u>

لەم مواجەهەیەدا، مامۆستا وەکو پیشەی هەمیشەیی جارێکیتر بەڕووە خۆش و دەمبەپێکەنینە خۆشەکەیەوە، پێشوازی لێکردین و لەو زیندانە ناخۆشەی موسڵدا، بە ورەیەکی بەرزو گەشبینانەوە باسی بەندیخانەو شێوازەکانی ئەشکەنجەی بۆ دەکردین، دەیویست پێمان بسەلمێنێت کە تێکۆشەران، لەهەموو جۆرە ڕێگایەکی دڕندانەی فاشیەکان بەتوانا ترو بەهێزترن ، لەم سەردانەدا، نامەیەکی نووسیبوو، خستبوویە بنی پاکەتێکی جگەرەوە، بەنیازی ئەوەی لەناو ئەو پاکەتەدا، ئەو نامەیە بگاتە دەرەوەو بگاتە دەستی برادەران. پاکەتە جگەرەکەی لەگەڵ یەکێك لەپاکەتەکانی بەرنەمی میوانەکاندا گۆڕیەوەو ئازەنینی خوشکی و کاك یونسی مامی و (کاك عومەر فەتاح) کە لەو سەردانەدا لەوێبوون. ئاگاداری کردنەوە کە لەو پاکەتەدا نامەیەکی تیادایەو بۆ دەرەوەی نوسیووە ، لەراستیدا من هەر ئەوەندە لەبارەی ئەو نامەیەی ناو پاکەتەکەوە دەزانم ، ئاگاداری ناوەڕۆکی

نامەکەو بۆ کوێ نووسرابوو نیم و زانیاریم لەسەری نییەو ئەو کەسانەی ناوم هێناون لەناوەرۆکی نامەکە ئاگادارن .

**سەردانی سێیەم و هەوڵێکی حکومەت :**

جارێکیتر ، کەوتینەوەرێ بۆ ئەو شاری موسڵەی، کە بوو بووە قەستی سەری ماموستاو ئەمجارەش هەرچووینە ژوورەوە ، بەهەمان شێوەی جاران و بەپێکەنین و قسەی خۆشەوە هات بەپیرمانەوەو پێشوازی گەرمی لێکردین ... موسڵ شارێکە لەشارە خۆشەکانی عێراق، بەڵام لەوکاتەوەی کە بوو بە شاری جەلادان و ماموستایان تیایدا لەسێدارەدا ، لام ناخۆشترین و قێزەونترین شارە، حەزناکەم بەرێرەویش پیایدا گوزەر بکەم .

چوونی ئەمجارەمان جیاواز بوو لەجارەکانی تر ، هەر گەیشتینە ناو بەندیخانەکەو نەختێ حەواینەوە، ماموستا پێی وتین دامو دەزگاکانی رژێم بە بەرێوەبەری بەندیخانەکەیان وتووە قسەم لەگەڵدا بکات . پێیان وتبوو، خوشکەزایەکی (ئەحمەد حەسەن بەکر) سەرکۆماری ئەوکاتە، لای پێشمەرگە گیراوە ئەگەر پێشمەرگە ئەو بەربدەن ئەمانیش من بەربدەن، بۆ بەدواداچوونی ئەم قسەیە ، پەیوەندیمان بەبەرێوەبەری بەندیخانەوە کردو ئەویش دوای پەیوەندیکردن بە دەزگاکانی سەرو خۆیەوە، رەزامەندیان نیشاندا، کە بەگۆڕینەوە لەگەڵ خوشکەزای (ئەحمەد حەسەن بەکر)دا ماموستا بگۆڕنەوە ، خزمان سەبریەخانی خێزانی و منیان لەبەر منداڵی هەڵبژارد، بۆ بەپیرەوەچوونی ئەو کارە، هەرچەند لەخزمان و برادەرانی ماموستا خەڵکی تری خۆبەخش و چاونەترس هەبوون کە ئامادەیی خۆیان

نیشـاندا ئـەو ئەرکـە بگرنـە ئەسـتۆ، بـەڵام لەبـەر بـارودۆخی ئـەمنی و بـۆ سەلامەتی برادەران ، منیان بە پەسەند زانی لەگەڵ سەبریەخاندا ئەرکەکە ئەنجام بدەین .

هەر ئەو ڕۆژە دەزگاکانی ناو بەندیخانەو دەرەوەی حکومەت پەیوەندییان بەدەزگای ئیستخباراتی قەڵادزێوە کردو ناوی ئێمەیان دانی و ئێمەیان خستە ڕێ بۆ قەڵادزێ، ئێمە بەڕێوەبووین ئیستخباراتی قەڵادزێ پەیوەندیی بەئاخر رەبایەی سەر سنووری قەڵادزێوە کردبوو . لە ئیستخباراتی قەڵادزێ بەئێمەیان وت نابێ بەیەك کەس بڵێن بۆچی ئەچین بۆ ئەودیو و لەئیستخباراتی عەسکەریی قەڵادزێوە، بە ئوتومبێلی خۆیان ئێمەیان بۆ دوا رەبایەی سەر سنوور رەوانە کرد .

هەر گەیشتینە لای رەبییەکە ئەفسەرێك هات بەپیرمانەوەو بردیتیە ناو رەبییەکەوە، چەند ئامۆژگارییەکی کردین لەوانە وتی ئێمە هەموو رەبیەکانمان ئاگادار کردووە کەتا ماوەی (٥) ڕۆژ هەرکەسێ هاتووچۆی کرد لەو ناوچانەی کەپێیان ئەوت (موحەڕەمە)و لەژێر دەستی پێشمەرگەدا بوو، تەقەی لێنەکەن، تا ئێمە دەچین و دەگەڕێینەوە.

لەقسەکانی ئەفسەرەکەدا ئەوەم بۆ دەرکەوت، کە ئەو نەیدەزانی ئێمە چین بۆچی ئەچین بۆناو پێشمەرگەو دەگەڕێینەوە، تەنها ئەو ئەوەندەی پێسپێردرابوو، کە ئەو ڕێگایە بۆ ئێمە دابین بکات بۆ ڕۆیشتن و هاتنەوەمان ، دوای قسەکانی ئێمە لەگەڵ چەند سەربازێکی مغاویردا ئێمەی ناردە خوارەوەو لەگەڵماندا هاتن ، تا سەر ڕێگا خۆڵەکەو ئێمە بە ڕێگا خۆڵەکەدا کەوتینەڕێ و ئەوانیش گەڕانەوە بۆ شوێنەکەی خۆیان ، ماوەیەکی باش بەپێ بەو ڕێگایەدا ڕۆیشتن هەرچەندە ڕێگاکە سەخت و ناخۆشبوو، بەڵام

هەستمان بەماندوبوون نەدەکرد . لەبەرئەوەی دڵمان خۆشبوو ، کەمامۆستا بەگۆڕینەوە بەردەدرێت و دڵنیابووین لەوەی بەڕێز( مام جەلال) بەداواکە قایل دەبێت و بڕیار لەسەر گۆڕینەوەکە دەدات.

باش لەیادمە لەو ڕێگا چۆڵە کەسمان تووش نەبوو، تەنها بەڕێکەوت لووتمان بوو بەلووتی شوانێکی منداڵەوە، بەناچاریی لەبەرئەوەی شارەزانەبووین و کەسی تریشی لێ نەبوو، لێمان پرسی کاکە سەرکردایەتی یەکێتی لەکوێیە؟ پێش ئەوەی شوێنەکەمان پێ بڵێت وتی ئێوە لەکوێوە هاتوون و سەرکردایەتیتان بۆچییە؟ وتمان لەقەڵادزێوە هاتووین و دەچین بۆ سەرکردایەتی و ئیشمان هەیە. پاش ئەوەی تۆزێ ڕاماو بەجل و بەرگەکەمانیدا ڕوانی، دیاربوو کە گەیشتە قەناعەتێ گومانی لێمان نەما، بۆیە وتی وەرن و پێشمان کەوت تا بردینیە لای کۆمەڵێ پێشمەرگە، پێشمەرگەکانیش ئێمەیان گەیاندە بارەگای بەڕێز( مام جەلال) لەوێ من و سەبریەخان چاوەڕوانی(مام جەلال )مان دەکرد. کاتێکمان زانی بەڕێزی پەیدابوو، چاومان پێیکەوت و ڕاسپاردەکەمان بۆ مەسەلەی گۆڕینەوە بۆ باسکرد، بەڕێزی وتی: (من بۆ گۆڕینەوەی عەزیز گومانم لەقسەکانی حکومەت هەیە. دەنا نەك ئەو خوشکەزایەی (ئەحمەد حەسەن بەکر) کێی تریش لامانگیراوە لەبەرخاتری عەزیز بەریانئەدەین و ئەیاندەینەوە ئەوان ئەگەر ڕاست دەکەن عەزیزمان بۆ ئازاد بکەن ، بۆ دڵنیابوون و متمانەی حکومەت، کە تێبگەن و بزانن ئێمە بەڕاستمانە، کە گەڕانەوە لەگەڵ خۆتاندا ئەو (ئەندازیار)ە میسرییەی لەگەڵ ئەو خوشکەزایەی ئەحمەد حەسەن بەکردا گیراوە ببەنەوە. کە ئەویش ئێستا لامان بەندە .. بۆ ئەوەی بزانن کەئێمە نیازمان پاکە بۆ گۆڕینەوەی لەگەڵ مامۆستا عەزیز !) .

ئێمەش زۆر بەخۆشیەوە سوپاسی بەڕێز (مام جەلال)مان کرد، بۆ ئەو هەڵوێستەی ، سەبریەخانی نارد بۆلای (هێرۆخان) کە تازە لەدیوی ئێران گەڕابۆوە. منیشی نارد بۆلای (کاك نەوشیروان) کە بارەگاکەی لەوبەرەوە بوو. شەو لەوێ مامەوە، بۆ بەیانی کاك نەوشیروان ناردی خوشکەزاکەی ئەحمەد حەسەن بەکریان هێنا کابرایەك بوو بەجلی سەربازییەوە، کە هێنایانە ژوورەوە ، وتی ئەمە ئەو کابرایەیە ، کابرا هەر هاتە ژوورەوە، بەبێ هۆ دەستی کرد بەگریان و پاڕانەوە. کاك نەوشیروان پێیوت : (ئەوە بۆ ئەگریت لێماندەوی، ئازارماندەوی ئەم لووشکە لوشك و گریانەت لەچییە؟ قارەمانەکانی ئێمە پاش ئەو هەموو ئەشکەنجەو لێدانەی ئێوە لەبەندیخانەکانی موسڵ و شارەکانی تر دلێرانە رادەوەستن و خۆرادەگرن و گاڵتە بە ئازارو ئەشکەنجەکانتان دەکەن. کەچی تۆ بەبێ ئەوەی کەس دەستی یان زللەیەکی لێدابی، یان قسەیەکی پێوتبیت، بەبێ هۆ دەگریت ؟ عەیبە عەیب، مەگری ئینجا وتی بیبەنەوە بۆ شوێنەکەی خۆی) .

هەر ئەو رۆژە، دەستەیەك پێشمەرگەی لەگەڵدا ناردین و بەڕێیان کردین تا ئەو شوێنەی کەلەژێر دەسەلاتی پێشمەرگەدا بوو ، کابرای ئەندازیاریشمان لەگەڵدا بوو. بەو رێگایەدا بەرەو ئەو شوێنەی لێوەی هاتبووین کەوتینەڕێ، گەیشتینە نزیکی رەبایەکە سەرباز چواردەوریان داین، بردیانین بۆلای کابرای ئەفسەر، ئەویش بەلاسلکی ئیستخباراتی قەلادزێی ئاگادار کردو ئەوانیش ئوتومبێلیان بۆ ناردین، بە ئۆتۆمبێلەکە بردیانینە ناو قەلادزێ، تا شار لانکرۆزەرێکیان بۆ هێناین و ئێمەیان سوار کرد ، یەکسەر بۆ (ئەمنی کەرکووك). ئەوانیش هەر بەگەیشتنمان سواری ئۆتۆمبیلێکیان کردین و ناردیانین بۆ کۆشکی کۆماری، ئەو ئۆتۆمبێلەی ئێمەیان پیادا نارد بۆ

بەغدا حەز دەکەم بزانرێت کە لەهیچ بازگەیەك رانەوەستا تا ناو کۆشکی کۆماریی . پاش ئەوەی بەسەر دوو سێ سکرتێردا رۆیشتین ، بردیانین تا گەیشتینە یەکێك لەژوورەکانی کۆشك و بەڕێوەبەری ئەو شوێنە هات و ئێمەی بینی و پێی وتین، ئەوان رازین بەگۆڕینەوەکە ، بەڵام دەبێ سەید نایب کە ئەوکاتە (سەدام حسێن) بوو، رازی بێت، ئێوە بڕۆنەوە ئێمە ئاگادارتان دەکەینەوەو ئیتر ئێمە گەڕاینەوەو چاوەڕوانی وەڵاممان دەکردو دڵمان خۆشبوو کە مامۆستا بەگۆڕینەوە رزگاری دەبێت .

ئێمە رازی بووین بەوەی، ئەگەر بەریش نەدرێت، حوکمی ئیعدامەکەی بۆ بکرێتە ئەبەدی بمێنێت و نەکوژرێت، بەڵام پاش چەند رۆژێ کاتێکمانزانی دوانامەی ئەوەمان پێگەیشت، کەتیا ئاگادار کرابووین بچین بۆ دوابینینی مامۆستا، چونکە بۆ بەیانی لەسێدارە دەدرا، وەکو هەواڵمان زانی و پێیان راگەیاندین کەسەید النائب (سەدام حسێن) بەو گۆڕینەوەیە رازی نەبووە.

ژمارەیەکی زۆر لەخزم و کەس و کارو هاوڕێیانی مامۆستا بەرەو موسڵ کەوتینەڕێ. گەیشتینە بەردەرگای بەندیخانەکە ، دەرگای بەڕێوەبردنی بەندیخانەکە ژمارە زۆرەکەی خەڵکەکەی بینی و سەیریانکرد، ناتوانن کۆنترۆڵی بەردەرگاکە بکەن، داوای پۆلیس و هێزی تریانکرد ، بۆ یارمەتیدان و دوورخستنەوەی خەڵکەکە . بڕیارێکیشیان دەرکردو پێیان راگەیاندین جگە لەدایك و خوشك و براو ژن و خزمی دەرەجە یەکی نەبێت نابێت کەس بچێ و ببینێت .. کاتێ دایکی و نازەنین و نەسرین و سەبریە چوونە ژوورەوە بۆلای، بەکەلەپچەکراوی بینیبویان، دەستیان بەگریان کردبوو، (پێی وتبوون مەگرین و نابێت بگرین کەلەپچەو پەت ئەکرێتە

دەستو پێی پیاو ، منیش کوڕو براو هاوسەری ئێوەمو بەپێکەنینەوە وتبووی پیاوم پیاو عەزیزم عەزیز قبوڵ ناکەم کەستان بگرین) .

سەعاتەکەی دەستی کرد بەدیاریی بۆ جیهانی نازەنینی خوشکی و سەردان‌و مواجەهەی تەواو بوو. لەژێر لێزمەی باراندا ئەو شارەمان بەجێهێشت. بۆ ئەوەی بزانین لەکوێ دەنێژرێت ، بەنهێنی (حەمەی وەستا عەباس) و (حەمە فەرەج) لەلایەکەوە و (سەلاح باین)مان لای (جەمال ئەحمەد بچکۆل) پەشتەوە، لەلایەکی ترەوە ئەمانە بۆ ئەوەی چاودێری بکەن بزانین کەبەیانی لەسێدارە دەدرێن، دەیبەن بۆ کوێ‌و لەکوێ دەینێژن، هەر بەهۆی ئەمانەشەوە توانرا بزانرێت لەکوێ نێژراوە .

## مامۆستاو هەڵوێست

## هەڵوێستی یەکەم پێش گرتنی :

مامۆستا بەوپەڕی چاونەترسییەوە، بە بەردەوامی بەبێ گوێدانە داموو دەزگا سەرکوتکەرو دڕندانەکانی ڕژێم ڕۆژانە لەجێبەجێکردنی چالاکی‌و کاری سیاسیدا بوو ، ڕۆژانە لەناو شاری سلێمانی‌و ، ئێواران دەگەڕایەوە بۆ ماڵی (نەسرین خان)ی خوشکی لەسەرچنار .

ئێوارەیەك پێی وتم (ئوتومبێلێکم بۆ پەیداکە دەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ سەرچنار).. منیش ئۆتۆمبێلی برادەرێکم بۆ پەیدا کردو ئەوکاتەی خۆی دەیویست، بەو ئوتومبێلە بردمەوە بۆ سەرچنار .. من‌و برادەرەکەم لەپێشەوەو ئەویش لەدواوە سواربوو، گەیشتینە دوڕیانەکەی سەرچنارو کاتێکمانزانی (مولازم موحسین) بە مەفرەزەیەکەوە پەیدابوو، دابەزین بۆ

ئەوەی سەیتەرە دابنێن ، من هەستم بەمەترسیی کردو ئاوڕێکم بۆ دواوە بۆلای مامۆستا دایەوە ، بەوریاییەکەی خۆی لە ئاوڕەکەم گەیشت‌و چاوەی خوێندەوەو بەبێ ئەوەی بیەڵێ من هیچ قسەیەك بکەم وتی خەمت نەبێ‌و خۆت تێکمەدە هەویەم پێیەو مەترسە ، رێکەوت وابوو کەئێمە گەیشتین هێشتا سەیتەرەیان دانەنابوو، دەیانویست سەیتەرە دابنێن‌و تەواو دانەمەزرابوون ، لەو نێوانەدا ئێمە بەبێ پرسیارو راوەستانی ئوتومبێلەکەمان رزگارمان بوو .

## هەڵوێستی دووەمی مامۆستالەناو بەندیخانەدا :

دوو پێشمەرگەی (ی.ن.ك) لەدەوروبەری هەولێر گیرابوون، هەردوو پێشمەرگەکە برابوون . حوکمی لەسێدارەدانیان درا بوو بەسەردا. هەموو جار کە ئەچووین بۆ مواجەهەی مامۆستا ئەمان بینی ئەو دووبرایە ، هەر جارە دایکەکەیان یان باوکەکەیان دەهات بۆلایان‌و کەسی تر نەدەهات بۆ مواجەهەیان. جاری وابوو باوکەکەی پێش ئەوەی مواجەهە تەواو ببێت بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە دەستی ئەکردە ملی کوڕەکانی، بەبێ دەنگی‌و فرمێسك بەڕیشە سپییەکەیدا دەهاتە خوارەوە دەڕۆیشتە دەرەوە. دوای یەکێك لەمواجەهەکان مامۆستا کوڕەکانی بانگکردبوو. پێی وتبوون پێم ناڵێن ئێوە بۆچی هەموو جارێ دایك‌و باوکتان بەیەکەوە نایەن بۆلاتان‌و هەر جارەی یەکێکیان دێت ، کوڕەکان لەوەڵامدا بەمامۆستایان وتبوو راستت دەوێت ئێمە خێزانێکی هەژارین .. دەرامەتمان نییە بۆیە دایکمان‌و

باوکمان توانایان نییە لەبەر کرێی ئوتومۆبێل و هاتنیش پارەی دەوێت بۆیە کردوویانە بەنۆرە هەرجارە یەکێکیان دێن .

کاتێ بۆ مواجەهە چووینەوە بۆلای مامۆستا، هەر گەیشتینە لای و حەواینەوە کاک یونسی مامی بانگکرد . رایسپارد کەپارە بۆ ئەو خێزان و دوو کورە لەوانەی کەهاتبوون بۆ مواجەهە کۆبکاتەوە ، کاک یونسیش دەستبەجێ راسپاردەکەی مامۆستای جێبەجێ کردو پارەیەکی بۆ کۆکردنەوەو مامۆستا بۆی بردن ، دوای ئەوە هەمووجار دایک و باوکەکە بەیەکەوە دەهاتن بۆ مواجەهەی کورەکانیان، ناوی یەکێکیانم لەو دوو برایە لەیادماوە ناوی (ئازاد) بوو. ئازاد تەمەنەکەی ئەوەندە بچووکبوو، نەدەکرا ئیعدام بکرێت بەپێی یاسا. بەڵام ئەو دڕندانە موالیدەکەیان گۆڕیبوو تەمەنیان گەورەکردبوو بۆ ئەوەی ئیعدام بکرێت .

# هاوسەری شەهید عەزیز و چەند حەسرەتێك

سەبریەی عارف ئاغا

## سەرەتای یەکترناسینمان:

ساڵی ١٩٦٨ لەبەشی کوردیی کۆلیژی زمان لە زانکۆی بەغدا وەرگیرام، ژمارەی خوێندکارەکانی ئەو ساڵەو بۆئەو بەشە نزیکەی (٩٠) خوێندکار بوو. کە خوێندکاری شارەکانی سلێمانی، هەولێر، دهۆك و خانەقین و ئاکرێ و رواندزو بەغدای تیادا بوو. کاتی دەرامکردن خوێندکارەکانی پۆلەکەمان لەبەشەوە بەسەر دوو گرۆپدا دابەشکران ... گروپەکەی منی بەرکەوتم (٤٤) خوێندکاری بەرکەوت ... نزیکەی(١٤ )خوێندکاری کورو کچی خەڵکی سلێمانی بوون... لەبەر ئەوەی یەکەم ساڵی زانکۆو بەغدامانبوو، پەیوەندییەکی توندو تۆڵ لەنێوانی خوێندکارەکانی سلێمانیدا هەبوو .. یەکێك لەو خوێندکارانەی کە لەگەڵماندا بوو شەهید (عەزیز) بوو...

عەزیز لەناو خوێندکارەکاندا ، لەزۆر شتدا خۆی جیا کردبۆوە، ئەویش بەوەی کەسێکی رووخۆش و قسەخۆش و کراوەو هەردەم دەم بەپێکەنین بوو، زوو دەچووە دڵەوە،بۆیە هەر زوو لەیەکتر نزیکبووینەوەو لەکاتی حەوانەوەو وانە شاغیرەکاندا بەزۆریی لەکافتریای کۆلێژەکەمان لەگەڵیدا دادەنیشتین ، ئەوانەی کە حەزمان دەکرد، وەکو عەزیز لەگەڵماندابن، کاك شێخ محەمەدو کاك ئەنوەر مەحمود و کاك بورهان شەرعی و کاك هیوا و

نوری حەیران بوون... هەر لەسەرەتای یەکتر ناسینمانەوە لەنێوانماندا، شتێك دروستبوو. ساڵی ١٩٦٩ بەمەبەستی بینینی شوێنەوارەکانی سامەڕا، سەیرانێکمان بۆ سامەرا کرد. هەردوو پۆلەکەو چەند خوێندکارێکی تر لەپۆلەکانی تریش لەگەڵمان هاتن. لەو سەیرانەدا.. هەردووکمان پەیوەندییەکی خۆشەویستی لەنێوانماندا دروستبوو .. بەلام نە ئەو قسەی لەگەڵدا کردمو نەمنیش خۆم ولنیشاندەدا کە خۆشم دەوێ ... بەلام لە دانیشتن و سەیرانەکاندا، هاوڕێکانمان هەستیان پێ کردبووین. بە تایبەتی دەستە خوشکەکانمو کاك شێخ محەمەد چونکە ئەو هیچی لەو نەدەشاردەوەو منیش لای چەند دەستە خوشکێکی خۆم قسەمکردبوو.

ساڵی ١٩٧٠ رۆژێ لەکۆلێژ داوای لێکردم کە پیاسەیەکی لەگەڵدا بکەم .. لەپیاسەکەدا مەبەستی دڵی خۆی بۆ هەڵڕشتم ، ئەوەی درکاند کە خۆشیدەوێمو دەیەوێت دوای تەواوکردنی خوێندن بمکاتە هاوسەری خۆی ... منیش قسەکانیم بەشتێکی سەیر نەزانی و دەمێك بوو چاوەڕوانیم دەکرد، کەخۆی یان یەکێك لەهاوڕێکانی من یان ئەو ... ئەو قسەیەم لەگەڵدا بکەن .. هەر ئەو رۆژە بەڵێنمان بەیەکتری داو بەبێ ئەوەی هیچمان هیچ مەرجێ بۆ یەکتر دابنێین . ئیتر لەهەموو سەفەرەو سەیرانەکاندا ئەو و شێخ محەمەدو کاك ئەنوەرو کاك بورهان لەگەڵ ئێمەدا خواردنیان دەکرد . ئێمەش من و گێلاس و نەرمین میرزا قادر بووین .

## هاوڕێکانی لەکۆلێژو دەرەوەی کۆلێژدا :

عەزیز ـ بەزۆریی هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئەم کەسانەدا بوو، لەناو کۆلێژو دەرەوەی کۆلێژ :
(شەهید یاسین ئەنوەر، ئەنوەر مەحمود، شێخ محەمەد، بورهان شەرعی، سوعاد ساڵح، نەرمین، گێلاس، رووناك مەحمود، خەرامان، سەرگوڵ غەریب، پەخشان جەلال، ئەرسەلان بایز، ئەحمەد ساڵح، عوسمان خەزنەوی، نوری حەیران، شیرین نوری، پرشنگ خان، شازاد سایب، شاسوار جەلال، فازڵی مەلا مەحمود، فازڵ تەیب، ئەمیری بەکری قەساب، سالار عەزیز، بەهادین، نەریمان.. وەکو بزانم بەداخەوە هەندێ لەوانە شەهید بوون. (یاسین، نەریمان، شاسوار، فازڵی مەلا مەحمود، شازاد) کە هەر یەکەیان لەبۆنەیەك و لەرۆژگارێکدا شەهیدبوون... عەزیز کەسێکی زۆر خۆشەویستبوو لەناو هاوڕێکانیدا . لەو کەسانە بوو .. نەتئەتوانی لێی دووربکەویتەوەو وازی لێ بهێنیت ، زۆر پەرۆشی کوردو کوردستان بوو.. هەموو شتێکی لەرزگاریی کوردو کوردستاندا دەبینیەوە ... زۆر هەوڵیدەدا کە منیش وەکو ئەو لەسیاسەتدا کار بکەم بەلام ملمنەدەداو قایل نەدەبووم، هەمووجار پێم دەوت تۆ چی دەکەیت بیکە بەلام لەو بارەیەوە واز لەمن بهێنە.

## تەواوکردنی کۆلێژو دامەزراندن و دابڕا نمان لەیەکتر:

ساڵی ۱۹۷۲ کۆلێژمان تەواو کرد. عەزیز چوو بۆ سەربازیی .. لەکەرکووك و بەغدا. منیش لەماڵەوە دانیشتم و ئەو ساڵە دانەمەزرام. لە ۱۹۷۳/۱۰/۳ بە

(معلم جامعي) دامەزرام. نێردرامە قوتابخانەی شاهۆی سەرەتایی لەقەزای هەڵەبجە .

ئەو ساڵە کەئەو سەرباز بوو من لەماڵەوە بووم . کەم کەم یەکترمان دەبینی، جار جارە بەهۆی (حەمەی) برامەوە، کەبوو بەهاوڕێی و ئێمە ماڵمان لەگەڕەکی گۆیژەو ئەوان ماڵیان لەگەڕەکی سەرگۆڵ بوو. دەهاتە دوکانی باوکمو بەهۆی حەمەوە جار جارە یەکترمان دەبینی.

کە عەزیز خزمەتی سەربازی تەواو کرد ، بەمامۆستای زمانی کوردیی دامەزراو نێردرا بۆ پارێزگای کوتو بۆ ئامادەیی عەزیزیە لە قەزای عەزیزیە، ئەو ماوەیەی کە لە عەزیزیە بوو ، لە وێوە زوو زوو دەهات بۆ لام بۆ هەڵەبجەو یەکترمان دەبینی، هەروەها لەناوشاری سلێمانیش زۆرجار چاومان بەیەك دەکەوت .

ئەوکاتە کەمن لەهەڵەبجە بووم یەکێتی مامۆستایانی کوردستان گۆنگرەیان بەدەستەوە بوو. من بەنوێنەری کۆنگرە هەڵبژێرامو لەمانگی ١٩٧٢/١ بۆ بەستنی کۆنگرە لەگەڵ نوێنەرانی لقی سلێمانی چووم بۆ بەغدا.

لەبەغدا چووینە ئوتێل سەرچنار، عەزیز لەو ئوتێلە بوو، ژوور نەمابوو، ئێمەش بێ جێگا بووین. ژوورەکەی خۆی داپێمانو خۆی گەڕایەوە بۆ سلێمانی. ئێمە نزیکەی دەکەس دەبووین منو چەند کچێك لەژوورەکەی ئەودا ماینەوە.

## تێکچوونەوەی شۆڕش و حکومەت و دەستپێکردنەوەی شەڕ :

ساڵی ١٩٧٤ من لەهەڵەبجە بووم .. ئاڵۆزیی کەوتە نێوانی شۆڕش و حکومەت، ماڵی باوکم هاتنە هەڵەبجەو دوای ماوەیەك بەماڵەوە چووینە بیارەو تەوێڵە، دوو مانگێ لەوێ ماینەوە. دوای ئەوە چووینە گوندی هانە گەرمەڵە، دوومانگیش لەوێ ماینەوە دوای بۆمبارانی هەڵەبجە چووینە ئێرانەوە، لەنەوسوو دواجار لەپاوە جێگیربووین.. لەوێ کرام بە مامۆستای ناوەندی .. کە ئێمە لەپاوە بووین لەناوەڕاستی ساڵەکەدا، عەزیز هاتبووە دەرەوە، چووبوو بۆ پێنجوێن، لەپێنجوێنەوە هات بۆ پاوە بەنیازی ئەوەی داخوازیم بکات. ماڵی محەمەد قەرەداخی لەپاوە بوو، چوو بوو بۆلای محەمەدو ئەوی ناردبوو بۆلای باوکم بۆ خوازبێنی. باوکم لەبەر بارودۆخەکە داخوازییەکەی محەمەد قەرەداخی بەپەسەند نەزانیبوو رازی نەبوو بوو، ئیتر گەڕابۆوە بۆ پێنجوێن.

## هەرەسی شۆڕش و گەڕانەوە :

دوای پیلانەکەی جەزائیر .. شۆڕشی کورد تووشی شکستێکی سیاسی بوو. دەوڵەتە ئیقلیمییەکان، بۆ بەرژەوەندی خۆیان لەجەزائیر رێکەوتننامەیەکیان ئیمزا کرد. دەوڵەتی ئەوکاتەی ئێران کە دۆستی شۆڕشی کورد بوو، پشتی کردە شۆڕش و دوای ئەوە بڕیاری کۆتاییپێهێنانی شۆڕش درا . من لەمانگی (٣)دا گەڕامەوە بۆ سلێمانی. عەزیزیش لەمانگی (٥)دا گەڕایەوە. ئەوکاتە من لەقوتابخانەی ژیانی

سەرەتایی دانرابوومو عەزیزیش گەڕایەوە بۆ قەزای عەزیزییە... هەر لەهەمان ساڵدا ناردییە خوازبێنیم لەمانگی (٩)ی ساڵەکەدا منی گواستەوە، چووین بۆ بەغداو تکریت و عەزیزییەو هەولێرو شەقڵاوە . لەهەولێر چووینە ماڵی مامی واتە ماڵی مامۆستا فازڵ عیرفان ... کەمنی گواستەوە بردمیە ماڵی نەسرین خانی خوشکی . منیان گێڕایەوە بۆ هەڵەبجە .. هەمووجار لەعەزیزییەوە دەهات بۆ هەڵەبجەو لەهەڵەبجەوە منی دەهێنایەوە بۆ سلێمانی بۆ ماڵەوە .

## ساڵی ١٩٧٦و نقلبوونەوەمان و چەند سەفەرێك:

ساڵی ١٩٧٦ بەقاعیدەی زەوجی عەزیز نەقڵی سلێمانی کرایەوە، ناردیانە ناوەندیی عەربەت لە عەربەت و منیشیان نقڵی سلێمانی کردەوەو ناردمیانە بەکرەجۆ...

لەهاوینی ساڵەکەدا سەفەرێکی کرد بۆ قاهیرەو لەقاهیرە دکتۆر کەمال خۆشناوی بینیبوو، دوای بینینی ئەو گەڕایەوە، هەر لەقاهیرە گەڕایەوە جەولزی بۆ دەرهێنامو بەیەکەوە چووین بۆ تورکیاو لەتورکیاوە چووین بۆ سوریا، ماوەی مانگێ ماینەوە، بەڕێز مام جەلال لە سوریا بوو، سەردانی کرد. دوای سەردانەکەی بەڕێز( مام جەلال) گەڕاینەوە بۆ سلێمانی .

## ئەو هاوڕێ‌و برادەرانەی بەزۆریی هاتوچۆیان دەکردین:

ئەوەندەی ماڵمان لەسلێمانی بوو، بە بەردەوامی برادەرانی عەزیز بەزۆریی سەردانی ماڵمانیان دەکردو زۆریشیان شەوو ڕۆژیش دەمانەوە ئەوەی لەبیرم ماون .. (کاک شاسوار) کە بەکاک (ئارام) خۆی ناساند ،کاک عومەر فەتاح، کاک مەلا بەختیار، کاک شازاد سائیب؛ کاک سالار عەزیز، جەمالە ڕەش، کاک حەمە چاوشین، جەمالی عەلی باپیر، ئەحمەدی موهەندیس‌و زۆری تر) کە بەداخەوە ناوەکانیانم لەیاد نەماوە. کاک (شاسوار) ئامێرێکی چاپی هێناو لەماڵەوە دایاننا‌و بە بەردەوامی ئیشیان پێدەکردو ئەو بڵاوکراوانەی پێیان چاپ دەکرد، لەڕێگای برادەرانی ناو شارەوە، لەماڵی ئێمەوە دابەش دەکران. عەزیز حەزی دەکرد یەکەیەکەی هاوڕێکانی بناسم، بۆ هەر یەکێکیان کە دەهات‌و بیزانیایە من نایناسم، خێرا پێی دەناساندم . زۆربەی پۆستەو نامەو بڵاوکراوەکانی بەمن‌و خوشکەکانیدا دەنارد بۆ ماڵی (مامۆستا جەمال تاهیرو جەمالە ڕەش‌و جەمالی عەلی باپیر). ئێستاش بیرمە ڕۆژێك پۆستەم برد بۆ ماڵی جەماڵ عەلی باپیر کە لەدەرگامدا نەیزانی منم. کەچوومە ژوورەوە، خۆی لەکەنتۆرێکدا حەشار دابوو، تا نەیزانی منم نەهاتە دەرەوە . جگە لەوانەی باسم کردن ئەو کەسانەش بەزۆریی هاتووچۆیان دەکردین، مەسعود، حەمیدی مەلا کەریم، یونس و ئازادو نەوزاد جەلال. ئەم کەسانە زۆریان خزم‌و کەسی نزیکی عەزیز بوون‌و زۆریان خۆش دەویست‌و ئەویش زۆر ڕێزی لێدەگرتن‌و جێگای متمانەو باوەڕی بوون پشتی پێیان ئەستوور بوو.

ئەوساڵە عەزیزو هاوڕێکانی بەشێوەیەك كاروچالاكی ڕێكخستنیان دەكرد كە شەویان دەخستە سەر ڕۆژو ڕۆژیان دەخستە سەر شەو، ڕانەدەوەستان. زۆر بە پەرۆشەوە جموجووڵیان دەكرد . من هەرچەندە وەكو ئەندامێكی ئەو ڕێكخستنە نەبووم، هیچ پلەوپایەیەكم نەبوو، بەڵام لەبەر عەزیز پێیەكم لە ئابلاخ بووبۆ ماڵی ئەحمەدی موهەندیس و پێیەكم لەماڵی نەسرین خانی خوشكی بوو لە سەرچنارو یەكێكیتر بۆ ماڵی ئەو كەسانەی لەسەرەوە ناوم هێناون، زۆر بێخەم بوومو دڵم زۆر خۆشبوو كەدەمبینی ئەو هەموو خەڵكە باشە ڕۆژانە دێنە ماڵی ئێمەو هاوڕێی دڵسۆزی عەزیزنو عەزیز قسەیان بۆ دەكاتو كاریان پێدەسپێرێت.

## ساڵی ١٩٧٧ و گۆڕانكارییەكان :

عەزیز هەستی كردبوو، لەلایەن حكومەتەوە خراوەتە ژێر چاودێری دەزگاكانی ئەمنەوە ، بۆیە هەوڵیداو جەوازی بۆ هەردووكمان دەرهێنایەوە بەمەبەستی سەفەركردن بۆ دەرەوەی عێراق ، كە جەوازەكان تەواو بوون. خۆمان پێچایەوە بەنیازی سەفەر لەڕێگای دهۆك-زاخۆوە بەرەو توركیا ڕۆیشتین .

لەبازگەی نێوان زاخۆو توركیا. جەوازەكەی عەزیزیان گرت، پێیان ڕاگەیاندین كە ناوەكەی مەنعی لەسەرەو ناتوانێت سەفەر بكات ، بۆیە بەناچاری گەڕاینەوە بۆ سلێمانی و سەفەرەكەمان بۆ نەكرا .. دوای چەند ڕۆژێ عەزیز بڕیاریدا بچێتە دەرەوەو لەناوشاردا نەمێنێت. بەرەو ناوچەی پێنجوێن بەڕێكەوتو چووە گوندەكانی وەرزیارەو گوڵێ .. منی نەبرد ..

ئـەو ماوەیـە لەوناوچـەیە بـوو زوو زوو هاتووچـۆی ناوشـاری دەکـرد ...
هەمووجارێ پێم دەوت ئەوەندە مەیەرەوە ناوشار ، تووشی بەزمێ دەبیت .
تووڕە دەبوو دەیوت ئەگەر منو برادەرانی تر نەیەینەوە ناوشار ئەی کێ
کارەکان جێ بەجێ بکات.. پیاو نابێت بترسێت، ترسنۆکی لەفەرهـەنگی
ئێمەدا نییە، لەهاویندا جوابی بۆ ناردم کە منیش بچم بۆلای چووم بۆلای
لەگوندی وەرزیارە بوون .
منو خێزانی عـەلی ئامـەخانو برازایـەکی کـاک سـالار عـەزیز لـەوێ بـوون ،
عـەزیزو بـرادەرانیش لـەناو دێیەکـەبوون.. بەیانیـەکی زوو کاتێکمـان زانـی
پیـاوانی رژێـم دەوری گوندەکەیانـدا ، بەپەلـە عـەزیزو پێشـمەرگەکان
دەرچوون. ئێمە ماینەوە.. من ڕوومکردە چەند ماڵێ نەیاندەهێشت بچمە
ماڵەوە، تـا دواجـار ماڵێک پیاوەکـەی بردمیە مـاڵی خۆیـانو چـەند دەفتـەر
نفوسـێکی دامـێو وتـی کەپرسـیاریانکرد بڵێـی هـاتووم بـۆ تەسـکەرە
دەرهێنانی ئەم منداڵانە. گوڵاڵەخانیان خستە ناو تووتنەوە براژنەکەی کاك
سالار یان دانا بەدیارلانکی منداڵەوە، ئێمە بەو شێوەیە رزگارمان بوو. شەو
دوای پاشەکشـەی پیـاوانی رژێـم عـەزیزو ئـەوان هاتنـەوە نـاودێو بـەیانی
ئێمەیان رەوانەی سلێمانی کردەوە .
کە گەڕامەوە بۆناوشـار .. عـەزیز زووزوو دەهاتـەوەو زۆرجـار کەدەشهاتەوە
منی نەدەبینی. چونکە بەزۆریی بۆ کاری حزبی دەهاتەوە، جارێك هـاتبۆوە،
گـەڕەکی بـەرانان تـازە مـاڵی لێدروسـت کرابـوو . هاتبوونـە ئـەو گەڕەکـە،
بەرێکەوت دایکم بینیبوونی ، خۆیو (عوسمـان) بوو بوون. هێنابوونیەوە بۆ
ماڵەوە نانیـانخواردبوو (عوسمـان)و (عومـەر) دوو بـرا بـوون عومـەر سـەر بە
دائیرەی ئـەمن بـوو (عوسمـان) لـەدەرەوە بوو بە (نـەریمان) ناسـرابوو. دوای

ئەوەی لەماڵی ئێمە رۆیشتبوون چووبوونە ماڵی (عومەر) دوای ئەنجامدانی کارەکەیان گەڕابوونەوە بۆ دەرەوە ئەوجارە چاوم پێی نەکەوت .
هەموو جارێ کەدەهاتەوە بەزۆریی دەچووە ماڵی ئەو عومەرەو ماڵی حاجی عوسمانی مەعرەزو ماڵی کاك شازادو نەسرینی خوشکی ، هەمووجار چەند رۆژێ دەمایەوە. جاری واهەبوو (١٥) شەو زیاتر دەمایەوە بەزۆریی لەماڵی (نەسرین خان) کە مێردەکەی ناوی کاك (رەئووف) بوو دەمایەوە، زۆر زۆریان عەزیز خۆشدەویست، جارێك کاك ئەرسەلان بایز هاتە ماڵی نەسرین خانو هاتە ماڵی ئێمە ، هەروەها (کاك عومەر فەتاح و کاك حەمید بلباس) بەزۆری سەردانیان دەکرد.

## دواهاتنەوەو چۆنێتی دەستگیرکردنی:

رۆژێکیان عەزیزو کاك مولازم عومەرو سامی شۆڕش هاتنەوە ناوشار عوسمانیان لەگەڵدا بوو. چوونە ماڵی (عومەر)ی برای عوسمان. منو نازەنین خانی خوشکی رۆژانە سەرمان لێدەدا . چەند نامەو پۆستەیەکی دا پێمان، گەیاندمانە ماڵی مامۆستا (جەمال تاهیر) ، عوسمانی ناردەوە بۆ دەرەوە، مولازم عومەرو ئەوانیش لەناو شار نەمان . تەنها خۆی لەناوشار مایەوەو نەرۆیشتەوە ، برادەرانی ناوشار زۆریان هاتووچۆیان دەکرد. من کەمیانم دەناسی یەکێك لەوانەی زۆر هاتووچۆی عەزیزی دەکرد (عومەری حەمە عەلی) بوو. پیاوێك ناوی (وەلی) بوو سایەقی ئەمن بوو باوکمی دەناسی، رۆژێ چوو بوو بۆ دوکان بۆلای باوکم، بەباوکمی وتبوو: زاواکەت لێرەیە. ئەم ئێوارەیە ناوەکەیم لەسەر مێزی مدیری ئەمن بینیووە ، پێی بڵێ

با لەناوشار نەمێنێت و بچێتە دەرەوە ، باوکم هەر ئەو ڕۆژە بەپەلە منی نارد بۆلای عەزیز ، کەبچم ئەو هەواڵەی پێ بڵێم ، چووم بۆلای لەماڵی عومەر بوو. ڕاسپاردەکەی باوکمم پێوت وتی شتی وانییە ، ئێوە دەترسن ، شەو لەماڵی عومەر بووین لەئەمنەوە عومەریان بانگکرد زیاتر لەدوو سەعاتی پێچوو . کەهاتەوە لێمان پرسی بۆ بانگیانکردی ، وتی هیچ نەبوو، بۆ هەندێ ئیشی خۆم بوو ، من شەو چوومەوە بۆ ماڵی باوکم . بەیانی زوو بەئۆتۆمبیلەکەی خۆم چوومەوە بۆلای بەزۆر خۆیم پێ لەبەر کردو لەگەڵ خۆما بردم بۆ ماڵی نەسرین خانی خوشکی لەسەرچنار ، پێم وت دەخیلت بم نەچیتەوە بۆ ئەو ماڵە (نەسرین خان)و پوریشیم توندکردەوە کە نەهێڵن بچێتەوە بۆ ئەو ماڵە ، من چووم بۆ دەوام هەر دوای من پێش نیوەڕۆ گەڕابۆوە بۆ ئەو ماڵە، هەر ئەو ڕۆژە جوابی بۆ (عومەری حەمەعەلی) ناردبوو بچێت بۆلای. ئەویش ڕاسپاردەی کردبوو کەلەسەعات (١)ی نیوەڕۆوە تا (٥)ی ئێوارە بەهیچ لایەکدا نەچێت سەری لێدەدات . ڕێك لەسەعات یەکی نیوەڕۆدا ئەمن چوونە سەری و لەو ماڵەدا گرتیان ، دوای گرتنەکەی کاتێکم زانی لەدەرگای ماڵی باوکم درا ، کەچوون بەدەمیەوە ئازادی پوری عەزیز بوو بانگی منی کرد کەچووم بەدەنگیەوە ڕەنگی هەڵبزڕکابوو، زۆر شپرزە بوو وتی عەزیزیان گرت وتم لەماڵی نەسرین خان یان لەکوێ؟ وتی نەوەڵا لەماڵی عومەر .

## هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی :

هەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ کاك یونس و ئازادو خوشکەکانی کەوتینە هەڵپە، بەملاو بەولادا. بەهۆی پیاوێکەوە کەناوی (جەواد) بوو، مدیری ئیدارەی کارگەی شەکرەکە بوو، خەڵکی بەغدا بوو. ئێستا نازانم بەهۆی کێوە بوو . چووینە لای، بۆ ئەوەی هەوڵێکمان بۆ بدا، بەهۆی (حاجی عەبد)ەوە کە ڕەفیقی بوو ، بەڵێنی داینێ بەوپەڕی توانایەوە هەوڵمان بۆ بدات. دوای چەند ڕۆژێ، بەهۆی ئەوەوە من و جەلالی خاڵی توانیمان (حاجی عەبد) ببینین. لە بینینەکەدا وتی من عەزیزم گرت ، کە چوومەسەری یاری ناپلیۆنی دەکردو ئاگای لەخۆی نەبوو ، پێم وت فەرموو وەرە لەگەڵمانا. دوای ئەو بینینەی حاجی عەبد ڕۆژێ جوابی ناردبوو یەکێکمان ببینێ ، خاڵە جەلال کە ئەوکاتە مدیری پۆلیسی پێنجوێن بوو ، چوو بۆلای حاجی عەبد پێی وتبوو ئەگەر عەزیز ئەم شتانەمان بۆ بکات بەری ئەدەین.

١- دوانزە پێشمەرگە بەچەکەوە تەسلیم بکاتەوە.

٢- دوو لە بەرپرسە گەورەکانی پێشمەرگەی بۆ دەست نیشان دەکەین بیانکوژێت .

٣- بەڵێن بدات کە هاوکاریمان بکات و کارمان لەگەڵدا بکات خاڵە جەلالی هاتەوەو ئەم مەرجانەی باسکرد. وەکو لەیادم بێت نازانم بە چ ڕێگایەکدا ئەوداوایانەی حاجی عەبدی گەیاندبووە عەزیزو عەزیزیش و تبووی هیچ یەك لەو داوایانە جێبەجێ ناکەم با بمکوژن .. دوای ئەوە عەزیز ڕەوانەی ئەمنی عام کرلو لەئەمنی عامەوە گێڕایانەوە بۆ کەرکوك ، کە زانیمان لەکەرکوکە بەهۆی کەسێکەوە کە ناوی (بورهان هەورامی)بوو کەوتینە

هەوڵدان و هەوڵەکەی بورهان گەیشتە ئەوەی بەریبدەن . رۆژێ مدیری ئەمن بانگی دەکات و پێی دەڵێت : وا بەرتئەدەین کە بەر بوویت وەکو جاران چاکەت و پانتۆڵ لەبەر ئەکەیت و بۆینباخ دەبەستیت ؟ عەزیزیش دەڵێ: بێگومان.. رۆژێ لەژووری زیندان دەیهێننە دەرەوە بۆ بەردان ، گەیشتبووە ناو حەوشەی زیندانەکە . لەپڕ دەیگێڕنەوە بۆ ژوورەوە وەکو زانیمان ئەو کەسەی بەسەریەوە بوو ، بەوەی زانیبوو کە بەنیازن عەزیز بەربدەن ، لەترسی خۆی ئەمنی سلێمانی ئاگادار کردبوو، کە عەزیز بەرپرسی ئیفتیالاتی ناو شارەو ئەندامی سەرکردایەتیە چۆنی بەر ئەدەن ؟ لەئەمنی سلێمانیشەوە، ئاگاداری ئەمنی کەرکووك کرابوو. بۆیە عەزیزیان لەحەوشەوە گێڕابوەوە بۆناو ژوورەکەی و بەریان نەدابوو ، دوای ئەوە رەوانەی هەولێر کراو کە لەکەرکووك نەما (بورهان) پێی راگەیاندین، ئیتر هیچ لەدەستی ئەودا نەماوەو هیچی پێناکرێت ، دوای ئەوە لەگەڵ کاك یونسدا چووین بۆ بەغدا بۆ ئەوەی هەوڵبدەین پارێزەرێکی بۆ بگرین لەبەغدا . پارێزەرێکی تکریتیی خزمی (سەدام)مان دۆزیەوەو کردمانە پارێزەری تا ئێمە ئەمەمانکرد عەزیزیان رەوانەی موسڵ کرد. پارێزەرەکە چوو بۆلای بۆ موسڵ . مواجەهەو موقابەلەی لەگەڵدا کردبوو، دوای چاوپێکەوتنەکەی ئێمە چووینەوە بۆلای . پێی راگەیاندین کە حوکمی ئیعدام دراوەو تازە هیچ ناکرێت . نزیکەی چوار مانگ لە بەندیخانەی موسڵ مایەوە، هەموو سەری مانگان و پانزەی مانگێك سەرمان لێدەداو دەمانبینی، نزیکەی شەش مواجەهەمانکرد ، لەیەکێك لەمواجەهەکاندا کە کەوتە پێش دوامواجەهە ، مدیری بەندیخانەکە بانگی کردم لەگەڵ عەزیزدا داینایین و پێی وتم . ئەتوانی بچی بۆلای مام جەلال ، پێی بڵێی زابتێکی خزمی سەید

ئەلرەئیسیان گرتووەو لایانە، ئەگەر ئەو زابتە بەربدەن ئێمەش عەزیزتان بۆ بەردەدەین ؟ وتم بەڵێ ئەتوانم بچمو داواکەتان بگەیەنم وتیان کە گەڕایتەوە بۆ سلێمانی ڕامەوەستە خێرا بچۆ بۆ قەڵادزێو بچۆ بۆ ئیستیخباراتی عەسکەری و لەرێگای ئەوانەوە رەوانەتدەکەن ، هەر کەگەڕامەوە بۆ سلێمانی بڕیار درا کەبچم بەلای کارەکەوە. زۆرکەس لەهاوڕێو خزمەکانی ئامادەبوون لەگەڵم بێن ، بەڵام بەرەزامەندیی هەموولایەك (کاك ئازاد)یان دەستنیشانکرد کەلەگەڵما بێت ، لەبەرئەوەی تەمەنی زۆر نەبوو بەیەکەوە کەوتینەڕێ بۆ قەڵادزێ ، چووینە قەڵادزێ خۆمانکرد بە ئیستیخباراتەکەدا کە چووینە ئیستخبارات . دیار بوو ئاگادار کرابوون خێرا ئۆتۆمبیلیان بۆ پەیداکردینو بەرێیان خستین ، بۆ سەرکردایەتی، کەچووینە شێنێ خەبەریان دایە برادەران کاك نەوشیروان و کاك مولازم عومەر هات بۆلامان . بردینی بۆلای( مام جەلال) راسپاردەو داواکەی حکومەتم پێوتن ئەو نامەیەی کەعەزیز بۆ مام جەلالی نووسیبوو دامە دەست مام جەلال ، وتیان راستە ئێمە ئامۆزایەکی ئەحمەد حەسەن بەکرمان لەلایە. بەرێز(مام جەلال) وتی: (ئێمە دڵنیاین ئەگەر ئێمە ئەویش بەربدەین ئەوان عەزیز بەرنادەنو درۆ دەکەن ، بەڵام ئێمە ئەو بەرئەدەین ، با ئەوانیش عەزیز بەربدەن . بۆ دڵنیاییش زابتەکە موهەندیسێکی لەگەڵدا گیراوە ، ئێمە ئەو موهەندسەتان لەگەڵدا دەنێرینەوە) ، رۆژی دوایی کە لەگەڵ موهەندیسەکەدا گەڕاینەوە بۆ قەڵادزێ، ناردیانین بۆ بەغداو گەیاندیانینە وەزارەتی دیفاع . لەگەڵ وەزیری دیفاع دانیشتین، پرسیاری زۆرو هەمەلایانەیان لێکردم . موڕافیقەکەیان بردوو کەوتنە تحقیق لەگەڵیداو زانیارییان لێوەرگرت، دڵخۆشیی ئێمەیان دەدایەوە بەوەی کە عەزیز بەردەدەن، بەنیاز بوون ئێمە (سەدام) بمانبینێ

بەڵام نەمانبینی ، بەئێمەیان وت بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی خۆمان ئاگادارتان دەکەینەوە. دوای گەڕانەوەمان بۆ سلێمانی پاش چەند ڕۆژێ ئاگاداریان کردین بچین بۆ دوا مواجەهە. هەر ئەو ڕۆژە بەپەلە لەگەڵ کاک یونسدا چووینەوە بۆ بەغدا بۆلای وەزیری دیفاع ، کەچووینەلای وەزیر پێمان وت، جوابیان بۆ ناردوین عەزیز ئیعدام دەکرێت، ئێوە بەڵێنی چیتان بەئێمەدا. وەزیر وتی وانییە ئێوە بچن بۆ موسڵ ، ئێمەش بەتەیارە دێینە موسڵو لەوێ عەزیز بەرئەدەین .

ئێمەش بەپەلە سواری ئۆتۆمبیل بووین ، خۆمان گەیاندە موسڵ کەچووینە بەردەمی زیندانەکە خەڵکێکی زۆری سلێمانی وەستابوونو هاتبوون بۆ مواجەهەی عەزیز. هەر ئێمە گەیشتین بەڕێوەبەری زیندان ئاگاداری کردین کە تەنها ژنو دایکو خوشکەکانی دەبێت بێنە ژوورەوە بۆ مواجەهەی عەزیزو نابێت کەسی تر بێت.

کەچووینە ژوورەوە ، عەزیزیان هێنا ، وتی چیتان بۆ کردم ، مەسەلەکەم بەدوورو درێژی بۆ گێڕایەوە. وتی درۆیان لەگەڵدا کردون ، ئەم بەیانیە سەعات هەشت بڕیاری لەسێدارەدانەکەیان بۆ خوێندمەوە ، کە سەعات (١٢)ی شەو لەسێدارە دەدرێم ، کە هەواڵەکەی پێوتین هەر هەمووومان دەستمان کردبەگریان ، وتی ڕازی نابم کەس بۆ من بگری ، من لەسەر بێ ڕەوشتیو دزی نەگیراوم ، من لەسەر مەسەلەی میللەتەکەم گیراوم ، شانازیە بۆ خۆمو بۆ ئێوەش کە ئەم جەلادانە لەسەر مافی ڕەوای میللەتەکەم لەسێدارەم دەدەن ، بەلەسێدارەدانم شۆڕش لەناوناچێت بەڵکو دەبێتە هاندەرێکی تر بۆ پتەوکردنی شۆڕش .

هەروەها وتی وا ئەو کەسانەی زەحمەتیان بینیوەو هاتوون بۆ بینینم، منیان نـەبینیو منـیش ئـیتر نایـان بینمـەوە بـەناوی منـەوە خـوا حـافیزی لەیەکەبەیەکەیان بکەنو داوای لێبووردنیان لێبکەن، کە مواجهه تەواو بوو خواحافیزیمان لێکردو هاتینە دەرەوە ، خزمان بڕیاریاندا کەسێك بمێنێتەوە لـە موسڵو لـەنزیکی بەندیخانەکـە بـۆ ئـەوەی بزانرێـت لـەکوێ دەنێـژرێت، ئیسماعیلی پورزایان نارده ماڵێك بەرامبەر بە زیندانەکە ، ئەو شەوە کە $\frac{24}{25}$/ 3/ 1978 بـوو. عـەزیزیان لەسـێدارەدا بەیانیەکـەی سـەعات (٥) تەرمەکـەیان ناردبوو بۆ توبی عەدلی ، لەوێوە ڕەوانەی تەلەعفەریان کردبوو، بۆ ئەوەی لەگۆڕستانەکەی ئەوێ بنێژرێت ئیسماعیل ئاگاداری ئەوەبوو. خێرا لەگەڵ ڕەوانەکردنی تەرمەکەدا سواری ئۆتۆمبیل دەبێتو بەدوایدا دەڕوات. دوای ناشتنی دەچێتە سـەر گۆڕەکـەو قوتوویـەك بۆیـە دەکات بەسـەر گۆڕەکـەداو دەگەڕێتـەوە ، بـۆ ئـەوەی بزانرێـتو بناسـرێتەوە. واتـە بەباشـی گۆڕەکـەی دیـاریکردبوو ، کـە گەڕاینـەوە نەیانهێشـت پرسـەی پیـاوان دابنرێـت. بـەڵام (جـەواد) موافەقـەتی بـۆ پرسـەی ژنـان بـۆ وەرگـرتنو پرسـەیەکی چـەند ڕۆژیمان بۆ دانا. دوای سیانزە ڕۆژ لەگەڵ خـەڵکێکی زۆر لـەخزمانو کـەسو کارو دۆستانی چووین بۆ تەلەعفەر بۆسەر گۆڕەکەی، گۆڕەکەمان هەڵدایەوە. دڵنیابووین کە ئـەوە گۆڕەکەیـەتی، دامانپۆشییەوەو گەڕاینەوە بـۆ سلێمانی دوای ماوەیەك بۆماندەرکەوت ئەو تەفسەرەی ئامۆزای ئەحمەد حەسەن بەکر کـە دەیانویسـت بەگۆڕینـەوە لەگـەڵ عـەزیزدا بـەر بـدرێت لەبەندیخانـەی پێشـمەرگە ڕفاندوویانـەو گەیاندوویانەتـەوە دەسـتی حکومـەت ، لەگـەڵ دەرکردنـی بڕیـاری حـوکمی لەسـێدارەدانەکەیدا ئـەوەش دیـاریکرابوو

کــەنەبێت بۆمــاوەی (١٠) ســاڵ لــەو گۆڕەدابێــت نەگوێزرێتــەوە ، عــەزیز پیــاوێکی بەهیمــەتبوو تێکۆشــەرێکی زۆر ئــازابوو، خــەمخۆرێکی دڵســۆزی گــەل و نیشــتمانەکەیبوو ، هەمیشــە گەشــبین ، دەم بەپێکــەنین بــوو. تووڕەبوونەکەشی هەر خۆشبوو. هیچی لەدڵدا نەبوو شەرمیشمان ببوایە زوو ئاشتی دەکردەوە، هەرچەندە بڵێیت ئەوەندە قسە لەڕوو راستگۆو راشکاو بــوو، شــەرمی لەکــەس نــەدەکرد، زۆر ســەخی بــوو، حــەزی بەپیاوەتی زۆر دەکرد. حەزی لەسەیران و گەڕان بوو ، لەهەر کۆڕێکدا دانیشتایە دەنگی و قسەو پێکەنینی دیاربوو. لەناو هەموو هاوڕێکانیدا جیا دەکرایەوە، لەیەکەم رۆژی مواجەهەیەوە پێی راگەیاندین کە نابێت کەس بۆم بگری و نامەوێت فرمێسـک بەچـاوی کەسـتانەوە ببیـنم ، دەیـوت ئەگـەر ئێـوە گریـان ئـەم سەگبابانە دڵخۆش دەبن ، بەراستی عەزیز بەمەردی ژیاو بەمەردی سەری نایـەوە ، لەهـەموو مواجەهەیەکدا ، کارێکی وایـدەکرد بەنووکتە گێڕانـەوەو قســەی خــۆش و پێکــەنین ، ئــەو ماوەیــەی کــە لەگــەڵیا دادەنیشــتین لــەبیری دەبردینــەوە، کــە ئــەو گــیراوەو ئێمــە هــاتووین بــۆلای ، حــوکمی ئیعدامــە . مواجەهە لەگەڵ مواجەهە رووگەشترو قسەخۆشترو دەم بەپێکەنین تر دەبوو ، خۆزگە من بمردمایەو بەو شێوەیە مەرگی عەزیزم نەبینیایە ، خۆزگە هەر لەســەرەتاوە عــەزیزم نەناســیایە، خۆزگــە ئــەو پیــاوە ئــازاو رووخــۆش و قارەمانە، کەلەپیاوی من و کوڕی کەس و کاری دەرچوو بوو. بووبوو بەپیاو و کوڕی گەلەکەی تۆڵەی دەسەنرایەوە، وەکو پێویست بایەخ بەرمنج و مانـدوو بـوون و خـەبات و تێکۆشـانی نەدرا، مـن زۆر سوپاسـی کـاک شـێخ محەمـەد دەکـەم کەلەناو هـەموو هاوڕێکانیـدا، وەکـو وەفایـەك بـۆ هاوڕێیـەتی ئـەرکی نووسینەوەی مێژووی ژیانی عەزیزی گرتە ئەستۆو بەدڵسۆزییەوە کاری بۆ

دەکات ، خۆزگە ئەو هاوڕێیانەی کە یادەوەرییان لەگەڵ شەهید عەزیزدا هەیە، بەدەنگ کاک شێخ محەمەدەوە دەهاتن و بیرەوەرییەکانیان دەنووسییەوە ، خۆزگە ساڵانە یادی عەزیز دەکرایەوە . ڕێز لەکەس و کاری دەگیراو وەکو ئەندامێکی سەرکردایەتی حیسابی بۆ دەکرا. خۆزگە شوێنێك لەشوێنە گشتییەکان لەشاری سلێمانی بەناوی شەهید عەزیزەوە ناو دەنرا ، خۆزگە من منداڵێکم لەعەزیز دەبوو، ناوی هەرچی بوایە هەرناوم دەنایەوە (عەزیز) .

# شەهید عەزیز ئامۆژگاری ئەکردین بایەخ بە ئاستی ڕۆشنبیریمان بدەین

جەمال شێخ نوری

شەهید عەزیز مەحمود ناسراو بە مامۆستا عەزیز ، لەساڵی ١٩٧٢ بۆ ماوەیەکی کەم بوو بەلێپرسراوم لەئەڵقە ڕووناکبیرییەکانی (کۆمەڵەی مارکسی و لینینی کوردستانی) ئەوسا.

شەهید عەزیز مەحمود کوڕێکی ڕووناکبیرو هوشیارو نیشتمانپەروەر بوو ، زۆر پەرۆشی ئازادیی و بەدەست هێنانی مافی نەتەوایەتی بوو ، لەدیاریکردنی مافی چارەی خۆنووسیندا . شەهید عەزیز زۆربەی کات لەکۆبونەوەکاندا ئەو دەستەواژەیەی دووپات ئەکردەوە کە ئەڵێ هەرگەلێك ژێردەستەو دیل بێ بێگومان خاوەنی هیچ شتێکی خۆی نییە .

هەمیشە جەختی لەخۆ ڕووناکبیر کردن ئەکردەوە ، هەروەها ئەیوت پێویستە کورد لەپێش هەموو شتێکەوە خۆی ڕووناکبیر بکات ، لەهەمانکاتدا سوود لە ئەزموونی سەرکەوتنی شۆڕشەکانی گەلانی تر وەربگرێ ، چونکە بەبێ هەبوونی ڕووناکبیریەکی نەتەوایەتی گیانی شۆڕشگێڕیو نیشتمانپەروەرێتیی ڕاستەقینە بەهێز نابێ لەناو کوردا.

شەهید مامۆستا عەزیز هەمیشە شێوازی ڕێبازە کۆنەکانی شۆڕشەکانی کوردی کە عەقڵ و بیروبۆچوونی خێڵایەتی بوون ڕەتینەکردنەوە ، ئەیوت

پێویستە لەمەودوا کورد بەعەقڵی تازەو ڕێبازی تازەوە بیروبۆچوونی تازەو بەئەزموونێکی تازە درێژە بە شۆڕش بداتو بچێتە کۆڕی خەباتەوە .

ئەگینا ئەگەر وانەکەین ئەمجارەیش وەکو هەموو جارەکانی تر ، چەند ساڵێکی تر لەگەڵ دوژمن بەسەر ئەبەینو کۆمەڵێك نەهامەتی تر بەسەر گەلەکەماندا ئەهێنین ، دواجاریش بەبیانوی ئەوە سەرکەوتن بە دەست نایەت و دوژمنەکانمان زۆر بەهێزنو سنورەکانمان خراپن و دەورمان بە دوژمن گیراوە، یا خود هەڵەکانی کورد خۆی تووشی شکستێکی گەورەی ئەکاتو شۆڕش تێك ئەشکێو هەندێك خۆی دەرباز ئەکاتو کارەساتێکی خراپ بەسەر گەلەکەماندا دێننو گەلەکەمان ئەکەوێتە بەردەم بەزەیی دوژمنەکانی رووبەڕوویی خراپترین سیاسەتی دوژمنکارانە ئەبێتەوە ، هەر بۆیە پێویستە ئەمڕۆ کورد ئەم بارودۆخەی ئێستاش بە شێوەیەکی زانستیانە هەڵبسەنگێنێ ، دۆستو دوژمنەکانی خۆی دیاری بکات .

شەهید عەزیز هەمیشە ئامۆژگاریی دەکردین و پێی لەسەر ئەوە دائەگرت ، زیاد لەپێویست بایەخ بدەین بە ئاستی هۆشیاریی لەهەمان کاتیشدا لەناو خەڵکدا هێمنو لەسەرخۆبینو توندڕەو نەبین، بەڵام بەپێچەوانەوە ئێمە هەندێجار تووشی سەرچڵیو توندڕەوی ئەبووین لەکارو قسەکردندا ، مامۆستا عەزیز بەپێکەنینەوە ئەی وت ئەگەر وابکەن رۆژێك دێ بەسەروچاوی شکاوەوە ئەتانبینمەوە .

ئەمە شتێکی کەم بوو لەو یادگارو ئامۆژگاریانەی شەهید کە تاکو ئێستا لەیادم ماون ، لەپاش ماوەیەك شەهید عەزیز لای ئێمە نەما ، بەڵام ئەوەتا پاش ئەو هەموو ساڵە یادگاریو قسەخۆشو ئامۆژگاریە بەنرخەکانیم هەر لەیاد ماوە .

# سەردەمانێك لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا

ئەنوەر مەحمود عەبدوڵا

کەسێك هاوڕێو دۆستو هاوبیری شەهیدان (کاکە ئارام، کاکە شا، مامۆستا جەمال تاهیر، جەباری حاجی رەشید، جەمالە رەش، یاسین ئەنوەرو...) دەیانو سەدانی تر لە سەروەرانی رێگای رزگاریی و سەرفرازی گەلو نیشتمانەکەی بێت. بێگومان هەمیشە رێی ئەوان دەگرێتەبەرو بەیادی ئەوانەوە ئەژی ، یەکێ لەو کەڵەپیاوانەی ناسیبوومن مامۆستا (عەزیز مەحمود)ی شەهید و نەمرە ، کە رۆڵەیەکی قارەمانو کۆڵنەدەرو مرۆڤێکی کارامەو بلیمەتو خەباتکارێکی بێ وێنە بوو. هەر لەسەرەتای لاوییەوە تارۆژی لەسێدارەدانی هەمیشە گیانی خۆی بەختکردبوو بۆ میللەتو خاکەکەی ، بێوچان لەریزەکانی قوتابیانو لاوانو مامۆستایانو لەشارو شاخ لەخەباتدا بووە بەورەیەکی پۆڵاینو بەرزەوە .

مامۆستا عەزیز هاوڕێیەکی دڵسۆزو بەوەفاو چالاكو گەشبین بوو. سەرەتای ئاشنابوونم لەگەڵ ئەو زاتەدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٦٤ کە هەردووکمان قوتابی بووین لەدواناوەندی وەتەنی کوڕان، لەریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستاندا کارمان دەکرد ، لە شانەکاندا، هاوڕێیەکی زۆر نزیكو دڵسۆزی یەکتر بووین، رۆژ لەدوای رۆژ هاوڕێیەتیو دۆستایەتیمان زیاتر پەرەی دەسەند. چونکە هەردووکمان هاوبیربووین لەبۆچوونەکانماندا .

لەپاش تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی لەناوەڕاستی مانگی ۱۰ی ۱۹٦۸دا ، بەندەو شەهید لەزانکۆی بەغداد لەکۆلێژی زمان بەشی کوردی وەرگیراین، کە ئەوکاتە لەتەنیشت یاریگای دیەوانیەوەبوو. لەرێکخراوی یەکێتی قوتابیان چالاکانە کارەکانمان ئەنجام دەدا. لە کۆڕو کۆبونەوەو ئەلقە رۆشنبیرییەکاندا بەشداریمان دەکرد، زیاتر خۆمان رۆشنبیر دەکرد و سەردانی کتێبخانەی بیری نوێمان دەکردو کتێبمان ئاڵوگۆڕ دەکرد. لەو سەردەمانەدا هەندێجار سەیران و گەشت رێکدەخرا بۆ قوتابیە کوردەکانی کۆلێژەکان ، بۆ زیاتر ئاشنابوون و گۆڕینەوەی بیروڕاو ئەنجامدانی چالاکی و رێکخستن و پتەوکردنی ریزەکانمان و فراوانیی ئاسۆی بیرکردنەوەمان بەئایدۆلۆژیای مارکسی لینین و بەشداریکردنمان لەئۆردوگاکانی قوتابیاندا بۆ هەرەوەزکردن لەگەڵ جوتیارانی کوردستاندا .

لەمانگی ئازاری ۱۹۷۰دا ئەوکاتە ئێمە چەند برادەرێک بووین ، خانوویەکمان گرتبوو لەبەرامبەر کۆلێژی پەروەردەو نزیک گۆڕستانی بەریتانی. رۆژێك مامۆستا عەزیز لە زانکۆ وتی: ئەگەر رێگامان پێ بدەن هەندێ شت بهێننە لاتان منیش بەبێ ئەوەی پرسیار بکەم شتەکان چین وتم پێویست بەپرسیار ناکات و ماڵی خۆتە. بۆ رۆژی دوایی بەپیکابێك لەگەڵ دوو برادەری تردا شتەکانیان هێنا، لەچەند کارتۆنێکی قەوارە جیاوازدا بوون و داخرابوون. پاش ماوەیەك شتەکانیان گواستەوەو دوایی زانیم کەلوپەل و شتەکانی بارەگای یەکێتی قوتابیان بوو لەگەڵ چەند پارچە چەکێکدا .

لەو سەردەمانەدا تووشی گەلێ گیرگرفت و کێشە بووین لەگەڵ یەکێتی قوتابیانی پارتیدا. چونکە ئێمە لەساڵی ۱۹۷۰وە کارمان لەریزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەدا دەکرد .

پاش ئەوەی خوێندنی کۆلیجمان تەواوکرد ، لەسەرەتای مانگی ۱۰ی ساڵی ۱۹۷۲دا جارێکی تر لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا لە (مرکز تدریب کرکوك)یەکمان گرتەوە زیاتر لە مانگێکمان بەسەر برد، پاشان هەموو ڕۆژێك کۆیان ئەکردینەوە ئێمەش دەمانگوت بۆ (نقلە)حەیاتەکەیە .

ڕۆژێکیان ناوی منو مامۆستا عەزیزیان خوێندەوەو نووسراوێکیان داینێو وتیان نەقڵ بوون بۆ وەزارەتی بەرگری لەبەغداد. لەراستیدا هەردووکمان زۆرمان پێ خۆش بوو ، من لەبەرئەوەی کارم دەکرد لەرۆژنامەی هاوکاریداو ئەویش بۆ ئەوەی زیاتر بەشداری بکات لە کارو چالاکی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەدا. بۆ ڕۆژی دووەم کەچووینە وەزارەتی بەرگری لەپرسگەکە نووسراوەکەیان لێوەرگرتین، پاش ماوەیەك ئەفسەرێك هاتە لامانو چەند پرسیارێکی لێکردینو پێی ڕاگەیاندین: ئێوە بەمەڵە نەقڵ بوون بۆ ئێرەو نووسراویان بۆ کردینو گەڕاینەوە بۆ مەرکەز تەدریبی کەرکوك. پاش ماوەیەکی تر هەردووکمان نەقڵکراین بۆ (مدرسە الموسیقی العسکری) لە باب المعظم بەرامبەر کۆلێژی ئەندازیاری. لەوێ کاتێ لێپرسراوی خوێندنگەکە زانی دەرچووی زانکۆینو برادەری تری عەرەبیش هەر دەرچووی زانکۆ بوون لەوێ بوون ، زۆر یارمەتی داین، وتی ڕۆژانە بۆ خۆتان سەرپەرشتی باخچەکەی دەرەوە بکەن.

لەسەر شەقامی ڕەشید بەرامبەر دوکانەکەی وەستا بەشیر لەئوتێلێکدا ژوورێکمان گرت مانگی بە دوانزە دینار. بەیانیان بەجلی مەدەنیەوە

دەچووین بۆ دەوام بەرامبەر خوێندنگای مۆسیقای سەربازیی لەئوتێلێکی کۆنـدا یـەکی بەقـەد شـوێنی بزمارێکمـان وەرگرتبـوو ، کـە جلـە سەربازییەکانمان پیادەکردو خۆمان لێ دەگۆڕی. بەیانیان تا کاتژمێری نۆ لـەوێ ئـەبووین و پاشـان ئەچـووین لـە ئوتێلەکـەی بەرامبـەرمان خۆمـان دەگۆڕی و من ئەچووم بۆ رۆژنامەی هاوکاری کەنزیك شوێنی سەربازییەکەم بوو ، لە (دار المجاهد) ئەویش ئەچوو بەلای کاروباری چالاکی کۆمەڵەوەو نیـوەڕوان پـێش دەوام تـەواو بـوون، خۆمـان دەگۆڕیـەوەو دەچـووینەوە بـۆ شوێنی سەربازییەکەمان. لەناو سەربازگەکەشدا هەمیشە باسی رۆشنبیری و بزوتنەوەی کوردایەتیمان بۆ ئەکردن .

جارێکیان رۆژی عارفە بوو بەتەمای ئەوە بووین، ئیجازەمان بدەنێ بۆ جەژن و بگەڕێینـەوە بـۆ سلێمانی. مامۆستا عـەزیز چاوەڕێی ئـەوەی ئـەکرد تـا ئیجازەکـە دەردەچـێ. وتـی: کـارێکی پێویسـتم هەیـە دەچـمە دەرەوەی سـەربازگەکە زوو دەگەڕێمـەوە، پـاش ماوەیـەك لێپرسـراوی سـەربازگەکە کۆیکردینـەوە بـۆ پیرۆزبایی جـەژن و ئیجازەکانمـان بـداتێ ناوی مامۆستا عەزیزی خوێندەوە لەوێ نەبوو. بڕیاریدا ئیجازەکەی رەتبکاتەوەو بۆ ماوەی چوار رۆژ زیندانی کرا نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی و جەژنەکەی لەوێ کـرد هـەر ئـەو رووداوە بووەهـۆی ئـەوەی ماوەیـەك دوای مـن لەسـەربازیی رزگاری بێت .

پاش تەواوکردنی سەربازی بۆ جارێکی تر هەردووکمان ناومان دەرچوو بۆ دامەزرانـدن وەك مامۆسـتا لـە قـەزای (عزیزیـە) ئـەو پەیوەنـدیکرد بەکارەکەیەوەو مـن پەیوەندیم نەکرد، لەبەر ئەوەی مـن رۆژانە لەرۆژنامەی هاوکاری و برایەتی و رۆشنبیری نوێ کارم دەکرد ، ماوەیەك لەیەکتر دابڕاین،

پاشان لەشۆڕشی ئەیلوولدا لەمانگی حەوتی ساڵی ١٩٧٤ جارێکی تر لەناوپردان و چۆمان یەکمان گرتەوە ، چەند رۆژێك بەیەکەوە بووین ، دواتر گەڕایەوە بۆ ناوچەی پێنجوین ، لە ڕۆژانی کۆتایی نسکۆدا لەدەربەندی رایات جارێکی تر چاومان بەیەکتر کەوتەوە ، چاوەڕێی ئەوە بووین کە شۆڕش بەردەوام بێت، دوایی رووماکردە ناوچەی پێنجوێن پاش چەند رۆژێك گەڕاینەوە بۆ سلێمانی بۆ جارێکی تر لەیەکتر دابڕاین ، بەڵام هەمیشە دەنگوباس و هەواڵی یەکترمان دەزانی.

لەمانگی شەشی ساڵی ١٩٧٨دا زانیم کە مامۆستا عەزیز لەلایەن رژێمەوە دەستگیر کراوە لەماڵێکدا لەسلێمانی. پاش ئەوەی بەندیخانەکەی گواسترایەوە بۆ قەسابخانەکەی موسڵ ، چەند جارێك سەردانم کردو لەسەردانەکاندا هەمیشە رووخۆش و دەم بەپێکەنین و ورە بەرزو خۆڕاگر و گەشبین بوو ، دەیگوت: گیانبەخشین لەپێناوی گەل و نیشتمان و بیرو باوەڕدا ، هێمای سەربەرزی و سەروەریە بۆ خۆمان و هاوڕێکانمان و حیزب و بیروباوەڕی پۆڵاینمان و نەوەکانی داهاتوومان. بۆیە پێویستە خۆڕاگرو قارەمان و پشوو درێژ بین بەرامبەر جەلادەکانی دوژمن ، لەکۆتاییدا سەرفرازی و سەرکەوتن بۆ ئێمەی کورد دەبێت. جارێکیان پێش لەسێدارەدانی پێی وتین کە ئەڕۆینە دەرەوە بەلای چەپدا سەیرکەن ئەوە ژووری لەسێدارەدانەکەیە. کاتێ هاتینە دەرەوە سەیرمان کرد ژوورێکی زۆر ترسناك و تاریك چەند پەتێکی سێدارەی پیادا هەڵواسرابوو.

لەمانگی سێی ١٩٧٩ کاك جەزا عەلی شاپوور ئاگاداریکردم کەبڕیاری لەسێدارەدانی مامۆستا عەزیز دەرچووەو بەیانی جێ بەجێ دەکرێت. هەرئەو رۆژە لەگەڵ کاك جەزاو برادەرێکی تردا چووین بۆ قەسابخانەکەی

موسڵ ، بۆ ئەوەی دواجار دیدەنیی هاوڕێو براو دۆستی دێرینم بکەم. بەڵام بەداخەوە کاتێك گەیشتینە ئەوێ ژمارەیەکی زۆر لەهاوڕێو دۆستو برادەرانو خزمو کەسو کاری مامۆستا لەبەردەم بەندیخانەکەدابوورن. پۆلیسەکان خەڵکەکەیان دوورخستەوە، پاشان پێیان راگەیاندین کە دیدەنی مامۆستا عەزیز نییە، تەنها بۆ خێزانو خوشكو دایکی نەبێت، بەهەڵە نەچووبم سەبریەخانی خێزانیو کاك یونس چووبوون بۆ بەغداد کە حوکمی لەسێدارەدانەکەی رابگیرێ، چونکە بەڵێنیان دابوو. بەڵام دیار بوو بێ سوود بوو لەدەوروبەری نیوەڕۆدا بوو، بەئۆتۆمبیلێك گەیشتنە بەردەم بەندیخانەکەو ئەوانیان کردە ژوورەوە بۆ بینینی بۆ دواجار، بەزۆر بڵاوەشیان بەخەڵکەکە کردو ئێمەش بەغەمو پەژارەو نیگەرانیەکی زۆرەوە ملی رێگامان گرتو گەڕاینەوە ، ئەو ئێوارەیە بارانێکی زۆربوو ئاسمانیش شینی بۆ ئەو کەڵە پیاوە دەکرد.

لەسەعات دوانزەی شەوی ٢٤/٢٥ی مانگی سێدا رۆحی پاکی گەیشتە کاروانی شەهیدانو گەیشتە هاوڕێو هاوبیرەکانیو مێژوویەکی پڕ لەسەروەریو شکۆمەندی بۆ خۆی تۆمارکرد.

شەهیدی نەمر بەراستی هاوڕێیەکی دڵسۆزو بەوەفاو چالاكو گەشبینو بەورە بوو ، لەبواری رێکخستنو کارکردندا و ئازاو چاپوكو چاونەترسو بەهەڵمەت بوو، کوڕی تەنگانە بوو لەزیندانیشدا پاڵەوانو خۆراگر بوو. مامۆستا عەزیزی نەمر هەمیشە رووخۆشو دەم بەخەندەو قسەخۆشو رەفتار جوانو خۆشەویستی قوتابیان و پێشمەرگەو هاوڕێکانی بوو ، هەرچیبوترێو بنووسرێ لەئاستی ئەوشەهیدە نەمرەدا هێشتا کەمە .

# چەند پەیڤێك بۆ هاوڕێی زیندانم

## باپیر محەممەد عەباس

سالآنێك بوو بیرم لەنووسینەوەی ژیاننامەی شەهیدی سەرکردە (مامۆستا عەزیز) دەکردەوە ، ئەوەش ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کەبۆ ماوەیەك لەزینداندا لە (هەیئەی کەرکوك) بەیەکەوە بووین ، ئەو یادگاریو کاتە پڕ لەڕووداو و بەسەرهاتە گرنگانە ئەگەر کەمیش بن بەلامەوە زۆر گەورەن ، بەوە خزمەتێك بەگیانی پاکی شەهید مامۆستا عەزیزو ڕێبازەکەی دەکەم .

سالّی ١٩٧٨ بوو لەهەرێمی (١١)-ەی ئەو کاتە پێشمەرگە بووم ، لەناوچەی پشدەر ، زستانێکی سارد بوو، بارەگاکەمان لەنزیك ناوچەی نێوان سەردەشتو قەلآدزێ لەسەر سنووری ئێران بوو، بەفرێکی زۆر بارببوو ناوچەکەش تا بلّێی کوێستان بوو، هەرێمی (١١) لەنزیك گوندی (بێوران) لەدۆلێکدا بارەگامان دانابوو پێیان ئەوت (دۆلی قەلێدە) ، ڕژێمی شای ئەوکاتە لەگەلّ ڕژێمی عێراقدا پەیمانێکیان ئیمزا کردبوو ، کەهێرش بکەنە سەر سنوورەکانو هاوکاریی یەکتر بکەن ، ئێرانیش بە پەیمانی نهێنی لەگەلّ ڕژێمی عێراقدا بڕیاریدابوو، کەپێشمەرگە تەسلیم بەڕژێمی عێراق بکاتەوە لەکاتی گرتنیاندا، ئەوەبوو ڕژێمی عێراق هێزێکی زۆری لەسوپاو جاش هێنایە نزیك بارەگاکانی سەرکردایەتی لەناوزەنگو نزیك سنوورەکانی ناوچەی (بێوران) بنکەکانی ئێمە، لەوێو لەشەوێکدا نامەیەکی بەڕێز (مام جەلال)هات بۆمان کەئەوکاتە من فەرماندەی مەفرەزە

بووم لەهەرێمی (١١) ، تیایدا هاتبوو بۆ گشت هەرێمەکان ماوەیەکە رژێم هێزێکی زۆری هێناوەتە سنوورەکان، بەهاوکاری لەگەڵ شای ئێراندا . پێویستە هەندێکتان لەدێهاتەکانی ئێراندا خۆتان حەشار بدەن بەنهێنی و ئەوانی تریش بگەڕێنەوە بۆ نزیک شارەکانی عێراق، بۆ ئەو دێهاتانەی کەڕانەگوێزراون و نزیك شارەکانن، هەندێ دێهاتی نزیك شارەکان ئەو کاتە راگوێز نەکرابوون، بۆئەوەی تیا بحەوێنەوە تاکو ئەو بارودۆخە کۆتایی دێ ، چونکە دوژمن هێزی زۆری بەرەو سنوور هێناوە .. بووین بە دوو بەشەوە ، هەندێکمان بەرەو دێهاتەکانی نزیك قەلادزێ و شارەکانی عێراق ، هەندێکیش بەرەو دێهاتەکانی نزیك سەردەشت لەناو ئێراندا ، ئەوەبوو کەرتەکەی ئێمە بڕیارماندا کەبەرەو گوندەکانی (بێوران و نیشکۆلان) بڕۆین بەرەو ئەوێ کەوتینەڕێ ، بەگەیشتنمان لەناو گوندەکە خۆمان حەشاردا ، چەند رۆژێك بەنهێنی ماینەوە، دوای ئاشکرابوونمان لەلایەن کەسێکی پیاوی ساواکەوە ئیخباری کرابووین بەهێزێکی گەورە لەسوپاو چریك دەورە دراین ئەفسەری فەرمانەدەی ئەو هێزە (مولازم ئەوەل- ئاغای ئیبراهیمی)بوو ، پێی وتین کە ئێمە خۆمان تەسلیم بەئەوان بکەین بەبێ شەڕ دوایی ئازادمان ئەکەن، وتی ئێوە عێراقین و ئێمە هیچ پەیوەندیمان پێتانەوە نییە تەنها یەك دوو رۆژ لای ئێمە دەمێننەوە دوایی ئازادتان دەکەین ، بەلام زۆر بەداخەوە پەیمانەکەی نەبردەسەرو بەگرتنمان دوای چەند هەفتەیەك لەسنووری (خانە) و (پیرانشار)ەوە تەسلیم بەسوپای عێراق کراینەوە. بەخۆمان و چەکەکانمانەوە لەناوچەی چۆمان بەهەلیکۆپتەر براین بەرەو هەولێر و لەوێشەوە بەرەو کەرکوك، واتە من و ئەو سێ پێشمەرگەیەی لەگەڵمدا گیرابوون بردینیان بەرەو شوێنێك کە پێکهاتبوو لەچەند ژوورێك

هەریەکەمان بەرەو ژوورێك برایین، کاتێك یەکێك لەدەرگاکانیان کردەوە منیان فڕێ دایە ژوورێکەوە .. بەهەر چوارلای ژوورەکەدا خەڵك دانیشتبوو ریش درێژ .. رەنگ زەرد لەوە ئەچوو ماوەی چەند مانگێك بێت لەوێ مابنەوە، یەکێك لەوان خڕپلەیەکی سمێڵ رەش بوو بەهێمنی هاتە لامەوە، وتی تۆ کێی و لەکوێ گیراوی ؟ هەموویم وەك خۆی بۆ باسکرد بەڵام دوای ئەوەی تێیگەیاندم کەئەوانیش پێشمەرگەن و گیراون ، وتی هیچ مەترسە هەموومان وەکو تۆین ، ئینجا من پرسیارم لێکرد کەتۆ کێی‌و ناوت چییە؟ وتی : من (مامۆستا عەزیزم) ئەم برادەرەی تەنیشتیشم کاك (عەبدولڕەزاق)ە . ئینجا کەوتە رێنمایی کردنم پێی وتم کەپێویستە لەوێ چۆن هەڵس‌و کەوت بکەم ، پێی وتم نابێ ئیعتراف بکەم ، نابێ نهێنی شوێن‌و جێگای پێشمەرگە بدرکێنم ، تێیگەیاندم کەئەگەر نهێنییەکیان بدرکێنم ئەوا ئیعدام دەکرێم ، تێیگەیانم درکاندنی نهێنیەکانی شۆڕش کەڵکی نییەو خراپە ، خۆڕاگری کاری مەردانەیە . زۆر رێگاو شوێنی بۆ دانام من پێشتر مامۆستا عەزیزم نەبینی بوو ، پیاوێکی لەسەرخۆو هێمن بوو . هەرجارێ منیان ئەبرد بۆ لێکۆڵینەوە، ئەیانهێنامەوە ژوورەکە بەبێ هۆشیی، کەخەبەرم دەبۆوە (مامۆستا عەزیز) لەسەر سەرم بوو وەرزشی بەقاچ‌و دەستم ئەکردو ئاوی بۆ ئەهێنام تاکو ئەهاتمەوە حاڵەتی ئاسایی خزمەتی ئەکردم. دوای ماوەیەك لەزمانی یەکێك لەگیراوەکانەوە زانیم کە (مامۆستا عەزیز) ئەندامی سەرکردایەتی (ی.ن.ك)ە، چونکە خۆی باسی نەئەکرد، بەڵام رۆژێك مامۆستا عەزیز بۆی باسکردم کەپێش ئەوەی بێتە ئەم ژوورە، لەژوورێکی (ئینفرادی) تەنیا بووە، بۆ ماوەیەك باسی ئەوەی دەکرد کەلەوێ بێزار بووە بەتەنیاو توندو تیژیی دەروونییان بەکارهێناوە لەگەڵیدا. بۆمان دەرکەوت

دوای گرتنی مامۆستا لەسلێمانییەوە راپۆرتی زۆری لەسەر هاتووە کەئەم پیاوە ئەندامی سەرکردایەتییەو ئەوەش زیاتر وایکرد پیاوانی رژێم گرنگییەکی زیاتری پێبدەن و بەقوولی لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن .

زۆرجار بۆ زاخاوی مێشک من و مامۆستا عەزیزو کاک عەبدولرەزاق لەسوچێکدا دادەنیشتین یادگاریمان ئەگێڕایەوە زۆرجار بەمنی ئەوت ئەگەر ڕۆژگارێك هاتە پێشەوە بەربووین ئەبێ بەهاوڕێی هەتا هەتایی یەکتر، ئەو ژوورەی ئێمەی تیابووین کۆمەڵێك پێشمەرگەی تریشی تیابوو ، کەهەریەکەیان خەڵکی ناوچەیەکی کوردستان بوون. هەرکاتێك یەکێك بانگ بکرایە بۆ لێکۆڵینەوە مامۆستا عەزیز پێش رۆیشتن رێنمایی ئەکردو ورەی بەرز ئەکردەوە، کە ئەیانهێنایەوە ئەگەر زوو پەنجە مۆری بکردایە ئەیوت ئیعترافی کردووە ، زۆر رقی لەوانە بوو کەئیعترافیان دەکردو نهێنییان ئەدرکاند ، (شەهید عەبدولرەزاق)یش یەکێك بوو لەوانەی کەزوو زوو لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا ئەکرد ، چونکە ئیعترافی نەئەکرد بۆیە زۆر ئازاریان ئەدا. بەبێ هیچ ئیعترافێکیش (١٠) ساڵ حوکمیاندا ، ئەوکاتە کەسەرەتای شۆڕشی نوێ بوو ، هەرکەسێك پێشمەرگە یان ئەندامێکی رێکخستن دەستگیربکرایە زۆربەی حوکمی ئیعدام ئەدران ، رژێم شوێنێکی لەکەرکوك دروست کردبوو، بەناوی (هەیئەی خاصە) کەتایبەت بوو بەکوردستان. بۆئەوەی شۆڕش پەرە نەسێنێ ئەوپەڕی ئازارو توندوتیژی تیادا بەکار ئەهات. ئەم دەزگا سەرکوتکەرە ئەو کاتە پێیان ئەوت (مکتب صدام لشؤون الشمال) واتە نووسینگەی سەدام بۆ سەرکوتکردنی شۆڕشی کورد، کەئەوکاتە سەدام جێگری سەرۆك کۆمار بوو.. هەیئەی کەرکوك ئەوکاتە پێکهاتبوو لەچەند ژوورێك، ئەو ژوورەی ئێمەی تیابووین دوو ژوور بوو

نێوانەکەی لابرابوو کرابوو بەیەك ژوور. جاری واهەبوو ژمارەمان ئەبوو بەهەشتا کەس بەچەند دووشەممە جارێك کۆمەڵێك ئەبران بۆ دادگاییکردن. ئەو دادگایەش (مەحکەمە خاصە)بوو کەدووسەد مەترێك لەهەیئەی خاصەوە دووربوو، ئەو دادگایەش دادگایەك بوو تایبەت بوو بەکورد دادگایەکی یاسایی نەبوو دادوەرەکانیش خەڵکی عەسکەری بوون ، هەریەکەو لەشوێنێکەوە هاتبوون .

لەبەرئەوەی ماموستا عەزیز چەند مانگێك لەپێش ئێمەوە گیرابوو، لێکۆڵینەوەی تەواو بوو بوو، ئامادەکرابوو بۆ دادگاییکردن، ئەوەبوو رۆژێکی دووشەممە ناو خوێندرایەوە ناوی ماموستا عەزیز یەکێك بوو لەوانە کاتی دادگاییان تەواو بوو ، بۆ شەویٚ کەگەڕانەوە لای ئێمە و زانیمان ماموستا عەزیز حوکمی ئیعدام دراوەو کاك عەبدولرەزاقیش بە(١٠) ساڵ زیندانیی ، دوای ئەوانیش بە مانگێك ئێمەش بەرەو (دادگای خاصە) براین، دوای ماوەیەك هەواڵمان پیٚ گەیشت کە (ماموستا عەزیز) لەزیندانی موسڵ پەلاماری یەکێك لەجەلادەکانی داوەو گوێچکەی قرتاندوە، بۆئەوەی رق و کینەی شۆڕشگێڕانەی خۆی لەوێش بسەلمێنیٚ کە دەستەوەستان نییە بەرامبەر ئەو جەلادانە کەداوای رەوایی میللەتێك ناسەلمێنن لەبەرئەوە ماموستای نەمر (ماموستا عەزیز مەحمود) کەم ژیان و کەڵ ژیانی هەڵبژارد. .. سڵاو لەگیانی پاکی شەهیدی نەمرو هاوڕێی زیندانم (ماموستا عەزیز مەحمود) . حەزدەکەم بزانین ئەو سیٚ پێشمەرگەیەی لەگەڵ مندا دەستگیرکرابوون ئەمانە بوون :-

- سەلیم سەلیم خدر حوکمی ١٥ ساڵ دراو خەڵکی - پشدەر- و ئەندامی فەرماندەیی بوو .

- سلێمان رەسوڵ حوکمی ئیعدام دراو خەڵکی مەرگە بوو .
- رەشید هەمزە وسو حوکمی ئیعدام دراو خەڵکی پشدەر بوو .
منیش بە (١٥) ساڵ حوکمدرام ..

**هەزار سڵاو لەگیانی شەهید سلیمان و رەشید هەمزەی هاوڕێمان**

# شەهید عەزیز لەساڵی یەکەمی خوێندندا زۆربەی خوێندکارەکانی ڕێکخست

عەبدولقادر حەمەئەمین محەمەد

پاش ئەوەی خوێندنم لەئامادەیی (وەتەن)ی کوڕان لەسلێمانی تەواوکرد، کـە بینـای قوتابخانەکـە بینـای ڕێکخـراوە دیموکراتییـەکانی ئێسـتایەو لـەڕۆژانی ڕژێمـدا (دائیرەی ئـەمن) بـوو، سـاڵی ١٩٦٨، کەچووینە زانکـۆی بەغداد –لەکۆلیژی زمان– بەشی کوردیی وەرگیراین، دواتر بوو بە کۆلیـژی ئاداب، لـەقۆناغی یەکەمدا بەرێکـەوت لەگـەڵ شـەهید (عـەزیز مـەحمود) دا لەیەك گرووپی خوێندن بووین و بووینە هاوڕێی یەکتریی ، لەماوەی ئەو چوار سـاڵەی کۆلیـژدا، هـەروەها لـەڕووی ڕێکخراوەیشـەوە شـەهید عـەزیز لێپرسراومبوو .

کوڕێکی دڵسۆزو دەستپاك و چالاك بوو، هەمیشە خۆی بە خوێندکارێکی پێشـەنگ دەزانـی ، هـەر لـە سـەرەتای سـاڵی یەکـەمی خوێندنـەوە زۆربـەی خوێنـدکارانی ڕێکخسـت، دوای خوێنـدنی وانـەکانیش دەگـەڕا بەسـەر هاوڕێکانیـدا لەگـەڵ خۆیـدا دەیبردن بـۆ مەکتـەبی ڕووناکبیری لـە(شـارع سعدون) بۆ وەرگرتنی ئەو کتێب و گۆڤارو نامیلکانەی، کە لـەو کاتانەدا باو بوون .

شـەهید عـەزیز خوێنـدکارێکی هێنـدە زرنـگ بـوو، هەمیشـە بابەتـە سیاسیەکانی دەخوێندەوە، لەسـەفارەتی (چین) لەبەشە ڕووناکبیریەکەیدا

هاوبەشیی هەبوو، ئەو نامیلکەو گۆڤارانەی وەردەگرت، کەلەسەر (ماوتسی تۆنگ) بوون دوایش، کە دەگەڕایەوە بۆ شوقەکە بەسەر هاوڕێکانیدا دابەشی دەکردو پێی دەوتین (با فیکرتان فراوان بێت).

کاتی خۆماڵی کردنی نەوت، منو شەهید عەزیزو شەهید یاسین کەرکوکی لەیەکێك لەیانەکانی گەڕەکی (اعظمیة) دانیشتبووین لەکاتی خوێندنەوەی بەیانەکەدا لەلایەن (ئەحمەد حەسەن بەکر)ەوە شەهید عەزیز هەستایە سەرپێ و دەستی کرد بەچەپڵەلێدان و وتی کوڕینە (ئەمە سەرکەوتنە خواردنەکەتان لەسەر منە) .

ئەوەی زیاتر کاریگەریی هەبوو لەسەر شەهید عەزیز، کارەساتە دڵتەزێنەکەی هاوڕێمان شەهید یاسین بوو، کە بەکاری ڕێکخراوەیی چووبوو بۆ کوت لەڕێگا بەکارەساتی ئوتومبیل شەهید بوو، بەتایبەتی ئەوکاتەی بۆ پرسەکەی چووینە گەڕەکی ئیمام قاسم لەکەرکوك، لەماوەی ئەو دوو ڕۆژەدا کە لەکەرکوك بووین جامانەکەی لەمل ئاڵاندبوو دەگریا .

# هەڵوێستی مرۆڤانەی شەهید عەزیز

**فایەق شێخ عومەر**

ساڵی ١٩٦١ کە شۆڕشی ئەیلول بەرپابوو ، من بەڕێوەبەری قوتابخانەی (عەبابەیلێ) بووم . لەچەند بوارێکدا یارمەتی ئەوکاتەی شۆڕشمدەدا ، پاش شکستی لەشکری کوردستان لەدەربەندیخان و بازیان ، ئەوەبوو رژێمی ئەو سەردەمە دەستی کرد بەگرتنی ئەوانەی یارمەتی لەشکری کوردستانیان دابوو ، منیش یەکێك بووم لەوانەی کەبەندکرام و بردیانین بۆ دەربەندیخان و دوایی بۆ سلێمانی ، لەرێکەوتی ١١/١٠/١٩٦١دا لەو کاتەدا خێزانەکەم تازە منداڵی بوو بوو ، کچی پووری خوالێخۆشبوو مامۆستا عەزیز بوو ، لە سلێمانیەوە باوکی خێزانەکەم شەهید عەزیزی ناردبوو بۆ گوندی عەبابەیلێ بزانێت چی پێویستە بیکات ، گەڕابۆوە بۆ سلێمانی بارودۆخی خێزانەکەمی باسکردبوو ، هەر ئەو رۆژە بۆ جاری دووەم گەڕابۆوە بۆ عەبابەیلێ ، خێزانەکەم و منداڵەکەی هێنابوو بۆ سلێمانی ئەمە نیشانەی هەستی خزمایەتی و کوردایەتی و دڵسۆزی شەهیدی نەمر بووە .

١/١/١٩٧٠ بوو ، خێزانەکەم تووشی شەلەلی نصفی بوو ، بردمان بۆ بەغدا بۆلای دکتۆر لەگەڵ خورشیدەخانی دایکی شەهید عەزیزدا ، کە زانیبووی لەبەغداین ، بەپەلە هات بۆلامان کەخێزانەکەم برد عەزیز بەکۆڵی خۆی سەری ئەخست بۆ لای دکتۆرەکان ، لەهەمان کاتدا خزمەتێکی زۆری

کردین ، هەر لەوکاتەدا بوو وتی کاك فایەق مژدەی دەرچوونی رۆژنامەی هاوکاریت ئەدەمێ .

لەساڵی ١٩٦٤دا ماڵمان لەگەڕەکی گۆیژە بوو نزیك ماڵی ئەوان ، جارجار ئەچووین بەمیوانیی بۆلای خورشیدە خان، شەهید عەزیز کەم ئەکەوتە ماڵەوە ، کەهاتەوە سەیری کرد من زۆر بێ تاقەتم وتی کاك فایەق بۆچی بێ تاقەتی؟ وتم: عەزیز گیان نەوزادی برام لێم عاجز بووەو ئەیەوێت واز لەخوێندن بهێنێت. وتی: لەکوێیە ؟ وتم لەماڵی خوشکمە، چووە دەرەوە پاش چارەکە سەعاتێك نەوزادی هێنایە ژوورەوە ئاشتیکردینەوە ، بووە هۆی دەرچوونی نەوزاد لەو ساڵەدا ئەگەر دڵسۆزیی و لەخۆبوردوویی نەبێت وابزانم کەم کەس هەبێت وابەتەنگ خەڵکەوە بێت و هەرزوو بەدەنگییەوە بچێت .

ساڵی ١٩٧٩ ماڵمان لەگەڕەکی سەرشەقام بوو (جهان)ی خوشکەزای بەپەلە خۆی کرد بەماڵا وتم جیهان گیان ئەوە چییە ؟ وتی خاڵم لەبەندیخانەی موسڵە ، بەپەلە رۆیشتم بۆلای نازەنین خانی خوشکی خەبەرمانداو چووم پاسێکی (٢١) نەفەریمان گرتو سەعات شەشی بەیانی کەوتینەڕێ بۆ موسڵ ، ئەو رۆژە مواجەهە نەبوو ، ئێمەش خزمان چووینە ئوتێل (لوبنان) ئەو شەوە ماینەوە ، بۆ رۆژی دوایی لەبەر دەرگای سجن ئامادەبووین ، بۆ بینینی چووینە ژوورەوە پاش مۆری دەست و لێپرسینەوەو جنێوی زۆرو قسەی ناشیرین لەحەوشە بچووکەکەی بەردەم ژوورەکانی سێدارە ، کاتێك بەجلی سێدارەوە هاتە دەرەوە هەموومان دەستمان کرد بەگریان و ئەویش بەقاقای پێکەنینەوە بەڕووی خۆشەوە هاتە دەرەوە، هاوڕێکانی ژووری سێدارە زۆر سەریان سووڕما لەقارەمانێتی

شـەهیدی نـەمر ، بـەمجۆرە (٦–٧) جـار بینیمـان کـە ئەمـەش نیشـانەی ئازایەتی شەهیدی نەمر بوو .

جارێکیـان لـەکاتی مواجەهـەدا لـە (زینـدان)دا ، لاوێکـی تەمـەن (١٦–١٧) ساڵم بینی بەبریـنداریی ، بە (دارشـەق)هاتووچۆی ئەکرد ، زۆر ناڕەحـەت بووم‌و خەفەتم خوارد ، وتم عەزیز گیان ئەم لاوە لەگەڵ ئێوەدایە وتـی بەڵێ پێشمەرگە بوو لـەپردێ گیراوە ، بەڵام تـا ئێستا کـەس‌و کـاری نـەیانزانیوە، هەر لەو کاتەدا ژمارەیەکی زۆر لـەبرادەرانی شـەهیدی نـەمر لـەوێ بـوون وەك بەڕێز کـاك (عومـەر فـەتاح) و (شـەهید رەفیـق تۆفیـق)ی خزمـی‌و ژمارەیـەکی زۆر ئەندازیارو دۆستی شەهیدی نەمر لەماوەی چەند دەقیقەیەکدا بڕێ پارە کۆکرایـەوەو پێشـکەش بـەو لاوە بریـنـدارە کـرا، لەهـەمان کاتـدا ناونیشـانی تەواویان لێ وەرگرت‌و لەگەڕانەوەماندا لە هەولێر لامان دایە ماڵی باوکی کـە خـەڵکی هـەولێر بـوو ، پێمـان راگەیانـدن. بـۆ جـاری دوایـی هاتینـەوە بـۆ مواجەهە تەماشامانکرد ژمارەیەکی زۆر خزم و کەسوکاری هاتبوون بۆلای . ئەمەش نیشانەی دڵسۆزی‌و وەفاداری بـوو بۆ تێکۆشـەرانی گەلەکـەی لـەناو زینداندا .

لە ١٩٧٩/٣/٢٣ بوو هـەر لەسەرشـەقام بووین ئێوارە بـوو، بەپەلـە جیهـانی خوشکەزای هات‌و وتی ، کاك فایەق بروسکەی لەسێدارەدلنی خاڵم هاتـووە ، ئەبێت بچین بۆ موسڵ، هەروەك جاران‌و بەخێرایی پاسمان گرت‌و رۆیشتین بۆ موسڵ ، بەڵام زۆر بەداخـەوە نەیانهێشـت ئێمە مواجەهـەی بکەین ، تـەنها دایکـی‌و خێزانەکـەی‌و خوشـکەکانی نـەبێت ، زۆر دڵگـران بـووین بەغـەم و پەژارەیەکی زۆرەوە گەڕاینەوە بۆ سلێمانی .

پاش حەفتەیەك لەگەڵ خزمان چووین بۆ سەر قەبران لەڕێگای (تەلەعفەر) کام سەرقەبران کام گۆڕ ئەمەیان زیاتر کاری تێکردم هەتا ماوم لەبیرم ناچێتەوە ، ئومێدەوارم خوێنیان بە فیڕۆ نەچێت ...

# شەهید عەزیز

## (شۆڕشگێڕو کوردپەروەر ... قارەمانی بەر پەتی سێدارە)

**محەممەد شێخ عبدولکەریم سۆڵەیی**

لەمێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلاندا، کەسانی تێکۆشەری ئەوتۆ هەڵکەوتوون، کە رۆڵی شۆڕشگێڕییان لەلوتکەدا دەدرەوشێتەوە. بەشێوەیەك نەترسانە، خەمخۆرانە، دڵسۆزانە، گەشبینانەو نەفەس درێژانە شەویان خستۆتە سەر رۆژو بەسات بەرنامەی کارکردنیان، لەپێناوی سەرکەوتنی رێبازەکەیاندا فەرامۆش نەکردووە. بەرپەرچی جەسوورییەوە چەلەنگانە بەگژ هەموو بەرنامەو سیاسەتێکی دوژمنکارانەی دوژمناندا چوونەتەوە ... زیرەکانە بەرنامەیان بۆ دەستوەشاندن و پووچەڵکردنەوەی سیاسەتی دوژمنان دارشتووە . سڵیان لەراوەدونان و گرتن و ئەشکەنجەو گوللەو شەونخونی و زیندان و پەتی سێدارە نەکردۆتەوە ، گوللەیان بەگوللە وەڵامداوەتەوە. زیندان و ئەشکەنجەیان بەخۆڕاگری و ریسواکردنی جەندرمەکان شکاندۆتەوە. کونجی تاریکی بەندیخانەیان کردۆتە قوتابخانەو وانەی شۆڕش و شۆڕشگێڕییان تیادا وتۆتەوە ، لەمێژووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی گەلی کوردیشدا، دەیان و بگرە سەدان تێکۆشەر لەگۆڕەپانی خەباتی نهێنی و زیندان و پێشمەرگایەتیدا هەڵکەوتوون، بەبیروباوەڕی شۆڕشگێڕی پێشکەوتنخوازو کوردپەروەرانە، خەبات و کوردایەتییان کردوە. لەپێناوی بەرگری و بەدەست هێنانی مافە رەواکانی گەلەکەماندا ،

چاوی دوژمنانیـان شـکاندوەو سیاسـەتی رەگەزپەرسـتانەی رژێمـە یـەك لەدوای یەکەکانی داگیرکەرانیان ریسوا کردووە . یەکێك لەو تێکۆشەرانە، کـە بێباکانـە لەبەرامبـەر سیاسـەتەکانی رژێمـدا راوەسـتاوە ، لەئـەنجامی خـەباتی نهێنـی و پێشـمەرگایەتیدا ، لـەکونجی زینـدانی فاشـیەکاندا، پـەتی سـێدارەی بەعسـی سـەر شـۆڕو شـەرمەزار کـردووە ، ملـی بـەرزی کوردپەروەرانـەی لەبـەردەم مەرگـدا کەڵەمێردانـە بـەرز راگرتـووە. رۆڵـەی جەربەزەو بەئەمەك بۆ نەتەوەکەیی و خاکی پیرۆزی کوردستان ، مامۆستای شەهیدی بەر پەتی سێدارەی قەسابخانەکەی موسڵ (عەزیز مەحمود)ی نەمر بـوو. نەبەردانـە مێژوویـەکی پـڕ سـەروەری بـۆ خـۆی و بنەماڵەکـەی و هاوڕێکانی و ڕێبازەکەی تۆمار کرد .

کاتێ دەمـەوێت قەڵەم بەدەستەوە بگرم . چەند بیرەوەرییەك بۆ مێـژووی ژیانی نەمریی بنووسمەوە. قەڵەمەکەم لەنێوانی پەنجەکانمدا ماندەگرێت ، رازی نابێت هەروا بەئاسایی ناوی ئەو کەڵە مێردە بهێنم و بەچەند دێـڕو لاپەڕەیـەك باسـی دلێـری و شـکۆداری بکـەم. بـەلام وەفـای هاوڕێیـەتی واملێدەکات بەنوازشەوە، زۆر لەپێنووسەکەم بکەم .. ئەوەی لەیادەوەریمدا تۆمارکراون بیاننووسمەوەو سەری خۆم و قەڵەمەکەم لەئاستی گەورەیی ئەو هاوڕێ بەئەمەك و تێکۆشەرو نەبەردو گەشبین و دڵسۆزە بۆ کوردو کوردستان دابنـەوێنم و ئەوەنـدەی لـەبیرم مـاوەو دەکرێـت تۆماریـان بکـەم و بیاننووسمەوە. بەکورتی بەم کارەم بتوانم مەڵۆیەك بخەمە سەر خەرمانی گەورەیی مێژووی ژیانی ئەو رۆڵە نەبەزە .

بـەو ئومێـدەی مێـژووی ژیاننامەکـەی ، بەرادەیـەك دەوڵەمەنـد بکرێـت کـە نـەوەکانی دوا رۆژی گەلەکـەمان، نـامۆ نـەبن بەمێـژووی بزووتنـەوەی

رزگـاریخوازی گەلەکـەمان ، بـزانن کـە لـەو بزوتنەوەیـەدا پیاوانـێ هـەبوون گیـانو ژیانیـان لـەپێناوی گەلەکەیانـدا بـەختکردووە ، سـەریان بـۆ دوژمنـان دانەنەواندوە، با ئەوەشیان لابەرجەستە بێت کە کورد، لەدێر زەمانەوە وەکو نەتەوەیـەکی دابەشـکراو ، خـاك داگیرکـراو بەدرێـژایی مێژووی تێکۆشـاوە ، خـەباتی کـردووە. لـەپێناوی سـەرفرازیو سـەربەخۆییدا ، قوربـانیی بـێ ئەنـدازەی داوە، لـەرۆژگارێکی وەکـو ئـەمڕۆدا ، کـەوا دەتوانرێـت ئـەم بیرەوەرییانەی تێدا بنووسرێتەوە، لەدووتوێی کتێبێکدا چاپ بکرێتو ئەو رۆژانەشی دوای ئەم سەردەمە کەدەتوانرێت بە ئاسانیو بەمتمانەوە. کتێبی چاپکراوی لەم بابەتـە لەکتێبخانـەی کوردیـدا بپارێزیـتو ئـەوەی نـوێ لێـی بەئاگابن.. کەئەمە ئەنجامی خەباتێکی دوورو درێـژی گەلەکەمانو بەرهـەمی رەنجو گیانبەخشینی سەدان رۆڵەی وەکو مامۆستا (عەزیز)ە ... دەفـەرموون لەرێگای ئەم یادەوەرییەوە تێکۆشەرێکی خەمخۆری گەلەکەمان بناسن .

## چۆنو کەی یەکترمان ناسی؟

سـاڵی خوێنـدنی (١٩٦١/ ١٩٦٢) لـەپۆلی دووی ناوەنـدیو لەقوتابخانـەی ناوەندی (جمهوری) لە گـەڕەکی سـەرکارێزی سلێمانی بۆ یەکەمجار لەسـەر دوو (رحلـە) بەتەنیشـتی یەکـەوە یەکترمان ناسـی . رۆژێـك (ئـەنوەر ئـەزوەر) کەخـەڵکی گونـدی زێـوێ بـوو ، پێش عـەزیز هـات لەسـەر رحلەکـەی عـەزیز دانیشـت . کەعـەزیز هـات بینـی لەسـەر کورسـییەکەی ئـەو دانیشـتووە تووڕەبـوو بـوو بشـەڕیان ، عـەزیز بـەتواناتر بـوو ئـەنوەری خسـتە ژێـر کورسـییەکانەوە بەهـەزار حـاڵ مـن (وشـیاری قالـە) ورگـە لەیـەکمان

جیاکردنەوە ، لەناکاو مامۆستا بەسەر شەڕەکەدا هاتەژوورەوە ، هەردوکیانی لەگەڵ موراقیبدا نارد بۆلای بەڕێوەبەر لەئەنجامدا ئەنوەر لەو قوتابخانەیە گوێزرایەوە .

ساڵەکە گەرمەی شۆڕشی ئەیلوول بوو. پێشمەرگە زۆر ناوچەی کوردستانی لەدەڤەری سلێمانی رزگار کردبوو.بنکەو بارەگایان لەچەندین ناوچە دانابوو. چالاکی پێشمەرگە لەگرتنی مەخفەرو بنکەی پۆلیس‌و کەمین دانان لەسەر شەقامە گشتییەکان ، دەستوەشاندن لەسوپاو سەرانی حکومەت رۆژانە بەردەوامبوو. حکومەتیان لەهەموولایەکەوە شپرزە کردبوو. حکومەتیش رۆژانە دەیان فڕۆکەی دەناردە سەر گوندو ناوچەکان ، بەناپاڵم‌و شەستیرو ساروخ بۆردومانی دەکردن .. چالاکی پێشمەرگەی نهێنی ناوشاریش، رۆژانە لەئەنجامی چالاکی‌و دەستوەشاندنیان شاریان دەخرۆشان‌و پیاوانی رژێم‌و دام‌و دەزگاکانیان دەشڵەژاند . وایان لێهاتبوو لەسێبەری خۆشیان سڵیان دەکرد ، متمانەیان بەنزیکترین کەسیان نەمابوو . کۆمەڵانی خەڵکی شارەکانیش بەهەموو توانایان‌و بەهەموو شێوەیەك یارمەتی شۆڕش‌و هێزی پێشمەرگەیاندەدا .

ئەو سەردەمە لەکوردستاندا دوو حزب دەوریان لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا دەبینی: یەکەم پارتی دیموکراتی کوردستان‌و دووەم حزبی شیوعی عیراق. هەردوو حزبەکە بنەمایەکی جەماوەریی فراوان‌و باشیان لەناو چین‌و توێژەکانی کۆمەڵی کوردەواریدا هەبوو.

پارتیی خۆی بەخاوەنی شۆڕش‌و پێشمەرگە دەزانی .. رێکخستنێکی فراوان‌و پتەوی لەناو شارەکاندا هەبوو. رەگی لەناو هەموو دام‌و دەزگاکانی حکومەت ، کاسبکاران ، کرێکاران ، مامۆستایان ، ژنان ، خوێندکاران ،

پۆلیس و سوپادا داکوتا بوو.. هێزی پێشمەرگە ڕووبەڕووی دەسەڵاتی حکومەت ڕاوەستابوو. دروشمی (کوردستان یان نەمان)ی بەرزکردبۆوە، حزبی شیوعیش بەهەمان شێوە بنەمای لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا هەبوو. خۆیان بەیەکەم دۆست و دڵسۆزی (عەبدولکەریم قاسم) و کۆماری عێراق دەزانی. حکومەتەکەیان بەحکومەتی خۆیان دەژماردو بەئاشکراو ڕاشکاوانە دژی پارتی و شۆڕشی کورد بوون.. شۆڕشیان بەیاخی بوون، پیلانی کۆنە پەرستان و ئاغاو دەرەبەگ دادەنا .

بۆیە بەهەموو شێوەیەك و زۆر بەتوندی لەدژی شۆڕش و پارتی پڕوپاگەندەی خراپیان دەکرد .. پارتیش سیاسەتی حزبی شیوعی بەسیاسەتێکی ناڕاست و هەڵەو وابەستەی عەبدولکەریم دەزانی .

لەهەموو قوتابخانەکاندا ، ڕێکخستنی هەردوو حزبەکە هەبوو. قوتابخانەی (جەمهور)یش یەکێك بوو لەو قوتابخانانەی پارتیش و شیوعیشی تیادا بوو. قوتابیان لەبەرئەوەی توێژێکی خوێن گەرم و بێ ئەزموون بوون . ڕۆژانە لەناو قوتابییانی سەر بە پارتی و شیوعی ململانێ و ناکۆکی دەخوڵقا .. (عەزیز) یەکێکبوو لەو خوێندکارە وریاو چاونەترس و چالاك و زیرەك و بزێوانەی کەبێ سڵکردنەوە کاری دەکرد .

عەزیز دووسەرە بۆ پارتی نیشی دەکرد. لەڕێکخستنەکانی پارتی و لەریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستانیشدا ، ڕۆژانە هەر دەهاتە قوتابخانە ، یەکەیەکە پەیوەندی بەقوتابیەکانەوە دەکرد ، هەوڵیدەدا ڕایانبکێشێت بۆ ناو ریزەکانی پارتی و قوتابیان ... بەیاننامەو بڵاوکراوەکانی پارتی ، هەواڵەکانی شۆڕش و پێشمەرگەی لەناو

دەفتەرەکانیدا دەهێنا بۆ قوتابخانەو دەیدایە قوتابیەکان ... چالاکییەکانی پێشمەرگەی بۆ باسدەکردن.

ئەگەر چالاکییەك لەبادینان یان هەولێر بکرایە ، چالاکییەکەش وەکو پێویستیش نەبووایە. عەزیز گەورەی دەکردو هەموو قوتابیانی قوتابخانەکەی تێدەگەیاند .

من ئەوکاتە شیوعی بوومو بەرپرسی رێکخستنی حزبی شیوعی قوتابخانەکە بووم ... بەهەمان شێوەی عەزیز منیش چالاكو بەهەڵپە بووم بۆ کارکردن ... هاورێیەتیمان یەکجار خۆشبوو ، متمانەی تەواومان بەیەکبوو... هەردووکمان لەناو قوتابیاندا خۆشەویستبووین ، عەزیز بە بەردەوامی هەوڵی لەگەڵدا دەدام کەواز لەحزبی شیوعی بهێنمو ببم بەپارتی ... منیش بەهەمان شێوە ، بەخەیاڵی خۆم هەوڵم ئەدا کە عەزیز بکەم بەشیوعی ... عەزیز لەو بڵاوکراوەو بەیاننامانەی پارتی کەدەیهێنان بۆ قوتابخانە بەشی منی دادەنا. منیش بەهەمان شێوە هەرچی بەیاننامەو بڵاوکراوەیەکی حزبی شیوعیم دەست دەکەوت دەمدا بەعەزیز... ئێمە سەرەرای ئەوەی لەپۆلدا لەتەنیشت یەکەوە دادەنیشتین لەپشووەکانیشدا لەحەوشەو رارەوی قوتابخانە هەر بەیەکەوە دەگەراین... هەر رۆژی بەیاننامەو بڵاوکراوەم بدایەتێ بۆ بەیانی دەکەوتە موناقەشە لەگەڵما لەسەر سیاسەتو بۆچوونەکانی حزبی شیوعی. ئەوەندە رێزی یەکمان لابوو. هەر کێشەیەك لەناو قوتابیەکاندا لە پارتی و شیوعی رووی بدایە ، بەهەردووکمان زوو بەزوو چارەمان دەکردو نەماندەهێشت گەورە بێت ...

پۆلی دوومان تەواوکرد، من بۆ هاوین چوومەوە بۆ سۆلە، پێش ئەوەی برۆمەوە ... وتی کە نمرەیان دا نمرەکانت بۆ دەنێرمەوە ، لەگەر بۆشم کرا

سەردانێکت دەکەم . وتی هیوادارم کەچوویتەوە سۆلەو پێشمەرگەت بینی بەعەشقی پێشمەرگەوە ولز لەشیوعێتی بهێنیت . وتی کاك عوسمانی عەلی بەگ لەو ناوەیە.. هەر ئیش و کارێکت هەبوو بەناوی منەوە بچۆرەلای بۆت جێبەجێ دەکات .

زۆری پێنەچوو کاتێکم زانی نامەیەکم پێگەیشت ، کە کردمەوە نامەی عەزیز بوو. لەگەڵ نامەکەدا نمرەکانی بۆ ناردبووم ، لەنامەکەدا سەرباری ئەوەی پیرۆزبایی دەرچوونی لێکردبووم. کۆمەڵێ دەنگ و باس و قسەی خۆشیشی بۆ نوسیبووم ، مژدەشی دابوومێ کە خۆشی دەرچووە ، نامەکە لەدوو سەرەوە بۆمن خۆشبوو. یەکەم هەواڵی عەزیزم زانی و دووەم مژدەی دەرچوونی هەردووکمانم وەرگرت .

## ساڵی خوێندنی ١٩٦٢ - ١٩٦٣ :

کاتی دەستپێکردنەوەی دەوام، چوومەوە بۆ سلێمانی ... کەل و پەلەکانم لەبەشی ناوخۆیی (دارولتەلەبە)دانا و راستەوخۆ چووم بۆ ماڵی عەزیز ، کە ئەوکاتە ماڵیان لەگەڕەکی سەرگۆڵ بوو. لەماڵەوە بوو.. وتی شێو بەیەکەوە دەکەین ، بەدایکی وت دایە قبوڵییەکمان بۆ بکە . وتی دایە دەزانیت ئەم (شێخە)مان شیوعیە ، توخوا شێخ و شیوعیان وتووە؟.. پورە خورشە وتی: ئەیەڕۆ... بۆ خاتری خوا شێخ و شیوعی...؟ وتی: عەزیز لەشێخی کوێیە؟ وتی: شێخی سۆلەو دێلێژەیە. پورە خورشە وتی کوڕە عەزیز ، شێخ رەزای دێلێژە زاتێکی زۆر موبارەك و چاکبووە . وەڵلا زۆرم پێ ناخۆشە ئەوەیان شیوعی بێت .

عەزیز وتی تۆ قوبلّییەکی چەورمان بۆ لێبنێ . خەمت نەبێ دەیکەمە پارتی .. ئەو دوو سێ سەعاتەی لەماڵەوەیان بەیەکەوە بووین ، کۆمەڵێ بڵاوکراوەو بەیاننامەی لابوو ، هەر هەمووی دامێ و زۆربەیانم خوێندەوە، باسی زۆر شتی بۆکردم، باسی ئەوەی کرد کەلەهاویندا چووە بۆ ناوچەی شاربازێڕو پێشمەرگەو برادەرانی زۆری بینیوە .

کاتێ چووینەوە بۆ دەوام، هەردووکمان چووینەوە یەك شوعبەو لەسەر یەك ریحلە دادەنیشتین و وابزانم وەکو بێتەوە یادم قوتابخانەکەمان لە سەرکارێزەوە گوێزرایەوە بۆ بینایەك لەخوار سەرشەقامەوە بەرامبەری گەڕەکی جولەکان . کەئێستاش ئەو بینایە .. هەر ناوەندی جەمهوری کورانی تیادایە .

## زەعیم سدیق و هەڕەشە لەمامۆستایان :

لەمانگی(١١)ی ئەو ساڵەدا ... زەعیم سدیق هەموو بەڕێوەبەری قوتابخانەکانی کۆکردەوەو کۆبوونەوەی لەگەڵدا کردن. لەکۆبوونەوەکەدا ئاگاداریکردن بەهەڕەشەوە ، دەبێت هەر هەموو دژی شۆڕش بروسکە لێبدەن و ئیمزابکەن و تەئیدی عەبدولکەریم بکەن.. عەزیز لەو هەڕەشەو بڕیارە زۆر پەستبوو. رۆژانە لەگەڵ یەك بەیەکی مامۆستاکاندا قسەی دەکرد، داوای لێدەکردن کەئەوکارە نەکەن ... بەڕاشکاوی پێیدەوتن هەر مامۆستایەك بروسکە لێبدات و بۆ عەبدولکەریم ئیمزابکات دژی کوردە و بەکوردی نازانین .

زۆرجار لەکاتی وانەخوێندندا یەخەی بەمامۆستاکانی دەگرتو پرسیاری لێدەکردن، مامۆستا ئیمزا دەکەیت؟.... مامۆستا هەبوو ... موناقەشەی لەگەڵدا دەکردو هەشبوو دەیووت ئیمزای ناکەم ، هەشبوو پێی دەوت عەزیز واز بێنە باوانەکەمان بخوێنین و من هەقی سیاسەتم نییە .

## ساڵی ١٩٦٣و ڕووداوەکان :

لەسەرەتای ساڵەکەدا ، عەزیز وتی .. ئەمساڵ وەزع دەگۆڕێت لەعێراقدا. منیش پێم وت چۆن و کەی..؟ وتی هەر ئەوەندە دەزانم ئیتر نازانم کەی و چۆن دەبێت، بەڵام ئەم قسەیەم باهەر لای خۆت بێت بۆکەسی باس مەکە. زۆری نەخایاند ئەوەبوو بەعسییەکان لە (٨) شوباتی ئەو ساڵەدا، عەبدولکەریمیان لەناوبرد دەسەڵاتیان گرتەدەست عەزیز وتی شێخە قسەکەم راست دەرچوو ، ئەوا شیوعیەکان عەبدولکەریم قاسمیان نەما. ئینجا چی دەڵێن بەشان و باڵی کێدا هەڵدەدەن ، بەپارتی و شۆڕش دەڵێن چی؟... ئەوەبوو هەر بەدوای ئینقلابەکەدا لە (١٠)ی شوبات بەیانی ژمارە(١٣)بۆ لەناوبردنی شیوعیەکان دەرچوو .

لەبەغداو شارەکانی تری عێراق بێبەزەییانە کەوتنە قەتڵ و عامکردنی شیوعییەکان... شیوعییەکانی سلێمانیش کەوتنە خۆپیشاندان دژی بەعس ... عەزیز وتی شێخە وریای خۆت بە بەقسەی شیوعییەکان هەڵ نەخەڵەتێیت خۆت بەکوشت بدەیت ... چەند ڕۆژێ شەقامەکانی شاری سلێمانی بۆنی خوێنیان لێدەهات ... سەر شەقام و سەر کۆڵانەکان هەر هەموو بەمودەرەعەو دەبابەو هێزی عەسکەری گیرابوو. ڕۆژانە

لەداروتەلەبەوە تا دەگەیشتینە قوتابخانەو دەگەڕاینەوە، چەندین جار رادەگیراین و دەیانپشکنین..

بەهۆی ئەوەی لەنێوان پارتی و بەعسییەکاندا رێکەوتن هەبوو، شەڕ راوەستابوو. پێشمەرگە چالاکی نەدەکرد.. شیوعییەکانی کەرکووک و شارەکانی تری خواروو ناوەراستی عێراق ئەوەی دەردەچوو ، خۆی دەگەیاندە کوردستان.. کە ژمارەیان زۆر بوو کەوتنە بنکەدانان لەهەندێ شوێن. لەبەرئەوەی لەسەر هیچ بنەمایەك نەهاتبوونە ناوچەکانی ژێردەسەڵاتی شۆڕش و ڕێکەوتن لەنێواندا نەبوو ، بۆیە پێشمەرگە چووە سەریان و لێیدان و زۆریان لێگیراو هەندێکیشیان لێ کوژرا .

ئەو ساڵە هەردووکمان داخڵی تاقیکردنەوەی پۆلی سێی ناوەندی بووین. من بۆ کۆشش چوومەوە بۆ سوڵە. عەزیز وتی نامەم بۆ بنێرەو نامەت بۆ دەنێرم ، با ئاگامان لەیەکبێت. لەگەرمەی کۆششکردندا بووین، بەعس لەگەڵ کوردیشدا تێکی داو لەڕێکەوتنەکە پاشگەزبۆوە ... پێشمەرگە بنکەی لەچنارەو مێرگەپان و داریکەلی و ئەشکەتە رەش دانابوو .. عەقید نوری و مولازم عومەر کەریم و شێخ ستارو عوسمان عەلی بەگ لەو ناوەبوون.. رۆژێ لەگەڵ چەند کەسێکی ئاوایی لەچنارە سەردانمان کردن .. عەقید نوری قسەی بۆ پێشمەرگەکان دەکرد. پێی دەوتن شەڕەو هەرهەموو خۆتان بۆ پەلامارو دەست وەشاندن ئامادە بکەن، دەبێت چیمان بەعەبدولکەریم و سوپاکەی کردبەمان زیاتر بکەین ... دەبێ دەرسێکی وا دابدرێن کە کاڵەك بەئەژنۆ بشکێنن ، وا لەبەڵێنیان پەشیمان بوونەوە، کەئەو حاڵەم بینی کە وتەە سەروبەری ئەوەی چۆن بچمەوە بۆ سلێمانی ، چۆن ئیمتیحان بدەم ؟ لای خۆمەوە بڕیارمدا بوو کەنەڕۆمەوە بۆ سلێمانی و بۆ ئیمتیحان ... رۆژێ

نامەیەکم لەعەزیزەوە بۆ هات لەنامەکەدا نوسیبووی.. شیوعییەکان زۆریان گیراون و ناویان داویت ، ئێستا ئەمری گرتنت هەیە. بەزۆریش باسی (عومەری دارتاش)ی گەرمکی خۆیانی بۆ کردبوو، کەمال بەمال گەڕاوە ، بەو نامەیە من لەدڵەڕاوکێی بڕۆمەوە و نەڕۆمەوە بۆ ئیمتیحان کەوتم و بیری چوونەوەم لەمێشکی خۆم سڕییەوە .

٦/٩/ ١٩٦٣ حکومەت بەڕەسمی شەڕی لەگەڵ کوردا ڕاگەیاند ، لەگەڵ ڕاگەیاندنی شەڕدا (مەنعی تەجەول) لەشاری سلێمانی دەستپێکرد . لەو مەنعی تەجەولەدا بەسەدان خەڵکی شاریان دەستگیر کرد ، ڕاپێچی ئەستەبڵەکانی حامیەی سلێمانی کردن، زۆرکەس لەو شاڵاوەدا بەناو زێراب و شیوەکانی ناوشاردا دەربازبوون و خۆیان گەیاندە ناوچە ڕزگارکراوەکان ، خەڵکێکی زۆر ڕوویانکردە ناوچەی قەرەداخ و کۆمەڵێک هاتن بۆ سۆڵە . هەرچی دەهات من پرسیاری عەزیزم لێدەکردن ، کەسێکی وانەبوو هەواڵی عەزیزم بداتێ ، بەڕاستی ڕۆژگارێکی ڕەش و ناهەموار بوو ، شار بەو حاڵە برابوو. فڕۆکەش ڕۆژانە گوندەکانی بۆمباراندەکرد و هەواڵمانزانی کەخەڵکێکی زۆر لە حامیەکە بەبێ دادگایکردن کوژراون کەمامۆستا و کاسبکاریشیان تیابووە .

## دەوری دووەم و ئیمتیحاندانەوە :

لەپایزی ساڵەکەدا ، حکومەت بڕیاری لێبوردنی دەکرد ، عەزیز کاغەزێکی بۆ ناردم لەکاغەزەکەدا نوسیبووی ، بڕیاری لێبوردن دەرچووە. بەر بڕیارەکە دەکەویت ، ئەگەر بێیتەوە بۆ سلێمانی مەترسی نییە. بڕیاردراوە ئەو

قوتابیانەی لەدەوری یەکەمدا نەیانتوانیوە لەتاقیکردنەوەدا بەشداربن و ئیمتیحان بدەن دەتوانن لەهەموو وانەکاندا تاقیکردنەوە بکەنەوە ، بۆیە حەز دەکەم بەزوویی بێیتەوە بۆ سلێمانی ، منیش بەشدار نەبووم لەتاقیکردنەوەکاندا و بەنیازم لەدەوری دووەمدا ئیمتحانبدەمەوە .

منیش هەر زوو خۆمکۆکردەوە ، هاتمەوە بۆ سلێمانی کەل‌و پەلەکانم بردە بەشی ناوخۆیی دارولتەلەبەو چووم بۆ ماڵی عەزیز. پورە خورشە بەخێرهاتنەوەیەکی زۆری کردم‌و وتی عەزیز لەباخچەی گشتییە خەریکی سەعیەو ریێی وتووم ئەگەر هات با بێت بۆلام بۆ ئەوێ، کەچووم لەوێ بوو. زیاتر لەدوو سەعات باسی وەزعی شارو رووداوەکانی بۆکردم ، وتی شێخە ئێرە بۆ سەعی رۆژ زۆر باشەو بۆ شەویش کتێبخانەی گشتیی هەیە. ئەم ماوەیە زۆر بەجدی سەعی دەکەین بەشکم دەربچین..

ئیتر رۆژانە دوو بەدوو لەباخچەی گشتی و کتێبخانەی گشتی سەعیمان دەکرد .. دووسەعات سەعیمان دەکرد. لەپڕێ عەزیز بانگی دەکرد شێخە شەربەتێ، چلورەیەك نەخۆین..؟ ئەو ماوەیە دەیکردە قسەی خۆش‌و فشقیات دەیووت دەرچووین ئەوا دەخوێنین ، دەریش نەچووین دەبینە پێشمەرگە ، رۆژێ پێش تاقیکردنەوە چووینە هۆڵەکەو سەیری ناوەکانمان کرد کورسییەکانمان بەرووودوای یەکبوون . هەموو ئیمتحانەکانمداو لەهەموویاندا باش بووین ، تەنها لەئینگلیزیدا نەبێ هەردووکمان خراپ بووین. رۆژی ئیمتحان عەزیز بەمامۆستاکەی بەسەرمانەوە بوو پێی وت مامۆستا من‌و شێخە خراپین دوو پرسیارم پێیە یارمەتیمان بدە، با دەریبهێنم‌و بیاننووسینەوە زۆر سوپاست دەکەین .. هەر عەزیز ئەوەی وت مامۆستا تووڕە بوو قبوڵی نەکرد. زۆر هەوڵی لەگەڵدادا بێ سوود بوو .

زیاتر چاودێری خستە سەرمان و لێمان دوور نەئەکەوتەوە ، تا کار گەیشتە ئەوەی هەڕەشەی لەعەزیز کرد. ئەگەر وازی لێ نەهێنێت بەمودیری قاعە دەڵێت و دەفتەرەکەی لێوەردەگرێت، ئیتر عەزیز کەزانی بێهودەیە دەفتەرەکەی داخست ، بەتوڕەییەوە دایە دەست مامۆستاو پێیوت : بۆ باوکتی دەکەیت . یارمەتیت نەداین، نەدەبوو وابوویتایە، ئەگەر حیسابت بۆ وەزعەکە بکردایە دەبوو رۆحی یارمەتیت تیابوایە، با بزانین کەئێمە راسب بووین چی بەتۆ دەبڕێت ، بەشکم بتکەنە پارێزگار ، ئەمەی وت و چووە دەرەوە. منیش بەدوایدا چوومە دەرەوە.. وتی شێخە دوو پرسیاری تەواوم پێبوو. ئەو مامۆستا نالەبارە پشتی شکانین ئەڵێی چی لەسەری راوەستین کەهاتە دەرەوە ژەمێکی بکوتین، وتم کارێکی باش نییە و بەهەر حاڵ هەردووکمان دوای ئەو ئیمتیحانە لەوە تێگەیشتین کە دەرناچین راسب دەبین.

هەر ئەو ساڵە بڕیارمدا واز لەحزبی شیوعی بهێنم ، بووم بەپارتی ، وتی ئێستا دەچین بۆلای دایکم ئەو مژدەیەی دەدەینێ ، بەجووتە چووینەلای دایکی ، وتی دایە پێم ئەوتی شێخەت بۆ ئەکەم بەپارتی ، دایکی وتی ئۆخەی کوڕم کە ئەم مژدە خۆشەت دامێ . لام سەیربوو ئەوەی شێخ رەزای دێلێژە شیوعی بێت و زۆرم لاگرانبوو ، لەمڕۆوە ئیتر شێخ محەمەد وەکو تۆیە و ئێستا دەڵێم دوو کوڕم هەیە . بەقوربانتانبم ئاگاداری خۆتانبن . دوای تەواوبوونی ئیمتیحان من گەڕامەوە بۆ سۆڵە.پاش ماوەیەك نامەیەکی عەزیزم پێگەیشت، لەگەڵ نامەکەدا نمرەکانی ناردبوو. هەردووکمان تەنها لەئینگلیزیدا دەرنەچووبووین، نووسیبووی ئەگەر ئەو مامۆستا قیرسچەمەیە یارمەتی بدایناپە لەویشدا دەردەچووین .

## ساڵی خوێندنی ١٩٦٣ - ١٩٦٤ :

وەکـو راسـب سـاڵێکی تـر لـەپۆلی سـێ دەوامـمـان کـردەوە. بەیەکـەوە کارمانـدەکرد. لەسـاڵی ١٩٦٤ نـاکۆکی کەوتـە نـاو مەکتـەبی سیاسـیەوە ، پـارتی بـوو بـەدوو بەشـەوە بـاڵی (مەکتـەبی سیاسـی) و (بـاڵی بـارزانی) .. ساڵێکی خۆش نەبوو .. شەڕو پێکادان لەنێواندا دەستی پێکرد. منو عەزیز لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا بووین ، ئەو ساڵە پۆلی سێمان تـەواو کردو هـەردووکمان دەرچـووین ، سـاڵی (١٩٦٤) سـاڵێکی شـوومی شۆڕشـی کـورد بوو ، بەهۆی ئەوەی ناکۆکی ناو شۆڕشەکەو کەرتبوونی بەناکارێکی خراپدا شـکایەوە ، ئـەو سـاڵە ئێمـە لەناوەنـدی جـەمهوری لەجوولـەکان ، زۆر بەناخۆشی بەسـەرمانبرد . جەماعـەتی عەبدولی حـاجی کـە ئەوکاتـە سـەربە جەماعەتی کانی ماسی بوون کاری زۆر خراپیان لەقوتابخانەکەدا دەکرد ، شەڕیان بـەبرادەران دەفرۆشـت ، لـەدەرەوەی شـاریش هـەر رۆژە لەشـوێنێك کارەساتی شەڕو پەلاماردان و کوشتن رویدەدا ، ئێمـە لـەو سـاڵە نەگریسـەدا دەرچووین .

## ساڵی خوێندنی ١٩٦٤ - ١٩٦٥ :

ساڵی (١٩٦٤) کە هەردووکمان دەرچووین ، چوینە پۆلی چواری وێژەیی لە قوتابخانـەی ئامـادەیی وەتـەن ، کەلـەکاتی رژێمـدا کرایـە دائـیرەی ئـەمن و ئێستا بۆتە شوێنی مەکتەبی رێکخراوە دیموکراتییەکان . لەپۆلی چواردا مـن

و عەزیز و ئەم برادەرانە کارمان دەکرد (خەلیل ئیبراهیم ، سەعید سالح ، سەریەستی شێخ جەلال ، تاهیر عەزیز (تایەرە بچکۆل) عەلی عەبدولڕەحمان بادینی (عەلیە سور) ، عەبدوڵلا رەسوڵ) و چەند برادەرێکی تر کە ناوەکانیانم لەیاد نەماوە .. ئەو ساڵە کەساڵێکی تری ناخۆشی باری سیاسی کوردستان بوو ، پۆلی چوارمان تەواو کرد و ساڵی خوێندنی (٦٦ – ٦٧) چووینە پۆلی (پێنج) . ئەو ساڵەش هەمان باری سیاسی شۆڕشی کورد بوو ، هەردووکمان داخڵی ئیمتیحانی وەزاریی کراین و بەیەکەوە لەباخچەی گشتی و کتێبخانەی گشتی کۆششمان دەکرد ، لەکتێبخانەی گشتی زۆر جار (مەسعوود)یشمان لەگەڵدابوو . ساڵی یەکەم و دەوری یەکەم لەئیمتیحاندا دەرنەچووین .. دەوری یەکەم من لە (٣) دەرسدا کەوتم . ئەو ساڵە بڕیارێك دەرچو ، کەقوتابی دەیتوانی لەدەوری دووەمدا چەند دەرس کەوتووە ئیمتیحان بداتەوە ، عەزیزیش هەروابوو ، هەردووکمان ئیمتیحانماندایەوە و ئەو بڕیارە وابوو کە بۆ ساڵی دوایی دەتوانرا لەچ دەرسێکدا کەوتبووی تەنها لەو دەرسەدا ، بەشداری ئیمتیحان بکەیتەوەو من و عەزیز ساڵی (٦٧–٦٨) توانیمان قۆناغەکە ببڕین ، ئەو ساڵانە لەگەڵ خەریکبوونی خوێندن و کۆششکردن ، بەبەردەوامی سەرقاڵی کاری سیاسی بووین لەگەڵ باڵی (مەکتەبی سیاسی) .. لەو ساڵانەدا زۆر یادەوەریمان لەگەڵ عەزیزدا هەیە ، بەلام هەرچەند ئەکەم نایەتەوە یادم ، ئەو یادەوەریانەی لەرۆژمێری ساڵانەدا نووسیبوومنەوە بەداخەوە هەرهەمووی بەهۆی ڕوداوە سیاسییەکان و باری ناهەمواری کوردستانەوە هەرهەمووی لەناوچوون ، خۆئەگەر ئەو رۆژمێریانە بمانایە .. دڵنیام سەرجەمی یادەوەرییەکانم ئێستا بەجوانی تۆمار دەکرد .. ئەو ساڵانە .. لەبەر ئەوەی

دەوامی قوتابخانەمان نەدەکرد .. بەزۆریی دەچووینەوە بۆ ماڵی خۆمان بۆ سۆلە .. لەبەر ئەوەی من بەشداری کاری سیاسەتم لەناوچەکەدا نەدەکرد ، گومانیان خستەسەرم ، چەندجار لەهێزی قەرەداغەوە بانگیان دەکردم بەتۆمەتی ئەوەی کەمن سەربە (باڵی مەکتەبی سیاسیم) بەموستەلەحەکەی ئەوان گوایە (جەلالیم) بەڵام لەبەرئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نەبوو ، برادەرانی هێزی پێشمەرگەی ئەو هێزەش زۆریان ناسیاو و دۆستمان بوون ، لەبانگکردنەکەدا قوتار دەبووم .

## ساڵی (١٩٦٨-١٩٦٩) وەرگرتنمان لەزانکۆی بەغدا :

ساڵی ١٩٦٨ هەردووکمان لەبەشی کوردی کۆلێژی زمان لەزانکۆی بەغدا وەرگیراین، ئەوساڵە باڵی مەکتەبی سیاسی لەبەغدا بارەگای هەبوو، چالاکی سیاسییان لەناو کۆلێژەکاندا هەبوو ، عەزیز کەوتە ئیشکردن، داوای لێکردم کە لەبەغداش ئیش بکەم، من لەبەر چەند هۆیەك کەپەیوەندی بەخۆمەوە هەبوو بڕیاری کارکردنم نەدا. عەزیز کوژراوی سەفەرو سەیران بوو... پۆلی یەکی ئەو ساڵە دوو گروپ بوو، منو عەزیز لەیەك گروپیان بووین. هەموو ڕۆژ بەقوتابیەکانی دەوت بۆ سەیرانو سەفەر، ئەوەندەی پێداگرت ڕۆژی ١٩٦٩/١/١٠ سەفەرەیەکمان بۆ سامەڕا کرد، لەو سەفەرەیەدا... جگە لەقوتابییەکانی پۆلی یەکەم چەند قوتابیەکی پۆلی دوو و سێو چواریشمان لەگەڵدا هات. بوو بەسەفەرەیەکی یەکترناسین... چەند کەسێکی دیاریکرد بۆ سەرپەرشتی سەفەرەکە ، بەیانییەکەی ئۆتۆمبێلەکە هاتە بەردەمی کۆلێژو قوتابیەکان سواربوون ، هەر سواربووین عەزیز دەستیکرد بەچەپڵەلێدانو

گـۆرانی وتـن. بەدەنگـە بەرزەکـەی هـەرجارە هـاواری لەیـەکێك دەکـرد ، بـۆ چەپڵە لێدان و گۆرانی وتن... ساتێ نەیهێشت کەس بەبێدەنگی دانیشێت تا گەیشتینە سامەرا. هەردابەزین قۆڵی کرد بەقۆڵماو وتی ئاگات لێمە.. وتم لەبارەی چییەوە ؟ وتی واشێت ئەبم، وتم بۆچی..؟ وتی بۆ (سەبری) وتم شێت بوونی بۆ چییە ، وەکو هەستت کردبێت ئەو چۆنە ؟ وتی هەست دەکەم ئەویش وەکو منە ، وتم ئاسانە کە لەسەفەرەکە گەڕاینەوە ، بەیانی چووینەوە کولییە ، بانگی بکەو موسارەحەی بکە.. لەژیانی زانکۆدا ئەم شتانە زۆر ئاساییە لەنێوان کچ و کوڕدا، وتی جا ئەوە غیرەتی دەوێت.. من ئەو غیرەتەم نییە... وتم غیرەتت گورگ بیخوات قسەیەکە خۆ ناتکوژێت ، یـان رازی دەبێـت یـان رازی نابێـت ... بەهـەرحاڵ ئـەو حاڵـە لەنێوانیانـدا مایەوە، ، لەپۆلی یەکەمدا هەردوورا و دوور یەکتریان خۆشیەویست، تا ساڵی دووەمی خوێندن بوون بە هاوڕێ و خۆشەویستی یەکتر.

## ساڵی ( ١٩٦٩ - ١٩٧٠ ) و دووەم ساڵی زانکۆمان :

لەسـەرەتای ساڵەکەوە کێشـەو ناکۆکی زۆر لەنێوانی برادەرانـی هـەردوو باڵەکـەدا لەکۆلێـژی ئـاداب و بەتایبـەتی لەبەشـی کـوردی هـەبوو. چـەندجار شـەڕو ناخۆشـی رووی‌ـدا ، عـەزیز خـۆی ئاسـا هەمیشـە لەهەوڵـدانی چارەسەرکردنی کێشەکاندا بوو، هەر کێشەیەك رووی‌دەدا بانگی دەکردم ، یان دەهاتەلام و بەرنامەمان بۆ چارەسەرکردنی دادەنا. زۆری پێناخۆشبوو قوتابی زانکۆ لەناوخۆیانداو لەبەرچاوی عەرەبە بەعسییەکان شەڕ بکەن ، بەعەیب و شوورەیی دەزانی... بەڵام رۆژێ چەند کەسێکی بادینانی شەڕیان

بەعەزیز فرۆشتبوو. عەزیز بەوە زۆر نیگەران بوو، کێشەکە گەورەبوو.. چەند برادەرێك لەسەرەوە هاتن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکە ، ئەوەی لەبیرم مابێت (کاك شاسوار جەلال و کاك دارۆی شێخ نوری و کاك فازڵی مەلا مەحمود) بوون. هاتنە کۆلێژ و منیان بانگکرد... زۆرمان قسە لەسەر کێشەکە کرد، رای (کاك ئارام) وابوو کە کێشەکە بەبێ شەڕ و بەشێوەیەکی عاقڵانە چارەسەر بکرێت ، ئەو شەڕەی لەکوردستاندا لەنێوانی پێشمەرگەدایە نەهێنرێتە ناو زانکۆوە، چونکە ئەوە دیاردەیەکی خراپە . یەکێك لەو سێ کەسە وتی دەبێ ئەو مەلاییانە تەمێ بکرێن و لێیانبدرێت . کاك ئارام بەپێکەنینەکەیەوە وتی کاکە تەمێکردن و لێدان و شەڕ چارەسەر نییە ، من هەڵەیەك بکەم و تۆش هەمان هەڵەم بەرامبەر بکەیتەوە ئیتر جیاوازی نێوانمان چییە ؟ راستت دەوێت من نەشەڕی پێشمەرگە بەڕەوا دەزانم و نە ئەم حاڵەشم لاخۆشە کەئێستا ئێمەی تیادایین .. ئەم کارانە هەرهەمووی لەبەرژەوەندی بەعسە بەعس .

## <u>ساڵی (١٩٧٠ – ١٩٧١) و سێیەم ساڵی زانکۆمان :</u>

سەرەتای ساڵی خوێندن ١٩٧٠ دکتۆر کەمال مەزهەر مێژووی پێدەوتین من و عەزیزی بانگکرد . وتی پرۆژەیەکم هەیە دەمەوێت چەند کەسێکتان لە ئەستۆیی بگرن ، بۆ بەئەنجام گەیاندنی، ئێوە جگە لەخۆتان کێ بەباش دەزانن ، ئێمە گێلاس عەلی بەگ و سەبریە عارف و شوکریە رەسول–مان دیاریکرد. پرۆژەکەی وەرگێڕانی نووسینەکانی (دکتۆر بلەج شێرکۆ) بوو لەعەرەبییەوە بۆ کوردی .. بۆ ئەو مەبەستە چەند کۆبوونەوەیەکی پێکردین،

بابەتەکانی بەسەردا دابەشکردین ، زۆرمان ئیش تێدا کرد. ئیتر دکتۆر ئەوکاتە لەبەر چەند هۆیەك وازی لە پرۆژەکە هێناو شتەکانی لێوەرگرتینەوە.

ساڵی ۱۹۷۰ بەیانی ۱۱ی ئازار دەرچوو، برادەرانی باڵی مەکتەبی سیاسی کەوتنە بارێکی نائاساییەوە، هەندێکیان لەخۆیان دەترسان و عەزیز یەکێك بوو لەوانە، من پێم وت یەك زەرە ترست نەبێت.... دوای یەکگرتنەوەی هەردوو باڵەکە، عەزیز بۆوە کادرەکەی جاران و بەبەردەوامی بەیەکەوە بووین . زۆر شەومان بەیەکەوە بەسەردەبرد، هەفتانە لەگەڵ شەهید و چەند برادەرێکی تر دانیشتمان هەبوو ، بەیەکەوە دەچووینە شوێنێك دادەنیشین لەئەبونەواس ، کەسەکانیش ئەوەی لەبیرم مابێت (شەهید ئەنوەر یاسین و ئەمیری بەکری قەساب مەجید عەباس و شەهید عەزیز) بوون .

## ساڵی ۱۹۷۱و دەرکردنی فەیلییەکان و رۆڵی عەزیز :

لەساڵی خوێندنی ۱۹۷۱ و ۱۹۷۲دا کەهەردووکمان چووینە پۆلی چوارو دوا ساڵی زانکۆمان بوو . بەعسییەکان شاڵاوێکی دڕندانەیان کردەسەر فەیلییەکانی بەغداو شارەکانی تر ، دەستیانکرد بەڕەوانە کردنیان بۆ سنوورەکانی ئێران.. ئەم ڕەفتارەی ڕژێم قوتابیان و یەکێتی قوتابیانی کوردستانی بێتاقەتکرد. لەو بارەیەوە سکرتاریەتی قوتابیان بەیاننامەیەکی زۆر توندیان دەرکردو لەهەموو کۆلێژەکانی زانکۆی بەغدا بلاوکرایەوە. تەنها شوێنێك مابوو ئەویش زانکۆی موستەنسریە بوو، بەپێی نەخشەیەکی داڕێژراو بڕیاردرا کەلەوێش ئێوارە بەیانەکە دابەشبکرێت، لەسکرتاریەتەوە

ئـەوەی لـەبیرم مـاوە ئـەم کەسـانەیان هەڵبـژارد بـۆ ئەنجامـدانی کـاری دابەشـکردنی بەیاننامەکە ... کاك نەجمەدین عـەزیزو کـاك جـەلال خۆشناو کاك ئازاد خەفافو کاك چیا عەباس کاك محەمەد قەرەداغیو کـاك حەمید بڵبـاس وەکـو بەرپرسـی زانکۆکـە و عـەزیزو منیشـیان دانـا. ئێـوارە لەسکرتاریەت لەوەزیریەوە بەرەو زانکۆی موستەنسریە بەلانکرۆزەرەکەی سکرتاریەت کەوتینەڕێ ، بەیاننامەکان لای کاك نەجمەدین عـەزیز بـوو. هـەر دەرچووین دوو لانکـرۆزەر کەوتنـە شـوێنمان ، لەبـەردەم زانکـۆدا دابـەزین، ئەوانیش راوەستانو دابـەزین.. کاتێ لـەدەرگای زانکـۆ چووینە ژوورەوە ، گەیشـتینە نـاو زانکۆکـە سـەیرمانکرد (کـاك حەمیـد بڵبـاس) چـاوەڕێمان دەکـات. هـات بـەرەوپیرمان وتـی سـەرنجبدەن ، لـەبن هەرپایەیـەك دوو سـێ کـەس دانـراوە ، دەرگـای ئیتحـادو نـادیو پرسـگە هەرهـەمووی داخـراوە ، ئەوکەسـانەی راوەسـتابوون سـەروملیان بەجامانـەی سـوور پێچابوو... وتـی مـن وای بۆدەچـم دەیانـەوێت لێـرە کارێـك بکـەن تۆڵـەی هـەموو رۆژەکـە بکەنەوە... بەدەم قسەکردنەوە دوو دوو بەراڕەوی زانکۆدا دەڕۆیشتین. منو عـەزیز هاوشـانی یەکدەڕۆیشـتین، کـاك نەجمـەدین لایـەکی کـردەوەو ئـەو بەیاننامەیەی پـێ بوو لـەگیرفانی دەریهێنـاو دایە دەست عـەزیز، عەزیزیش لێـی وەرگـرت ... نـەختێ رۆیشتین عەزیز وتـی شـێخە ئـەوە بـۆ نەجمـەدین بەیانەکانی دایە من ؟ بەدەم رۆیشتنەوە هەر دەیووتو دەیوتەوە تا چووینە شـوێنێکو کۆبوونەوەیـەکمان کـرد ، بـەڕای هـەموان بڕیارمانـدا کـە بەیاننامەکە بڵاونەکەینەوە ، گەڕاینەوە بۆ سکرتاریەت کەچووینە ژوورەکەی کاك عادل موراد و عەزیز دانیشت ، وتی کاك عادل فیشکەکەمان چروك بوو، وتی بۆ ؟ وتی ئەوە بەیانەکانە نەجمەدین دایە منو منیش بڵاومنەکردنەوە

وا بۆم هێنانەوە، عادل وتی حسێن سنجاری لەکۆلێژی ئاداب دابەشی کردوومو گەڕلوەتەوە . کەباسەکەمان بۆ کاك عادل گێڕایەوە وتی باشتان کرد ، دڵنیام بتانکردایە سەرنگومیان دەکردن .

## ساڵی ١٩٧٢ و سەفەرێك بۆ بەسرە :

لەکۆتایی ساڵی ١٩٧١ دا ، عەزیز جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە سەفەرێك بۆبەسرە بکەین، رۆژانە بە یەك یەکی قوتابیەکانی دەوت، لەئەنجامدا هەوڵکەی بوو بەبڕیارو بڕیارماندا. کە نیوەی ساڵ لەجیاتی ئەوەی بۆ کوردستان بڕۆینەوە. بچین بۆ بەسرە، بۆ ئەمەش لیژنەیەکمان بۆ راپەڕاندنی ئیش وکاری سەفەرەکەو سەرپەرشتی کردنی و پێکهێنا. ئەوەی لەیادم مابێت . (شەهید عەزیزو یاسین ئەنوەرو منو بورهان شەرعیو قادر حەمە ئەمین بووین..) هەر لەمانگی ١٢ ساڵەکەدا ، ئەو کارانەی کە لەزانکۆی بەغداو عەمادەی کولیەو بەشی کوردی خۆمان پێویست بوو بکرێت، جێبەجێ کران و نووسراو بۆ زانکۆی بەسرەو (اتحاد طلبة)ی بەسرەکرا.. بڕیارماندا کە بەشەمەندەفەر بڕۆین .

هەموو قوتابیەکان ناوی خۆیان نووسی بۆ هاتن، لە رۆژی رۆیشتندا چەند قوتابیەك نەهاتن، ئەو رۆژەی کە بۆشەو دەبوو برۆیشتینایە، چووین بۆ محطە ی شەمەندەفەرو فارغۆنێکمان گرت .. شەمەندەفەر بەپێی کاتژمێر دەردەرچوو . ئێمە هەرهەموو سەعات (٨,٥) شەو لە محطە کۆبوینەوە وادێتەوە یادم سەعات (٩یان ١٠)ی شەو قیتارەکە کەوتەڕێ، لەوسەفرەیەدا مامۆستا (عومەر کەریم) لەلایەن سەرۆکایەتی بەشەوە لەگەڵماندا دانرابوو

وەکو نوێنەری مامۆستایان .. لیژنەی سەرپەرشتی لەگەڵ مامۆستا عومەردا کۆبووینــەوە. بەرنامــەی ســەفرەکەو چــۆنێتی بــەڕێوەبردنمان دارشــت.. بریارماندا . ئەوشەوەی کە بەڕێوەدەبین لەناو شەمەندەفەرەکەدا. دوو دوو خەفارەت بگرین و نەخەوین، شەو هەر سواری شەمەندەفەرەکە بووین.. عەزیز خەفارەتەکەی بەسەر برادەرانی لیژنەکەدا دابەشکرد. خەلیل وەندی کەپۆلی دوو بوو لەگەڵماندا بوو، عەزیز دەستیپێکرد بە چەپڵەلێدان و گۆرانی وتن و سوڕدان، بەخەلیل وەندی وت ئەمشەو ئاو بوەستێ تۆ ناوەستیت، خەونییە تادەگەینە بەسرە، بەزم گەرمبوو خەلیل بەجیا گۆرانی دەوت و جارجار کچەکانیش یارمەتی خەلیلیان دەداو گۆرانیان دەوت. ئێستاش لەیادمە شەهید دڵشاد مەریوانی هەر هاتوو چۆی دەکرو لە فارغونەکەی خۆمانەوە . دەچوو بۆ فارغۆنێکی تر.. وەکو هەستمان کرد. مەشروبی خواردبۆوە تۆزێ خەیاڵبوو، مامۆستا عومەر هەستی پێکرد زۆری پێ ناخۆشبوو. عەزیز بانگی کرد وتی کاکە دڵە .. حەزدەکەین یان گۆرانیمان بۆبڵێیت یان شیعرێکی خۆشمان بۆ بخوێنیتەوە. وتی بەسەرچاو هەردووکتان بۆ ئەکەم، بەزمەکەی خۆش کرد. عەزیز وتی (دڵە) نەماندەزانی دەنگیشت واخۆشە؟ ئەی بۆ تائێستا خۆت دەرنەخستووە؟.. تاسەعات (٢)ی شەو کەس نەخەوت.. دوای ئەوە وردە وردە قوتابیەکان زۆربەیان نووستن. خەفارەتی من و عەزیز کە بەیەکەوە دانرابووین، تەواوبوو ، نۆرەی شەهید یاسین و قادر بوو، وتی ئێوەش مەخەون و دەمی خستە بن گوێی شەهید یاسین وتی (دڵشاد) سەرخۆشە باپەنێ نەدات ..

بەیانی لەگەڵ شەبەقدا گەیشتینە بەسرە.. زۆر بەمان نەشارەزای بەسرە بووین.. (مهدی مصور)مان لەگەڵدا بوو، شارەزای بەسرە بوو، بەچەند

سەیارەیەك چووینە بەربارەگای (اتحاد وەتەنی) تەنها حەرەسی لێبوو. لەئیستیعلاماتەکەو من و عەزیزو ئەنوەرو قادرو مهدی دانیشتین. زۆر سارد بوو. قوتابیەکانی تریش دوو دوو سێ‌سێ لەچەند شوێنێك ستاریان گرت تا تەواو دنیا رووناکبووە خۆر هەڵهات پەیوەندیان بە(ئازاد عەبدولقادر بەرواری) یەوە کرد، کە لێپرسراوی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بوو لە زانکۆی بەسرە. زۆری نەخایاند گەیشتە لامان، ئەئەو ئەئێمە کەسمان یەکترمان نەدەناسی، تعارفمان کرد. وتی ناوی کاك عەزیزو شێخ محەمەدم زۆر بیستوە لەبرادەران زۆر بەگەرمی پێشوازیی لێکردین .. تەلەفۆنی بۆ مەسئولی ئیتحادی وەتەنی بەسرە کرد . ئەویش دوو نوێنەری نارد بۆلامان ئێمە لەنووسراوەکەماندا کەبۆ ئیتحاد و زانکۆی بەسرە کرابوو، دوو شتی سەرەکیمان داواکردبوو :

١- پاس بۆ گواستنەوەمان کە ئەو رۆژانە لەگەڵماندابێت کە پێویستیمان بەدوو پاس بوو .
٢- شوێنی نووستن و حەوانەوە.

شوێنەکە .. خانویەکیان بۆ دەستنیشانکردین ، ئازاد لەگەڵ یەکێك لەدوو کەسەکەی ئیتحادا تێکچوون، کار گەیشتە ئەوەی ئازاد بەئارەزووی خۆی یەك زللەی لەو کەسەداو زۆر خراپ تووڕە بوو ، تەنانەت جنێوی بەئیتحادەکەیان و سەرۆکی ئیتیحادەکەیاندا . من و عەزیز کەوتینە نێوانیان لەئەنجامدا ئاشتمان کردنەوە ...

ئۆتۆمبیلیان دووپاس بۆ هێنایین و بردیانین بۆ شوێنی حەوانەوە . خانووەکە دووقات بوو ، قاتێکمان بۆ کچەکان داناو قاتەکەی تر بۆ کورەکان. زیاتر لە (٣) رۆژ لەبەسرە ماینەوە . لەو سەفەرەیەماندا لەگەڵ

لیژنەکەمان و مامۆستا عومەر و چەند قوتابییەکی تر سەردانی سەرۆکی زانکۆ و سەرۆکی ئیتحاد تەلەبە و پارێزگاری بەسرەمان کرد . هەرهەموو بەگەرمی پێشوازییان لێدەکردین و هەریەکەیان بەجیا باسی بەسرەو کارەکانیان بۆ دەکردین .

لەوسەفەرەیەماندا جگە لەناوبەسرەو زوبێر و چەند شوێنێکی تر گەڕاین و چەند جاریش چووینەسەر بەحرەکەو بە بەلەم هاتووچۆمان بەناویدا دەکرد. عەزیز .. لەهەموو گەڕانەکاندا رۆڵی بەرچاوی دەبینی بۆ زەوقی قوتابییەکان . نەیدەهێشت یەك سەعات بەبێ ئاهەنگ و گۆرانی و هەڵپەڕکێ دابنیشین .. بەرۆژ ئەوەندە ماندووی دەکردین ، شەو کچەکان هەرزوو دەنوستن .

زۆربەی شەوەکان لەگەڵ (عەزیز و یاسین و قادر و دڵشاد مەریوانیو خەلیل وەندی) دەچووین بۆ ناو بەسرەو لەکونجێکی خۆشی ئەوشارەدا تا درەنگ دادەنیشتین . ئەوەی لەیادم بێ بەهۆی عەزیزەوە دووماڵی کورد . کەخەڵکی سلێمانی بووین لەبەسرە نیشتە جێبوون . دەعوەتیان بۆ کردین لەدەعوەتەکەدا (سەبریەو گێلاس و نەرمین)مان دەبرد .

ئەو بەیانییە کە لەژووری نوسینگەی ئیتیحاد دانیشتبووین مەهدی مصور بەدانیشتنەوە خەوی لێکەوت، عەزیز وتی بەخوا مهدی لێبۆتەوە.. دەستێکی بەسەرو چاویدا هێنا، راپەڕی عەزیز وتی وریابە قەرزارمان نەکەیت، ئاکامێراکەم بەرێ با منیش رەسمێکی تۆ بگرم ، بەم حاڵەوە، کەچوینەوە بەغدا گەورەی دەکەم ..

بەسرە شارێکی گەورەیە ، بارانی زۆر لێدەبارێ ئەو رۆژانە باران ناوە ناوە دەباری . رۆژێکی زۆر خۆشمان لەشوێنێك بەناوی (جزیرە) بەسەر برد .. شوێنەکە خۆشبوو . هەرهەموو باخچەو دارو گوڵبوو ، بەقەدەر هەموو

ڕۆژەکان لەوێ هەڵپەڕین ، عەزیز سەرچۆپییەکەی بە کەس نەدەدا ، من و عەزیز جلی کوردیمان بردبوو ، بەزۆری جلی کوردیمان لەبەر ئەکرد . عەزیز لەگەڵ جلەکوردییەکاندا جارجارە جامەدانی دەبەست زۆری کاتیش کڵاوی لەسەر دەکرد . ئەو ڕۆژانە ئازاد بەرواری بەزۆری لەگەڵماندا هاوبەشی ئاهەنگ و گەڕانەکانی دەکردین و تائێمە نەگەڕاینەوە بۆ بەغدا ئەویش نەگەڕایەوە .. لەکۆتاییدا کەخواحافیزی لێکردین وتی : زۆر شادبووم بەناسینتان و بەتایبەتی بەناسینی کاک عەزیز زۆرشاد بووم ، دەبێت ئیتر هەردەم ئاگامان لەیەك بێت و سەردانی یەکتر بکەین . عەزیز وتی کەهاتیتە بەغدا شەوێك من دەعوەتت بۆ ئەکەم و لەو دەعوەتەدا ئەم برادەرانەشی تیادا دەبێت .

حەزدەکەم .. لێرەدا ئەوەبنووسم ، کەلەساڵەکانی (٧٠ و ٧١ و ٧٢)دا کۆمەڵێ سەیران و ئاهەنگمان کرد . بۆسەدەی هیندییەو حلەو سەدری قەنات و بەعقوبە ، لەهەموو سەیرانەکاندا عەزیز دینەمۆی جۆشدانی سەیرانەکان بوو ، بەقاقای پێکەنین هەمووانی دەهەژاند . لەئاهەنگەکانی ڕۆژی کوللیەدا کەلەباخچەی کولیەی ئاداب دەکرا .. عەزیز بەئسلوبەکەی خۆی ئاهەنگەکانی خۆش دەکرد ..

## ساڵی ١٩٧٢ تەواوکردنی زانکۆو چوون بۆ خزمەتی سەربازی :

ساڵی ١٩٧٢ کۆلێژمان تەواو کرد. ئەو سەردەمە دەبوو هەر قوتابییەك دوای تەواوکردنی کۆلێژ ساڵێك خزمەتی سەربازی بکات.. دەبوو لە ١/١٠ی ئەوساڵەدا پەیوەندی بە تەجنیدەوە بکات ... جەماعەتەکەمان لە ١/١٠

پەیوەندییان کردو چوون بۆ تەجنیدو رەوانە کران. من و عەزیزو محەمەد قەرەداغی تایەرو فاروقی حاجی عومەر ماینەوە. رۆژی ٢٦/١٠ چووینە تەجنیدی سلێمانی و هەر لەحامیەکەوە رەوانەی معسکر تدریبی کەرکوکیان کردین.

لەبەرئەوەی ئێمە دواکەوتبووین تێکەڵاوی جەماعەتیان نەکردین، عەریفێکیان بۆدانابین بەجیا مەشقی پێدەکردین من و عەزیز لەگەڵ چەند برادەری تر شەو لە ئوتێل دەخەوتین ، ئەدەچووین بۆ معەسکەر. رۆژێ بەجووتە بەسواری پایسکیلێك رۆیشتین تا گەیشتینە بەردەم معەسکەرو دابەزین، عەزیز دەستی بۆسەربرد، بێرییەی لەسەردا نەبوو، وتی شێخە بێرییەکەم لێ بەجێماوە، دیارە بێ بێرییەش عەسکەریی ناکرێت ، ناچار گەڕاینەوە بۆ ناو کەرکوك و چووین بێرییەکەمان هێنا.

رۆژێ عەریفەکە وتی ... ئەمڕۆ تاقیتان دەکەمەوە هەرکەس دەرچوو چەند رۆژێ ئیجازەی بۆ وەردەگرم ، تێکەڵاوی جەماعەتیشی دەکەمەوە ، وتمان چۆن؟ وتی یەکە یەکە دەتانهێنمە دەرەوە ، ئەوەی بەتەنیا توانی مەشقەکەمان بۆ بکات ئەوە وەکو وتم وای بۆ ئەکەم، ئەوەشی نەیتوانی هەروەڵەی ئەم ساحەیەی پێدەکەم. ئێمە کەسمان لەخۆمان رانەبینی، محەمەد قەرەداغی وتی: من دێمە دەرەوە، عەزیز وتی: حەمە حەیامان مەبە ئەوە بەتۆ ناکرێت، بەقسەی نەکردو سوور بوو لەسەر قسەی خۆی، مەشقەکەی بۆ نەکرا، عەریفەکە هەروەلەکەی پێکرد، کەگەڕایەوە بەدەنگە گەورەکەی بەپێکەنینەکەیەوە بەکاکە حەمەی دەوت: ئیجازەیەك بۆ ئێمەش وەرگرە ، لەگەڵ خۆت بمانبە بۆناو جەماعەت و کەلەئیجازەکەت گەڕایتەوە پاکەتێ گەزۆمان بۆ بێنە .

## گواستنەوەمان بۆ بەغداو نەورۆزی عەزیز :

دوای تەواوبوونی مەشق لەمەرکەز تەدریب کەوتنە گواستنەوەمان بۆ مەعەسکەرەکانی تر، من بەر کۆلێژی ئەرکان کەوتمو لەحیساباتی کۆلێژی ئەرکان بۆ دائیرەی (مؤسسات ومعامل مقر عام وزارة الدفاع) دانرام. (عەزیز و حیکمەت هندیو ئەنوەر مەحمود)یش بۆ مەدرەسەی مۆسیقای جەیش لەبابلموعەزەم گوێزرانەوە ، دائیرەکەمان پشتیان بەیەکەوە بوو، لەجەژنی نەورۆزدا عەزیز سێ رۆژ ئیجازەی وەرگرتبوو ، منیش هەروەها چەند رۆژێکم وەرگرتبوو . رۆیشتینەوە بۆ سلێمانی، عەزیز لەگەڵ تەواوبوونی ئیجازەکەی نەگەڕایەوە ، چەند رۆژێك غایب بوو ، کە گەڕایەوە سەریان تاشیو بەندیان کرد ، جوابی بۆ ناردم کەلای (نەقیب تایەری شێخ رەئوف نەقیب) هەوڵی بۆ بدەم ، کاك تایەر لەبەندیەکە قوتاری کرد، بەڵام سەرەکەی تاشرابوو ، بەلای ئەوەوە سەرتاشینەکە لەبەندییەکە ناخۆشتر بوو، چونکە لەناو بەغدا ئەوەی سەری بتاشرایە ئینزیباتی عەسکەری ئەیگرت و گەڕانی زەحمەت دەبوو .

## ساڵی ١٩٧٢و تەواوبوونی سەربازیی و دامەزراندن :

لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٢ سەربازیمان تەواوکرد، بەیەکەوە کەوتینە معاملەی دامەزراندن لە(مجلس خدمە) بەیەکەوە مقابلە کراینو فەرمانی دامەزراندنمان نێردرا بۆ وەزارەتی پەروەردە، هەردوکمانیان نارد بۆ

پارێزگای واسط من موباشەرەتم نەکرد، عەزیزلە ئامادەیی عەزیزیە دەوامی کرد .

**سالّی ۱۹۷٤و شۆرش:**

لیژنەی ناوچەی قەرەداغ لەخورمالّ بوو ، کارگێری ناوچە بووم ، لەمانگی حەوتدا کاتێکم زانی عەزیز پەیدابوو، دوو شەو لام مایەوە تازە هاتبووە دەرەوە، وتی دەمەوێ داوای سەبری بکەم، ئەلّێن مالّیان وا لەپاوە، حەز ئەکەم لەگەلّم بێیت، بریارمدا لەگەلّی بچم کاتێکم زانی بروسکەیەکم لە کاك فازلّ سۆرانی ئامرهێزی کەرکوك‌و بروسکەیەکم لەلقی چوارەوە بۆ هات..
هەر دوو بروسکەکە بۆ ئەوە بوو بەزووی‌و بەپەلەو بێ دواکەوتن لەگەلّ دەستەیەك پێشمەرگەدا بپەرمەوە بۆناوچەی قەرەداغ، بە بروسکەکان زۆر قارس بووم، لەبەرئەوەی بەلّێنم بەعەزیز دابوو لەگەلّی بچم بۆ پاوە، عەزیز هەستی کرد وتی شێخە چییە؟ بروسکەکانم پیشاندا، وتی ئەمە گرنگترە تۆ بچۆ بۆ قەرەداغ من ئەگەرێمەوە بۆ پێنجوێن، وەکو زانیومە چەند برادەرێکی ترمان لەپاوەن، وتم زۆرم پێناخۆشە کەئێستا ناتوانم لەگەلّت بێم، دەتوانم گوێ بەبروسکەکان نەدەم، بەلاّم لەبەرئەوەی ناوچەی قەرەداغ ناوچەیەکی ناخۆشەو کارەکەش دیارە بەمن ئەنجام ئەدرێت، پێشمەرگەش خواخوایانە کادرێکی حزبی بەدەنگ کارێکەوە نەچێت یەکسەر پروپاگەندەی بۆ دروست بکەن، کە ترسنۆکە. منیش ئەگەر نەچم دیعایەم بۆ بلاّو دەکەنەوە لەناو پێشمەرگەدا کەلەترسا نەچوم. عەزیز گەرایەوە بۆ پێنجوێن‌و منیش بەرەو قەرەداخ، وامان دانا کەبگەرانەوەم لە قەرەداخ یەکتر ببینینەوە، بەلاّم ئیتر

نەمانتوانی یەکتر ببینینەوەو ئاگاشم لە وەزعی عەزیز نەماو نەمزانی بۆ کارەکەی چی کردووە .

## ساڵی ١٩٧٥و کارەساتی نسکۆی شۆڕش :

دوای کارەساتی ئاشبەتاڵ و گەڕانەوەم بۆ سلێمانی، لەهاوینی ساڵەکەدا کاتێ خەریکی کاری دامەزراندن بووم لەبەغدا، لەئوتێل سەرچنار یەکترمان بینی، چەند شەوێك بەیەکەوە بووین، ئەویان بۆ عەزیزیەو منیشیان بۆ کوت دانابۆوە، ئەو شەوانە زۆر شتی بۆباسکردم باسی چوونی بۆ پاوەی بۆ کردم، کە لەگەڵ کاکە حەمە چاوشین و کاك عومەر فەتاح و کاك حەمە قەرەداخی چوون بۆ داخوازی (سەبریە) ، وە وتی زۆرم حەز دەکرد دوای گەڕانەوەم لە پاوە بتبینمەوە بۆ ئەوەی هەندێ قسە بکەین، بەلام سەرقاڵی تۆو ، دووریمان لە یەکەوە ئەو هەلەمان بۆ نەرەخسا، کە سەبارەت بە شۆڕش قسە بکەین .. ئیتر لەو شەوانەدا سەبارەت بەشۆڕش و هۆیەکانی ئاشبەتاڵ و چۆنێتی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش زۆرمان قسەکرد، ڕاو بۆچوونەکانی هەر هەموو لەجێی خۆیاندا بوون، وتی من باوەڕو متمانەی تەواوم بەهاوڕێیەتی و دڵسۆزیت هەیە، حەزناکەم لەیەك دابڕێین، ئێمە تازە بووینەتە خاوەنی بیروباوەڕێك زۆر زەحمەتە بتوانین وازی لێ بهێنین. خۆمان بەچاوی خۆمان بینیمان چۆن ئەو شۆڕشە گەورەو بەتواناو دەوڵەمەندەیان ئاشبەتاڵ پێکرد.. وتی ئێمە دەبێت ئەمجارە شۆڕشێکی تر بەشێوازی نوێ بەبیروباوەڕێکی نوێخوازییەوە دروستبکەینەوە. واڕێکەوتووە هەردووکمان لەقوڵێکەوەین، لەیەکەوە دوور نین دەتوانین

بەئاسانی یەکتر ببینین و ئاگامان لەیەکتر بێ هەوڵدەدەین کە گەڕاینەوە سلێمانیش تا دەچین بۆ دەوام زوو زوو یەکتر ببینین کە گەڕاینەوە سلێمانی من مامۆستا جەمال تایەرم بینیەوەو باسی عەزیزم بۆ کرد، ڕاوبۆچوونیم بۆ باس کرد، وتی: هەر زۆر باشە بەزوویی کاتێ ڕێکدەخەین بەسێ قۆڵی دابنیشین.. شەوێك لەنادی مامۆستایان بەیەکەوە دانیشتین ئەو شەوە سەروبنی زۆر شتمان کرد، بەرنامەمان بۆ زۆر کارو زۆر شت دانا، باسی جموجوڵی برادەران لەدەرەوەو ناوەوەو بەتایبەتی لەسوریا کرا... عەزیز وتی من و شێخە نزیکین لەیەکەوە دەتوانین زوو زوو یەکتر ببینین، بەبەردەوامی ئاگامان لەیەکتر بێت... لێی پرسیم وتی تۆ ماڵ دەبەیت بۆ حەی؟ وتم تا ئێستا بڕیارم نەداوە، تا نەچمە ئەوێ و سەیری وەزع نەکەم هیچ بڕیارێکی لەو جۆرە نادەم، عەزیز وتی ئەگەر ماڵەکەت برد من هەوڵدەدەم سەردانت بکەم.

ئەو هاوینە تاچوومەوە بۆ حەی چەند جارێ تر یەکترمان بینی، هەندێ بڵاوکراوەی کە بەدەستخەت نووسرابوونەوە دەیدامێ کەمن ماڵەکەم برد لەبەغدا عەزیزم بینیەوە، پێم ڕاگەیاند کەوا ماڵەکەم بردووە.. لەو سەردانەی بەغدادا (شەهید ڕەسول مامەند)م بینی وتی لەژێر ئەرزا بۆ تۆ دەگەڕام، زۆر باشبوو یەکترمان بینی زۆر قسەی بۆکردم سەبارەت بەشۆڕش و هەڵگیرسانەوەی... ئەو بینین و قسانەی کاك ڕەسوڵم بۆ عەزیز باسکرد.. وتی خۆتی لێ بدزەرەوە، ئیتر من کاك ڕەسوڵم نەبینیەوە.

لەمانگی (١٢– ١٩٧٥) بەبۆنەی جەژنەوە لەگەڵ منداڵەکاندا چووینەوە بۆ سلێمانی، جەژنمان لەسلێمانی کرد، لەو جەژنەدا مامۆستا جەمالم بینی وتی عەزیز لێرەبوو نامەیەکم بەودا بۆ ناردووی نەهاتووە بۆلات؟ وتم:

نەهاتووە وتی بەدڵنیاییەوە سەرت لێدەدات و ئێمە دوای جەژن گەڕاینەوە بۆ حەی.

## ١٩٧٦و سەردانی عەزیز بۆ حەی:

دوای گەڕانەوەمان لەسلێمانی، بڕیارمدا کە بۆ نیوەی ساڵ نەڕۆینەوە لەکۆتایی مانگی ١ی ١٩٧٦دا کاتێکم زانی عەزیز پەیدابوو، هاتنەکەی زۆر خۆشبوو.. دوو ڕۆژو دوو شەو مایەوە، نامەکەی ماموستا جەمالی دامێ کەخوێندمەوە، لەنامەکەدا جگە لەچەند خاڵێك کە پەیوەندی بەچۆنیەتی کارکردن و هەڵسوکەوتەوە هەبوو، ئەوەشی نووسیبوو کەئەو فەرمانبەرە کوردانەی لەکوت و حەی و شارەکانی دەوروبەرمانن هەوڵ بدەین بزانین چەندن و کێن و چۆنن ڕاو بۆچوونیان لەسەر وەزع و ڕەفتارەکانی بەعس چییە چەندیان رووخاون و چەندیان تەسلیمی دەزگاکانی ڕژێم بوون.
هەر لەو دوو شەوو دوو ڕۆژەدا، لەگەڵ عەزیزدا ئەوەی دەمانناسی بەپێی شارەزاییمان یەکە یەکە هەڵمان سەنگاندن و تەقریبی زانیمان نزیکەی چەند لەحەی و کوت و ڕەفاعی و عەزیزیە هەن، ئەو ڕۆژانەی لەحەی بووو زۆر بەکەمی دەچووینە دەرەوە عەسران نەبێت، دوو بەدوو لەگەڵ بەخشی و ئازاددا دەچووین بۆ سەر غەراف، سەبری گواستبووەوە وتی هەوڵئەدەم ڕۆژێك لەگەڵ سەبریدا بێین ئەو ڕۆژانە شێوەی کارکردن و چۆنێتی کارکردنمان داڕشت... بڕیاریدا کە ئەوجار جارە سەرم لێبدات سەردانەکەش زۆر نەبێت بۆ ئەوەی نەکەوێتە ژێر چاودێرییەوە زۆر هەوڵیدا

لەگەڵیدا بڕۆینەوە بۆ سلێمانی، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك بەپەسەندم نەزانی بڕۆینەوە.

هەر لەو ساڵەدا، پێش ئەوەی پشووی هاوین دەست پێبکات، جارێکی تر سەردانی کردەوە.. ئەمجارە شەو ئەمایەوە هەندێ نووسین و بڵاوکراوەو ڕێنمایی بۆ هێنابووم، لەهاتنەکەیدا باسی جموجۆڵی سوریاو دروستبوونی سەرکردایەتی و بڕیاری هەڵگیرسانەوەی شۆڕش و دەرچوونی ڕۆژنامەی (الشرارة)ی بۆ کردم..

هاوینی ساڵەکە کە ڕۆیشتینەوە بۆ سلێمانی لەگەڵ عەزیزدا چەند جارێ یەکترمان بینی، دوو سێ جاریش سێ قۆڵی لەگەڵ ئەوو مامۆستا جەمال دانیشتین. کتێبی (الاتحاد الوطني الكردستاني لماذا)ی مام جەلالیان دامێ، باسی کۆبوونەوەکەی ٢٣– ٢٤/ ٥/ ی ئەفسەرەکان و حەملەی سیاسی ڕاگەیاندنیان بۆ کردم. عەزیز وتی من هەوڵمداوە بۆ نەقڵ و نەقڵیش دەبمەوە، لەکۆبوونەوەیەکی سێ قۆڵیدا باسی ئەو کەسانەمان کرد کەدەکرێت پەیوەندیان پێوە بکرێت، بۆ ئیشکردن و چوونە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی. ئەوەی من لەبیرم ماوە من کاك حەمەرەشیدی باریکەیی و حەسەن سلێمان و حەسەن خاوێنی و مەحمودی برای و چەند کەسێکی ترم بەباشزانی.. کاك جەمال هەرسێکیانی زۆر بەباشزانی ...

کاتی دەوام کە گەڕامەوە بۆ حەی بەیانییەك کاتێکم زانی عەزیز هات فەرمانی نەقڵەکەو ئینفکاکی پێبوو کە گوێزرابۆوە بۆ سلێمانی زۆر ئەمایەوەو گەڕایەوە.

## عەزیزو چوونە دەرەوەی :

دوای نەقڵبوونەوەی بۆ سلێمانی، ئیتر من عەزیزم نەبینیەوە، لەساڵی ١٩٧٧ زانیم کەچۆتە دەرەوە، لەهاوینی ساڵەکەدا چوومەوە بۆ سلێمانی (مەلیح)ی خوشکم، هات بۆ سلێمانی و بەدزییەوە پێی وتم پێشمەرگەیەك مەسئولەو لەو ناوەیە، چەند جار هاتوەو هەواڵی تۆی پرسیوە، بەزۆری لەگوربازە... ناوی محێدینە من بەتورەیی وەڵامم داوەتەوە وتومە برای من پێشمەرگەو مێشمەرگە ناناسیێ، وتی کەوام وت دەستی کرد بەپێکەنین و وتی خوشکە مەلیح من و شێخە برای یەکین تۆ جوابی بۆ بنێرە با سەردانێکی ئەم ناوە بکات.

تۆ وا جوابەکەی بۆ بنێرە کەبزانێت من لێرەم، دڵنیا بە یەکسەر دێت، وتی پێم وت: کاکە بیکە بەخاتری خوا واز لەحەمەی برام بێنە، باتووشی شتێك نەبێت.. ئەو پەیوەندیی بەپێشمەرگەو شۆڕشەوە نەماوە وتی: پێکەنیەوەو وتی تۆ بۆ وا دەترسی ئەو بزانیێ من لەمناوەم بەیانی دێت، وتم نەتزانی ناوی چی بوو؟ وتی کاکە خۆ ئەوان هیچیان ناوی خۆیان نییە، هەر یەکە بەناوێکەوە بانگ ئەکرێن، ئەو هەر ئەوەندەی بەمن وت کەهاوڕێی کۆلێژ و مامۆستایەتیمەو من هەر بەو دەڵێم شێخە، هەر ئەوەی پێ بڵێ یەکسەر ئەزانێ، من کێم کەوای وت: زانیم عەزیز بووە لەمەلیح تووڕە بووم، بۆ جوان جوابت نەداوەتەوە، بۆ جوابت بۆ نەناردوم، وتی: برا چی بکەم لەترسی وەزعی تۆ نەموێرا.

ئیتر من عەزیزم نەبینیەوە لەساڵی ١٩٧٨ کە بۆ نیوەی ساڵ گەڕامەوە سلێمانی هەواڵی گرتنی عەزیزم بیست. لەمانگی (٤)ی ١٩٧٩دا نامەیەکی

برایمی مامۆستا شێخ ئیسماعیلی دێلیژەم پێکەیشت، نامەکە زووتر نووسرابوو بەڵام درەنگ بەمن گەیشت و لەنامەکەدا نووسرابوو، عەزیز ئیعدام دەکرێت، هەواڵی پرسیویت و حەز ئەکات بچیت بۆلای و بیبینی. بەداخەوە کەهاتمەوە بۆ سلێمانی بۆئەوەی بچم بۆلای هەواڵیان دامێ کە لە مانگی (٣) دا ئیعدام کراوە.

## لەکۆتاییدا :

عەزیز شۆرشگێرێکی کورد پەروەرو پێشکەوتنخوازێکی وابوو، هەموو تەمەنی تەرخانکردبوو، لەپێناوی مەسەلەی گەل و نیشتمانەکەیدا، بەدرێژایی هاورێیەتیمان رۆژێ نەمبینی بەرەشبینی، نەفەسی کۆڵدان و بەزین لە فەرهەنگیدا نەبوو، هەردەم گەشبین بەهیمەت و بەتواناو بەدەسەڵاتەوە ئەدوا.. هەموو شتێکی لەسەرکەوتندا دەبینیەوە، گاڵتەی بەو کەسانە دەهات کەلەبەر ترسنۆکیان خۆیان دوورە پەرێز دەگرن، لەبزووتنەوەی گەلەکەیاندا، بەو جۆرە کەسانەی دەوت حازرخۆری بەر سێبەرن .

چوار ساڵی کۆلێژمان بەو شێوەیە بەسەر برد، کەئەو حەزی لێی بوو لە سەیران، سەفەر، ئاهەنگ، دانیشتن، گەران، خوێندنەوە، کتێب کرین، قسەی خۆش و نوکتە.. سەفەرەکانی سەدەی هندیەو بابل و بەسرەو سەدری قەنات و سامەراو رۆڵی سەرپەرشتی و رێکخستنیان لەلایەن عەزیزەوە هەرگیز بیرم ناچێتەوە ...

رۆژانــی مەکتەبــەی وەتــەنی و مەکتەبــەی کۆلێــژی ئــاداب و گــازینۆی پەرلــەمان و بــەرازیلی و حەیدەرخانــەو دانیشــتنەکانی ئــەبو نــەواس ئاهەنگەکانی قاعــەی خولــد قاعــەی ســینەمای غەرناتــەو قاعــەی (ســاطع الحصــري) و باخچــەکانی کۆلێــژی ئــاداب و بەشــی کــوردیی. ســەردانی رۆژنامــەی نــورو تــەئاخی و برایــەتی و هاوکــاری و کۆڕەکــانی جەمعیــەی ســەقافەی کــوردیی و یــەکێتی نووســەرانی کــوردو پــەیمانگای بــەریتانی و کۆنگرەکانی یەکێتی قوتابیـان و یەکێتی لاوانـی کوردسـتانم وەکـو شـریتی سینەما هـەردەم لـەپێش چـاوە، هـەرگیزاو هـەرگیز لـەبیرم ناچـنەوە، ئـەوەم بیرناچێتەوە هەموو جار دەیوت: شێخە من هەرچیم بۆ دەکرێ هـەر هـەمووی دەگەڕێتـەوە بـۆ هاوکـاری و یارمـەتی دایکـم، مـن ئەگـەر دایکـم نـەبێ هیچـم پێناکرێ دەزانی لەمن سیاسی ترە.. شێخە قەت رۆژێ پێی نەوتوم واز بێنم، هەر هانم دەدا ئەوەندە توندڕەوە زۆرجار وەکو کاژێک قسە دەکات، عـەزیز چـۆن لەهـەموو بوارەکـانی گۆڕەپـانی خـەبات پێشـەنگ بـوو، لەزیندانیشـدا نموونـەی خـۆڕاگریی و قارەمـانی بـەر پـەتی سێدارەی دوژمـن بـوو... یـادت بەخێر هاوڕێ بەنەمەك و جەسورەکەم.. یادت بەخێر ...

# شەهید عەزیز بە ڕاستی هاوڕێ بوو

## گێلاس عەلی

شەهید عەزیزی نەمر، هەتا بڵێیت لاوێکی کورد پەروەرو دڵسۆز بوو لە هەموو شتێك شیرینتر لای خاكو نەتەوەكەی بوو، بە تایبەتی خۆشەویستییەكی بێ سنووری هەبوو بۆ كوردو شارەكەی ، شاری سلێمانی زۆر زۆر خۆش دەویست، تەنانەت ئێمەی هاوڕێشی خەڵكی سلێمانی بووین، زۆر بەڕێزەوە سەیری دەكردین، هەردەم خۆی بە لێپرسراومان دەزانی، دەیوت مادەم ئێوە خەڵكی سلێمانین و منیش خەڵكی سلێمانیم، واتە من بەرپرسم لە ئێوە بۆ كوێ بڕۆن، ئێمەش هەموو كچەكانی بەشی كوردی دانیشگای بەغدا ئەم هەڵوێستەمان زۆر پێخۆش بوو ، هەستمان ئەكرد برایەكی دڵسۆزمانە، سەد هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی شەهیدی نەمر، نموونەی ڕاستی ، پێشمەرگەو كوردپەروەر و خاك پەروەر و نیشتمان پەروەر بوو .. سەربازێكی بە ئەمەكی ڕێبازی كوردایەتی بوو ، ئەوەندەی لە گەڵیا ژیاین ، ڕۆژێ نەمانبینی تووڕە بێت ، هەمیشە دەم بە پێكەنین و قاقای پێكەنینەكەی هەردەم لە گوێیەكانمدا دەزرنگێتەوە .. ترسی لە كەس نەبوو ، ترسی بەعس و دام و دەزگاكانی نەبوو ، چاو نەترسێكی بێ وێنەو بر ایەكی دڵسۆزی هەموو كەسێكی دڵسۆز بوو . كەم ژیاو كەڵ ژیا ، شەهید عەزیز بەڕاستی هاوڕێ بوو .. هاوڕێ .

# من و شەهید عەزیز

یونس غەفور عەبدوڵڵا

من وەکو خزمو هاوڕێیەکی مامۆستا عەزیز، لەکاتی تەنزیمدا هاوشانی ئەو نەبووم. مامۆستا شێخ عەبدول و کاك مەلا بەختیار لێپرسراوی من بوون. شەهید عەزیز ئەندامی سەرکردایەتی بوو، چەند جار مامۆستا جەمال تاهیر دەهات ، بۆ گەراجەکەی (جەمالە ڕەش) کە من تەسلیمی مامۆستا عەزیزی بکەم. یان بۆی بنێرمە دەرەوە. دووجار لەسەر مامۆستا عەزیز گیراوم ، لەبەرئەوەی کە گوایە من هەموو شتێکم دەربارەی مامۆستا عەزیز ئەزانی، ئەوان خۆیان لەمن باشتر زانیارییان لابوو، بەڵام چەواشەم ئەکردن، زۆریان لێکردووم کە هاتەوە لەناوچەی قەرەداغ پێیان بڵێم، زۆرجار ئەمن ئەیوت کە جەماعەتی (ماو) دێن بۆلات، بەڵام من ئەموت ئێرە گەراجە و خەڵك بەگشتی لێرەوە سوار ئەبن، ئەچن بۆ کاری خۆیان. جارێك لەسەرچنار لەماڵی خوشکی ناردی بەدواما وتی هەڤاڵ مام جەلال ناردوویەتی بەدواما، من هەتا کەڵەکن لەگەڵی بووم کاك (شێخ عەبدول)یشمان لەگەڵدا بوو ، پێم وت ناگەڕێمەوە و ئەبم بە پاسەوانت بەمەرجێ جارێکی تر نەگەڕێیتەوە بۆناوشار .

بەڵام بەبێ ئاگاداری ئێمە گەڕابۆوە ناوشار، لەماڵێك نزیکی مزگەوتی حاجی جەمال گیرا کەماڵی (عومەر) ناوێك بوو پاش سیانزە ڕۆژ حاجی

عوسمان لەمحەلەکەی بە منی وت مامۆستا عەزیز گیراوە لە ڕاستیدا نەمزانی بوو کە گیراوە .

من هەر ئەوەندە لەژیانی سیاسی مامۆستا عەزیز بە ئاگام چونکە من لەپلەی حزبی ئەودا نەبوم ، وەکو هاوڕێ وەکو خزم لە منداڵیەوە نزیکی یەکبووینو یەکترمان خۆش دەویستو لە بیروڕای یەکتری گوێمان ئەگرتو زۆر ئامۆژگاریو ڕێنمایی ئەکردم ، زۆر مەسەلەی سیاسی بۆ شی ئەکردمەوە .. متمانەی زۆری پێم بوو، هیچی لێ نەدەشاردمەوە ، یەکترمان زۆر خۆش دەویست، دەیان جار بە فەرمە بەیانو بڵاوکراوەی حزبیو چەکی تەقەمەنی دەهێنا بۆ ماڵمان، پێی دەگەیاندمە شوێنی خۆی ، زۆری حەز بە سەیران بوو ، ساڵانە چەندین سەیرانمان بەیەکەوە دەکرد ... ماڵی ئەوانیش بۆ من وەکو ماڵی خۆمان بوو ، هیچمان لە یەك نەدەشاردەوە زوو زوو لێم تورە دەبوو ، زووش ئاشتی ئەکردمەوە ، بەڕاستی یادەوەری زۆرم لە گەڵیا بووە ، بەلام هەرچەند دەکەم بۆم نانووسرێتەوە .. من کە گیرا زۆر سپرزە بووم، کە ئاگاداریان کردم ، دەیانەوێت بە گۆڕینەوە بەری بدەن ، زۆر گەشامەوە ، لەو ڕۆژە ناخۆشتر نەبوو، کە لە گەڵ سەبریە خاندا چووین بۆ بەغدا ، بۆ سۆراخی بەربوونەکەیو ئێمەیان نارد بۆ موسڵو کە چووین پێیان وتین ئیعدام دەکرێت ..

# عەزیزی برام

نازەنین مەحمود عەلی

سەرەتا سوپاسی کاك شێخ محەمەد دەکەم، کەوەکو هاوڕێیەکی عەزیزی برام لەلای خۆیەوە. بەرنامەی بۆ نووسینەوەی ژیاننامەی دارشت و ئەرکەکەی گرتەئەستۆ.. عەزیزیزی برام، کە بە (مامۆستاعەزیز مەحمود) ناسرابوو، سالی ١٩٤٣ لە گەڕەکی گۆیژەی کۆن کە بەگەڕەکی گاوران ناسراوە، هاتۆتە دنیاوە. عەزیز پێش ئەوەی چاو بەدنیای سلێمانی و کوردستاندا هەڵبێنێ، بەمانگێك باوکمان کۆچ دەکات و لەدنیادەردەچێت، واتە عەزیز باوکی نەدیوەو باوکیشم کە ئاواتی ئەوە بوو ، کوڕێکی ببێت و بەچاوی خۆی بیبینێ و لەباوەشی بگرێت بەو ئاواتەوە ، سەری نایەوەو کوڕی لەباوەشی خۆیدا نەبینی .

باوکمان واتە(مەحمود)کوڕی مەلاعەلی مەلاغەفووری خەرپانییەو بنەماڵەکەمان بنەماڵەیەکی ئاینیی و مەلا بووە . مەلا عەلی لەبەڕێوەبەرێتی کشتوکاڵی سلێمانی بەڕێوەبەری زەوییو زار (مدیری ئەرازی)بووە .

دایکیشمان (خورشیدە) کچی ئەمینی قادر بەگبووە، کە لە بەگزادەکانی بانەبوون ) دایکم لەناو هاوڕێی و کەسەکانی ترا بە (پوورە خورشە) بانگ دەکرا ..

عەزیز لەناوخێزانێکدا چاوی بۆدنیای خەمو کارەسات کردەوە ، کە پێکهاتبوو لە (دایکێك و دوو خوشك و عەزیز) . دایکمان بە هەوڵ و کردەو

کۆشه . ئەرکی بەخێوکردنو پەروەردەکردنی گرتینە ئەستۆ. وەکو هەموو دایکێکی میهرەبان زۆر بەمیهرەبانی بەخێوی کردینو پێی گەیاندین..دوای کۆچی باوکمان، هەموو خۆشیەکی ژیانی خۆی بۆ پەروەردەکردنی ئێمەتەرخانکرد .

بەتەمەنی حەوت ساڵیی عەزیزی خستە قوتابخانە. رۆژانە دایکم درومانی ئەکرد بۆئەوەی بتوانێت، ئێمە بەباشی بەخێوبکات . بەردەوام وەکو دایکێکی کورد پەروەر، ئامۆژگاری دەکردین. رەوشتی بەرزو کوردانەی فێر ئەکردین . هەمیشە ئامۆژگاری ئەکردین، راستگۆبین و درۆلەگەڵ خەڵکدا نەکەین. خەڵکیمان خۆش بوێت، زۆرجار وەکو حیکاتخوانێك یان وەکو شارەزایەك لە مێژوودا ، باسی سمایل خانی شکاك (سمكۆ)و شەرەکانیو باسی شێخ مەحمودو شەڕەکانی، باسی قازیو کۆماری مەهابادو باسی شێخ سەعیدی پیرانو شۆڕشەکانی کوردی لەتورکیاو باسی بارزانو شۆڕشەکانی بارزانو بارزانیو چوونی بۆ رووسیایی بۆ ئەکردین...ئێمەش شەوانەو رۆژانە، بەدەوریا دادەنیشتینو داوامان لێدەکرد، کە بەردەوام ئەو باسانەمان بۆ بگێڕێتەوە .

عەزیز. مندالێکی بزێوو وریا بوو دایکمی زۆر خۆش دەویستو دایکیشم وای دەزانی ئاسمان کونی تێبووەو عەزیزی لێکەوتۆتە خوارەوە .

منو نەسرین هەستمان دەکرد کە عەزیزی لە هەردووکمان خۆشتر دەوێت، ئێمەش عەزیزمان وەکو تاکەبرا ئەوەندە خۆش دەویست ، ئەگەر جارجارە، ئازارێکیشی بداینایە ، لەدڵمان نەدەگرت . عەزیز هەر عەزیز بوو، عەزیز.. ساڵ بە ساڵ خوێندنی قۆناغی سەرەتای تەواو کرد، چوە پۆلی یەکی ناوەندی .. لەقۆناغی ناوەندییەوە، تێکەڵاوی بزوتنەوەی کوردایەتی بوو.

بەهۆی بەرپابوونی شۆڕشی کوردەوە لەساڵەکانی شەستو یەکدا، کەئەوکاتە پارتی دیموکراتی کوردستان سەرپەرشتیو رابەرایەتی ئەکرد .. بەو تەمەنە منداڵییەوە هەڵپەی ئەکرد بکرێتە(پێشمەرگە)و بچێتە ناوڕیزی پێشمەرگەوە .

بەڵام لەبەرکەمی تەمەنی شۆڕش وەری نەدەگرت.. رۆژانە کەدەهاتەوە ماڵەوە.. باسی پێشمەرگەو شەڕەکانی دەکردو بەدایکمی دەوت حەزدەکەم ببم بەپێشمەرگە . دایکم ئامۆژگاری دەکرد کەئاگاداری خۆی بێتو جاری بیر لەپێشمەرگایەتی نەکاتەوە ، هەموو هەوڵێکی تەرخان بکات بۆ تەواوکردنی خوێندن.. لە ساڵی ١٩٦٢ دا، وەکو زانیمان بۆتە (تەتەر)و لەناو شارەوە ، پۆستە دەبات بۆ دەرەوە . ئێمە لەوکارەی زۆردەترساینو هەمیشە دایکم ئامۆژگاری دەکردین، کە هاوکاری بکەینو ئاگامان لێی بێت ، ئێمەش بەوپەڕی دڵسۆزیی خوشکوبرایانەوە، یارمەتیمان ئەداو هاوکاریمان ئەکرد .

عەزیز .. ماڵە بچکۆلەکەمانی کردبوو بەشوێنی کۆڕو کۆبوونەوەی حزبیو رێکخراوەیی. عەزیز هەرچەند زۆر حەزی لەپێشمەرگایەتی بوو ، لەگەڵ ئەوەشدا حەزی دەکرد کە خوێندن تەواو بکات. بۆیە لەگەڵ کارە حزبیو رێکخراوەییەکانیدا، بەباشی دەیخوێند . عەزیز ئێمەی وەکو خوشکودایکمی وەکو دایک زۆر خۆش دەویست. پەیوەنیمان جگە لە خوشکوبرایی ، بووبووە پەیوەندییەکی (هاوڕێتی). شەوو رۆژ لەقسەی خۆشی و نوکتەکانی و قاقای پێکەنینی تێر نەدەبووین . رۆژانەی ژیانی بەیاریکردنو کۆڕو کۆبوونەوەی لەگەڵ برادەرەکانی لەگەڕەکی (دەرگەزێن)بەسەر دەبرد .

ڕۆژێك بەپەلە هاتەوەو خۆیکرد بەژوورا. ئارەق لەگیانی ئەتکا . بە دایکمی وت من لەگەڕەکی دەرگەزێن نەبم، ئەگەر درەنگ هاتمەوە بە دواما مەگەڕێن و هەرکاتێ خۆم هاتمەوە دێمەوە .

ئێمەو دایکم لێمان پرسی ئەوە چیە بۆ شپرزەی؟ وتی (مامۆستا ئیراهیم ئەحمەد) رای کردووە لە شوێنێکە، ئێمەیان داناوە ، کە ئاگامان لێی بێت تاڵەر ئەچێت ... دایکم و ئێمە لەخەمی عەزیزو مامۆستا ئیراهیمدا بووین.. شەو درەنگانێك بەپێکەنین و دڵخۆشیەوە خۆی بەژووورداکرد. وتی تەواو دەرچوو.. ئەخشەکەمان سەری گرت. لێمان پرسی چۆن و ئادەی بۆمان بگێڕەوە.. وتی ئێمە کۆمەڵێ منداڵبووین لەنزیك ئەو ماڵەی کە (مامۆستای) لێبوو دایاننااین. کەلەبەرئەم ماڵەکەدا تۆپێن بکەین ئێمەش بەردەوام تۆپێنێمان کرد ، ئەو ماڵەی ئەویشی تیادا بووژنەکانی ماڵکە هاتبوونە بەردەرگاو خۆیان بەتەشیڕستن و ساوەربژاردن و بەردرگا شۆردنەوە خەریك کردبوو. تا مامۆستا دەرباز کراو دەرچوو.. ئەو کەسانەی کە مامۆستایان ڕاونابوو، بەدوایدا دەگەڕان ، ماڵ بەماڵ دەگەڕان لەو گەڕەکی دەرگەزێنەدا سەرسام بوون و ئەیان وت چی لێهات و دەبێت بۆمان پەیدابکەن و خەڵکەکەش بەبێ ئەوەی خۆیان تێکبدەن بەپێکەنینەوە وەڵامیان دەدەنەوە ، سەریان لێشێواندن. عەزیز هیچی لەئێمە نەئەشاردەوە .

عەزیز .. هەر لەمنداڵیەوە ، زۆرحەزی لە خوێندنەوەی کتێب بوو. زۆر حەزی لەشیعرەکانی قانع و شێخ نوری شێخ ساڵح بوو .

ساڵی (٦٦،٦٤) کەپارتی بوویە دووبەشەوە . باڵی مەکتەبی سیاسی بەجەلالی ناودەبران و پارتی بارزانی بەمەلایی بەناوبانگبوون ، عەزیز لەگەڵ باڵی مەکتەبی سیاسیدا بوو ، ئەو ساڵانە ماڵەکانی کردبووە بنکەیەکی

بەردەوامی کۆڕو کۆبوونەوە . شوێنی راپەڕاندن و دابەشکردنی بەیاننامەو بڵاوکراوەکانی (حزب).. ئێمە لەکارەکانیدا هاوکاریمان ئەکرد .

بەزۆری منی ئەنارد بۆ گەیاندنی پۆستەو راسپاردەکان ، جارجارە ئەیوت خۆزگە تۆ (کوڕ) ئەبوویت. منیش ئەم وت جیاوازی کوڕو کچ چییە ؟ ئەوە نییە هەرچی بڵێیت دەستوبرد جێبەجێی دەکەم. من تەنها لەدەمانچە دەترسم . هەردەمانچەم مەدەرێ ئیتر هەرچییت هەبێ جێ بەجێ ئەکەم . دایکم بۆ ئەوەی عەزیز تووشی کێشەو نارەحەتی نەبێت. زوربەی کارەکانی لەئەستۆی خۆی ئەگرت و نەسرینیش یارمەتدەرو هاوڕێیەکی بەردەوامی بوو.

عەزیز.. کە خوێندنی ناوەندی و ئامادەی تەولو کرد ، لەساڵی ١٩٦٨دا لەبەشی کوردی زانکۆی بەغدا وەرگیرا.. لەقۆناغی خوێندنی زانکۆیدا وەکو قۆناغێکی تازە، لەخوێندنو ژیانی سیاسی و رۆشنبیری ، کەوتە دنیایەکی ترەوە ، باشترو زیاتر لەهەموو رووەکانەوەگەشەی کردو پێش کەوتو زیاترو زیاتر دەرکەت ( چالاکانەو بەتواناترو بەئەزموونتر ئەرك‌و کارەکانی ئەنجام ئەدا . هاورێ‌و برادەری باش‌و خاوەن بیروباوەڕی کوردایەتی پێشکەوتنخوازی پەیداکرد لەگەڵ کەسانی سیاسی‌و رۆشنبیری‌و ئەدەبیدا هەڵس و کەوتی دەکرد. عەزیزی منداڵی گەڕەکی سەرگۆڵ‌و دەرگەزێن و عەزیزی کوری دایك ، بوو بەعەزیزی خۆشەویستی ناوکۆمەلانی خەڵك‌و تێکۆشەران . عەزیز لە عەزیزی پوورە خورشەی دایك‌و دوو خوشکی دەرچوو بوو بە عەزیزی گەل‌و نیشتمان .

ساڵی (١٩٧٢) خوێندنی زانکۆی تەواوکرد و لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٣ دا بەمامۆستای زمانی کوردی ، لە قەزای عەزیزیە دامەزرا ، مانگانە سەردانی سلێمانی و ئێمەی ئەکردەوە .

لەهاوینی ساڵی ١٩٧٤دا، پەیوەندی بەشۆڕشەوەکردو چووە دەرەوە . لە قوتابخانەیەك لەپێنجوێن بە مامۆستای شۆڕش دامەزرا تاهەرەسی شۆڕش ، لەساڵی ١٩٧٥دا گەڕایەوە سلێمانی نێردرایەوە بۆ عەزیزیە بەمامۆستایی .. لەکاتی ئاشبەتاڵی شۆڕشدا . لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا هەوڵیاندابوو کەبمێننەوەو چەكوتەقەمەنی بشارنەوەو نەگەڕێنەوەو شۆڕش بەرپا بکەنەوە، بەڵام لەبەر بارودۆخی ناهەمواری سیاسی کوردستان و ناوچەکە ناچار بوون واز لەوبەرنامەیە بهێنن و بگەڕێنەوە ناو شار لە ناوشارەکانەوە دەست بەخەباتی نوێ و کاری نوێ و شۆڕشی نوێ بکەنەوە . هەر بەگەڕانەوەی ، کەوتەوە کارکردن و هەڵپەکردن بۆ رێکخستنەوەی رێکخستنەکانی (کۆمەڵەی مارکسی لینینی) ، لەکۆتایی ساڵی ١٩٧٥ دا (سەبریە)ی هێنا و کردیە هاوسەری خۆی .

ساڵی ١٩٧٦ ، لەقەزای عەزیزیەوە ، بۆ ناحیەی عەربەتی سلێمانی گوێزرایەوە ، ئەو ساڵە سەرقاڵی راپەڕاندنی ئەرك و کارەکانی بوو ، بەنهێنی بەردەوام هاتوچۆی ئەکرد و ئیشەکانی ئەنجام ئەدا .. لەئەنجامی چالاکی برادەرانی کۆمەڵە ، رژێم هەستی بە جم و جووڵیان کردبوو . بۆیە لەهەموو لایەکەوە چاودێریی خستبوونە سەر و زۆر بەوردی بەدوای هەڵس و کەوت و جم و جووڵەکانیدا ئەگەڕا ، عەزیزیش یەکێك بوو لەوکەسانە کە رژێم زۆر بەنهێنی و بەوردی چاودێری خستبووە سەر ، رۆژانە برادەرەکانی ئەهاتنە ماڵی ، زۆر جار شەویش دەمانەوە ، دایکم و ئێمە ئەوەی پێمان بکرایە

خزمەتمان ئەکردن ، دیارە کەسەبریشی هێنا سەبریەش بوو بەیەکێك لە خێزانەکەو وەکو هاوسەرێکی ، وەکو ئێمە هاوبەش و هاوکاری راپەڕاندنی کار و ئەرکەکانی عەزیزی دەکرد .

رۆژێك بەئێمە و دایکمی وت .. مێوانێکمان دەبێ . کەهات نابێت ماڵمان چۆڵ بێت و بەجێی بهێڵن . بەهەمیشەیی دەبێت دایکمی لابێت . ئێوە کە دێن زۆر دامەنیشن و دەبێت هەڵس و کەوت لەماڵەکەدا ئاسایی بێت .. کاتێ کە میوانەکە هات سەیرمانکرد (کاك ئارام) بوو نزیکەی مانگێك لەماڵمان مایەوە ، دایکم بەدڵسۆزی خزمەتی کرد . تا چووە دەرەوە ، زۆری نەخایاند .. عەزیزیش بەدوای (کاك ئارام)دا چووە دەرەوە کە رۆیشت وتی: ئەوە هەموتانن .. من هیچ سامانێکم نییە جگە لەئێوە . ئەگەر (سەدام حسێن) هەرهەمووتان بکات بەدارا ، من بڕیارەو داوەمە و فەرمانی کۆمەڵەیەو دەڕۆمە دەرەوە ، دەبم بەپێشمەرگە ، خواحافیزیکرد و رۆیشت .. کەچووە دەرەوە جارجار دەهاتەوە ناوشار بۆ جێبەجێکردنی کاری شۆڕش . بەڵام کاتێکمان زانی لەساڵی ١٩٧٨دا لەلایەن ئەمنی سلێمانی رژێمەوە دەستگیرکراو ماوەی چەند مانگێ بێ سەرو شوێن کرا . دوائەنجام لەبەندیخانەی موسڵ سەریهەڵدا ، بروسکەمان بۆ هات کەبچین بۆ مواجەهەی، هەربەگەیشتنی هەواڵەکە هەموو خزمان و سەرجەم هاڕێکانی کەلەناو شار بوون خۆیان ئامادەکرد و چووین بۆ موسڵ بۆ مواجەهەی ، لەبەردەمی بەندیخانەکەدا هەر هەموو راوەستابوین و چاوەڕوانی چوونەژوورەوەمان ئەکرد. لەپەنجەرەیەکی بچووکەوە هەموو بەندییەکان هاواریان ئەکرد خزم و کەس و کاری مامۆستا عەزیز هاتووە . بەڵام خۆی لەپەنجەرەکەوە هاواریکرد، هەرکەس ببینم بگری نایەمە دەرەوە و

ناتـــانبینم، کـــەدەرگایان کـــردەوەو چـــووینە ژوورەوە ، بەندیـــەکان بـــە عەزیزیشـەوە هەریەکـە شـەروالێکی گوێنیـان لەپێـدابوو لەگـەڵ کراسـێك.. کـەدایکم چـاوی پێکـەوت بـۆ ئـەوەی نەشـڵەژێ باوەشـی پیـاداکردوو وتـی (عـەزیز، شـا رووخـا) هـەموو خەڵکەکـە کـە گوێیـان لەوقسـەیەی دایکـم بـوو. دەستیان کرد بە پێکەنین ، عەزیز وتـی مردووتـانمرێ هـەر بـەمن ئـەڵێن تـۆ سیاسـەت نەکـەی ئەی ئـەوە دایکـم لـەمن زیـاتر سیاسـی نییـە ؟ نـابینن ئـەم مژدە خۆشەی بۆ هێناوم . دیار بـوو دایکـم بـۆ ئـەوەی خـۆی بگـرێ‌و نـەگری بۆیـە وەکـو مژدەیـەك ئـەم قسـە خۆشـەی بەعـەزیز وت ، ئیتر دوای ئێمـە کـە هەریەکـەمان بـەجیا باوەشمـان پێـداکرد . هـاورێ و بـرادەرو خزمـەکان لێـی نزیـك بونـەوەو پێـی شـاد بوونـەوە . من دڵنیـام زۆر باسی بەندیخانـە کراوە بۆیە زیاتر باس ناکەم .

لـە١٩٧٩/٣/٢٢ بروسـکەیەکی ترمـان بۆهـات ، کـە بچینـەوە بـۆ بینینـی‌و رۆژی ٣/٢٣ هەموو خزمان‌و زۆر لە هاوڕێکانی بەرەو موسڵ کەوتینـەڕێ ، کە گەیشـتینە بـەردەم بەندیخانەکـە ، سـەیرمان کـرد، دووکانـەکانی بـەردەم بەندیخانە داخراون . هێزێکی زۆر دەوری سجنەکەیان گرتووە . بەڕێوەبەری بەندیخانەکە لەوێ نەبوو. ئەفسەرێکی لە جێی خۆی دانابوو، ئەویش رێگای نەئەدا کـەس دابـەزێ‌و لـە بەندیخانـە کـە نزیـك بکەوێتـەوە ، وتـی نابێـت لـە دایـك‌و خوشـك‌و ژنـی بـەولاوە کـەس بێتـەژوورەوە، بووبەدەنگـە دەنـگ. لەئەنجامدا ڕێگایـان بەدایکم‌و ژنەکەی‌و خوشکەکانی‌و مامی‌و دایکی کاك یونس و پورێکیدا. ماوەی بینینەکەش تەنها پێنج شەش دەقیقە بوو. ورەی زۆر بەرز بوو. وتی با فاشییەکان بزانن ئێستاش بەرەڵام کەن زیاتر لـەجاران خـەبات ئەکـەم. تـەنها ئەوەنـدەیان لێـی پرسـی هیچـت نییـە؟ وتـی هەرچیم

هەبوو بەماڵی مەلاعەلیدا ناردوومە . ئیتر ئێمە و خەڵکەکە بەنائومێدی گەڕاینەوە دوای شەهیدکردنی .. لەڕێگای موختارەوە چەند جار هەواڵی دایکمیان پرسی . دایکیشم لەتاوا سەری خۆی هەڵگرتبوو زیاتر لەدوو ساڵ خۆی شاردەوە ، سەری مانگانە ئەچوو بۆسەر گۆڕەکەی بۆ موسڵ . لەئەنجامدا موختارەکە رایگەیاندبوو کە پێی بڵێن نەترسێت . حکومەت زانیویتی کوڕی تری نییە تابەخێوی کات . دەیەوێت خانەنشینی بۆ ببڕێتەوەو حکومەت بەرەحمە بۆیە لێی دەپرسێتەوە .

دایکیشم .. لەوەلامیاندا وتبووی حکومەت کەئەوەندە بەرەحمە بۆ کوڕەتاقانەکەی لەسێدارەدام؟

ئەگەر بەرەحمو بەزەیی بوایە کوڕەکەی نەدەکوشتم، باهەر لەسجندا بمایەتەوە. ئەو معاشەی دوای عەزیز بەمنی دەدا من پێویستم پێی نییە ، بیدات بەوکەسەی کە عەزیزی بەگرتدا ، دوای ئەم وەڵامەی دایکم ولزیان لێهێنا تا مرد . شەو و ڕۆژ لەدڵەوە ئەکوڵا و هەربە هەناسەو ئاخ و داخ و حەسرەتی عەزیزەوە سەری نایەوە . تا ئەو ڕۆژەی چاوی لێکنا باوەڕ ناکەم ساتێ چاوی وشککردبێتەوەو هەر دوعای دەکرد ، لەوەی عەزیزی لەناوبرد و دەپاڕایەوە و دەیوت خوایە ئەو کەسەی جەرگی منی دابەتەنوورەوە و ڕۆڵەی لەناوبردم ئەویش ڕۆژێ ببینم بەکۆی زوخاڵ بێت و دەردێ بگرێ کەس نەزانێت چییە .. وەکو سەرنج ئەدەم دوعاکەی دایکم هاتۆتەدی ، ئەوەی بەگرتیدا وادەردی خۆی گرتووەو ئەوەشی بڕیاری لەسێدارەدانیدا کە (سەدام) بوو بەسزای خۆی گەیشت ...

### نەسرین خان :

## من کە عەزیز لە سێدارە درا
## دۆعام کرد دوای مەرگی کەس و دنیا بە چاوانم نەبینم

کاتی دارشتنی بەرنامەی نووسینەوەی ژیاننامەی مامۆستا عەزیز ، رۆژێك سەردانی (نەسرین خانی) خوشکیم کرد و نەسرین هەردوو چاوی کوێربووبوو ، کە زانی یەکێکم لە هاورێکانی عەزیز باوشی پیاکردم ، وتی نات بینم بەلام بۆنی عەزیزت لێدێ .. ئەو جارە قەدەرێکی باش بەیەکەوە دانیشتین بەلام نەمتوانی هیچ بنوسمەوە ، جاری دووەم لە ٢٠٠٤/١/٢٨ سەردانم کردەوە ، تەنها خۆی و کورێکی خوالێخۆشبوو نەرسیم لە مالەوە بوون . ئەمجارە هەر چوومە ژوورەوە ، وتم نەسرین خان چۆنی یەکسەر دەنگی ناسیمەوەو باوشێکی برایانەی وەکو عەزیزی پیاداکردم، وتی زۆر دەمێکە چاوە چاوم بوو سەرم لێبدەیتەوە ، هەر دیارنەبوویت زۆر زۆر بەخێر بێیت ... دوای ئەختێ دانیشتن، وتم هەندێ کاغەزم دەوێ بە کورەکەی کاك نەرسیمی وت : ئادەی رۆلە کاغەزو قەلەمی بۆ بێنە ...

هەر ئەوەندە لێم پرسی خوشکە نەسرین ، پەیوەندی تۆو عەزیز وەکو خوشك و برا چۆن بوو ؟

یەکسەر هەناسەیەکی هەلکێشا و بەحەسرەتێکی زۆرەوە وتی ئەوەندە یەکترمان خۆش دەویست ، ئەوەندە لەلای یەك شیرین بووین ، ئەو رۆژەی کە بۆ بەیانی لە سێدارە دەدرا ، کە باوشم پیاکرد ، دۆعام کرد ، کە دوای بالای عەزیز ئیتر من ئەدنیای رۆشن و نەهیچ بالایەك بە چاوەکانم نەبینم ،

دوای لە سێدارە دانی بە ماوەیەکی کەم نالێم هی فرمیسك ڕشتنی شەو و ڕۆژانەی گریانم بوو ، بەڵکو دۆعاکەی خۆم بوو ، هاتە دیو هەردوو چاوم کوێر بوو ، کە عەزیز گیرا زۆر لە خوا پاڕامەوە لەناوم بەرێت بەڵام خوا دۆعاکانمی وەرنەگرت ... واتا ئێستا هەرماوم .

من و عەزیز باوکمان یەك نەبوو ، باوکی من کە کۆچی کردبوو ، مامی عەزیز بوو ، باوکی عەزیز مامە (مەحمود)م دایکمانی مارە کردبۆوە ، دایکمان لە مامم عەزیزو نازەنینی بوو ، واتە ئێمە بووینە دوو خوشكو یەك برا، مامم پێش ئەوەی عەزیز لە دایك ببێت بە مانگێ کۆچی کرد .. مامم زۆر بەئاواتەوە بوو کوڕێکی ببێت ، بەڵام بە چاوی خۆی کوڕی خۆی نەبینی .. ئەوەندە منی خۆش دەویست هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان ، لە هیچ ڕوویەکەوە هەستم پێ نەکرد ، لە نازەنین جیام بکاتەوە ، زۆر متمانەی پێم بوو، هەر پێی دەوتم (باجە خان ) کە من بوومە هاوسەری ڕەئووف ، بە زۆری دەهاتە ماڵی ئێمە.. هەر دەهات دەستی دەکردە ملمو ئەملاو ئەولای یەکمان ماچ دەکرد ... کە منداڵیشم بوو ، هەرچەند بهاتایە دەستی دەکردە ملی ئاشتیو ئاشناو دیاریو شتی خۆشی بۆ دەهینان .. ڕەئوفو کچەکانی زۆر خۆش دەویست ، ئەوانیش عەزیزیان ئەوەندە لە دڵا شیرین بوو .. کە دیارنەدەبوو، بۆی شپرزە دەبوون .. بەراستی خاڵێکی میهرەبانی هەردوو کچەکەم بوو؛ ڕەئووفیش چ وەکو پورزاو چ وەکو هاوسەری من زۆر زۆر یەکتریان خۆش دەویستو وەکو دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی لەگەڵ یەکدا هەڵسو کەوتیان دەکرد.. ئەو ساڵانەی لە بەغدا دەیخوێند و کە بوو بە مامۆستا لە عەزیزیە، چەند بهاتایەتەوە پێش ئەوەی بچێتە ماڵی دایکم دەهاتە ماڵی ئێمەو دەماننارد بەشوێن دایکما و لەوێ دەمانەوە .. کاتێ (سەبریە خان)ی

دیاریکردو گواستیەوە هێنایە ماڵی ئێمەو زیاتر لە ساڵێك لە ماڵی ئێمە ژیانی هاوسەرێتیان بردەسەر ، ئەو ساڵە ساڵێکی زۆر خۆشبوو لام ، چونکە دەمدی عەزیز ژنی هێناوەو ژنەکەشی خۆشەویستی خۆیەتی و زۆر زۆریش یەکتریان خۆش دەوێت .. من لەبەر دوو شت سەبریەم زۆر خۆش دەویست یەکەم وەکو ئەوەی هاوسەری عەزیزبوو، دووەم لەبەر ئەوەی سەبریە ژنێکی چاك و رووخۆش و سەخی و زۆر گونجاوبوو .. ئەگەر بڵێم ئەوەندەی عەزیزم خۆش دەویست رەنگە درۆ نەبێت ، ئەویش من و رەئووف و کچەکانی زۆر خۆش دەویست و رێزی لە یەکەیەکەمان دەگرت و بەتایبەتی زۆر دەسی بەسەر کچەکاندا دادەهێنا، ئامۆژگاریی دەکردن و یارمەتی دەدان .

خانووەکەی گاوران .. کە عەزیز ژنی گواستەوە ، ماڵی نازەنین و دایکمی تیادا بوو ، دوای ساڵێك نازەنین خانوەکەی چۆڵکردو عەزیزو سەبریە چوونەوە خانووەکەی خۆیان، لەگەڵ دایکما دانیشتن .. کەلە ماڵی ئێمە : برادەرانی بە زۆری هاتووچۆیان دەکرد، من حەزم نەدەکرد ، برادەرەکانی بزانم کێیە ، چونکە دەمزانی عەزیز خەریکی سیاسەتە ، کە چوونە خانووەکەی خۆیان وەکو بزانم .. کاك ئارام چووە ماڵیان ، ماوەیەك لەوێ مابۆوە، لە راستیدا من نازانم ماوەکە چەند بووە ، بەڵام بیستم کە شەهید ئارام چۆتە دەرەوە، ئاتە خانی دایکی چۆتە ماڵی عەزیزو هەواڵی ئارامی پرسیوەو پێی وتوون کوا ئارام ؟ چی لێهات ؟ ئەوانیش پێیان وتووە خەمت نەبێت رۆیشت و گەیشتۆتە جێی خۆی .

عەزیز کە چووە دەرەوە، چەند بهاتایەتەوە ، دەهاتە ماڵی ئێمە .. گەلێ جار هەر لە ماڵی ئێمە دەمایەوەو نەشمایەتەوە هەر سەری لێدەداین .

ئێستاش لە یادمەو هەر لەپێش چاومە، خۆزگا ئەو کاتە چاوەکانم کوێر ئەبوو ، جارێکیان هاتەوە ، لەپڕ خۆی بە ماڵدا کرد .. جامانەیەکی بەسەرەوە بوو ، رەش داگیرسابوو ، تەواو لاواز بووبوو ، باوشم پیاکرد .. ئەوەندەم ماچ کرد تا تاسەم شکا ، وتی (باجە خان) ئەوە بۆ وا دەکەیت .. وتم بە قوربانت بم ، بۆ وا ڕەش داگیرساویو لاواز بوویت؟ ، وتی لەگەڵ تەراکتۆرێکدا سوار بووم، سایەقی تەراکتۆرەکەش پێی وتم تۆ چیت ئەڵێی خەڵووز فرۆشی .. نانێکی خواردو چووە ژوورەوەو نووست . کاتێ (ئاشتی) کچم هاتەوە ، لەبەر دەرگا پێڵاوە لاستیکەکانی بینی .. وتی دایە ئەو پێڵاوانە هی کێیە ؟ وتم خاڵەتە ، وا لە ژوورەوە نووستووە .. هەر ناوی خاڵەیم هێنا .. نەوەستایە سەر ئەوەی هەستێ یەکسەر خۆی بە ژووردا کردو بە نووستوویی خۆیدا بەسەر خاڵیاو کەوتە ماچ کردنیو تا خەبەری کردەوە .. هەر هەستا وتی سەبریە لە کوێیە ؟ وتمان لە بەکرەجۆیە .. وتی دەتوانن بچن بەدوایدا بۆم بانگ بکەن بۆ ئێرە ؟ وتمان بۆ نا .. یەکسەر منو یەکێك لە کچەکان کە لە بیرم نەماوە کامیان بوو ، چووین بەشوێن سەبریدا ، چووینە قوتابخانەکەی ، هەر ئێمەی بینی یەکسەر هات بە پیرمانەوەو وتی خێرە وا بەم بەیانییە هاتوون بۆ لام ..؟ وتمان خێرەو مژدەت ئەدەینێ کە عەزیز هاتۆتەوە، وا لە ماڵی ئێمەیە . ناردووینی بە دواتا کە بێی لەگەڵماندا بۆ ماڵەوە .. یەکسەر مۆڵەتی وەرگرتو بەیەکەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە .. لەو هاتنەوەیدا ، وەکو لە یادم بێت (کاك شازاد و کاك عومەر فەتاحو کاك محەمەد قەرەداخیو چەند کەسی تر) هاتن بۆ لای .. کاك عومەرو کاك محەمەد هاتبوون بۆ لای دایکم نەیانزانیبوو عەزیز هاتۆتەوە .. کە هاتن .. عەزیز لە ژووری پشتەوە دامنابوو .. کە زانی ئەوان هاتوون ، ویستی بێتە

دەرەوەو بێت بۆ لایان، نەمهێشت .. رەئووف بە بیانووی چاککردنی خانووەکەوە ، کاك عومەری بانگ کرد .. کە چووە ژوورەوە عەزیزی بینی ، حەپەساو یەکسەر باوشیان بەیەکدا کردو ئەو شەوە بەیەکەوە مانەوە . رۆژی دوایی عەزیز چووە ماڵی ئازادی پوورزام ، ماڵەکانمان ئەمدیوو ئەودیو بوو ، کاك شازاد هات بۆ لای ، وتم لە ماڵی (ئازاد)ە وتی چۆن بچم بۆ لای ، وتم .. پەیژەیەك لە نێوانماندایە دەتوانی بە پەیژەکەدا بچیە ئەو دیو هیچ ترست نەبێت ..

## سەبارەت بە گرتنەکەی ئاخیکی قووڵی هەڵکێشا و کەوتەوە قسەکردن ، وتی:

کاکە هاتبۆوەو چووبووە ماڵی (عومەر)، عومەر برادەری بوو ، جێی متمانەی بوو ، عومەر سەر بە حکومەت بوو ، بەڵام ئیشی بۆ شۆڕش نەکرد ، بەیانییەك کاتێکم زانی سەبریە بە ئوتومبیلەکەی خۆی عەزیزی هێنا بۆ ماڵی ئێمە.. وتی نەسرین خان تکات لێدەکەم تا دێمەوە نەیەڵیت عەزیز بە هیچ لایەکدا بڕوات ، رووی کردە عەزیزو وتی عەزیز گیان بەڕجا رجات لێدەکەم بەقسەم بکە .. لێرە مەجووڵێ .. ئەمن بەدواتەوەیە من دوای تەواو بوونی دەوام دێمەوە بۆ لات .

هەر ئەو رۆژە پیش نوێژی نیوەڕۆ ، (عومەر) هات بە شوێنیا وتم کاك عومەر رجات لێدەکەم ، وازی لێبێنە ، بالێرە بێت عەزیز وتی ( باجە خان) مەترسە ، وەکو ماڵی ئێوەیەو زۆر خۆمانەن ، ئیتر بە گوێی نەکردمو رۆیشتن.. دوای نوێژ ، کوڕی کەریم سەیفوڵلا ، کە ماڵەکەیان دراوسێمانبوو، ناوی کوڕەکەم بیر نەماوەو وا بزانم ئێستا لە خارجە ..

ئوتـومبیلی پێبـوو، ماڵیـان بەرامبـەر ماڵمـان بـوو .. هـات بۆ لامـان .. وتـی نەسـرین خـان ئێستا لـه گەڕەکی گردی عەلی ناجی .. لای ماڵی محافیز .. هێزێکـی زۆر لـه عەسـکەری‌و ئـەمن‌و ئیسـتیخبارات ، دەوری ماڵێکیانـداو کوڕێکیان تیادا گرت‌و هێنایانه دەرەوە ، خستیانه پیشی سەیارەیەکەوە و کوڕەکە کوڕێکی سمێڵ ڕەشی دەم‌وچاو ئەسمەر بوو .

من‌و دایکم یەکسەر دڵمـان داخوڕپا ، بە وەسفەکەی بە عـەزیزمانزانی ، بەدوای ئەودا بە ماوەیـەك کاتێکمـانزانی کچێك کە خوشکی (عومـەر) بـوو ، هات بۆ ماڵی ئێمەو وتی مامۆستا عەزیز گیرا .. ئاشتی کچم .. پەلاماری داو وتـی ئێوە بەگرتتانـدا ، ئێـوە .. ولزتان لێنـەهینا .. کچە لـه ترسـا یەکسەر رایکردو ڕۆیشت ، هەر ئەو ڕۆیشت ئاشتی بە شپرزەیی بە پەیژەکـەی مـاڵی ئازاددا سەرکەوت بۆ ئەوەی بچێت بە ئازاد بڵێـت ، لەبەر شپرزەیی کەوتـە خوارەوە .. هاولری بۆ (ئازادو عادل)ی پوورزامـانکردو وتـی خاڵـەم گیـراوە ، کوتوپڕ ئازادو عـادل‌و خوشکەکەیان هـاتن‌و منیش بـەو هەواڵـە بوورامەوەو لەهۆشخۆم چووم .. لەگەڵ مندا خەریکبوون تاهۆشم هاتەوە.. وتیـان راسـت نییەو ئێستا دەچین هەواڵ دەزانین‌و مەیکەنە هەرا ..

دوای ماوەیـەك گەڕانـەوە .. وتیـان راسـتەو گیراوەو لـه مـاڵی عومـەریش گیراوە .. زیاتر لە (٣) مانگ عەزیزیان بێ‌سەرو شوێن کردو هیچ هـەواڵێکی راستیمان دەستنەکەوت ، من‌و دایکم بیجامەیەك‌و جووتێ نەعلمان خستبووە عەلاگەیەکـەوە ، ڕۆژانـه دەچـووینە بـەردەمی فیرقـەو دائـیرەی ئـەمن‌و ئیسـتیخبارات دەمانپرسـی‌و دەمانویسـت هـەواڵێکی بـزانین‌و بیجامـەو نەعلەکەی بۆ بنێرین ، دایکم هەر ئەکوڕوزایەوەو دەیوت دایکی مرێ ئێستا نه بیجامەی لەبەردایەو نە نەعلی لەپێدایە ، خۆزگا بەیەکێکدا بۆمان دەنارد.

له هیچ شوێنێك لەو شوێنانەدا ، قوڵاغێکمان دەستەکەوت و کەس راستی پێنەدەوتین ..

رۆژێ لەگەڵ نازەنینی خوشکما چووین بۆ لای پیاوێك کە سەر بەحکومەتبوو ، ناوی ( برایمی سەموون) بوو لە گەڕەکی گاوران ، ماڵەکەیان لای ئاشی ئەلەتریکە کۆنەکە بوو ، نەخۆش یان بریندار بوو ، لەسەر قەرەوێڵەیەك کەوتبوو ..کە چووینە ژوورەوە ، پەلاماری نەعلەکانم داو ماچمکردن .. پێمان وت هەواڵێکی عەزیزمان بۆ بزانە.. وەکو دراوسێیەك .. وتی .. ئا.. ئا.. عەزیزە گیراوە؟ من تەلەفونم بۆ فیرقە کرد . خەبەریان دامێ کە کەسێکمان گرتووە جێگری جەلال تاڵەبانییە ، رۆژی لێپاڕاینەوە کە هەوڵێکمان بۆ بدات .. وتی ئەوە بەمن ناکری و ناتوانم ، ئیتر بە نائومێدی گەڕاینەوە .. کاتێ کە لە موسڵ عەزیزمان بینی و باسی ئەوەمان بۆ کرد کە من نەعلی ئەو برایمەم ماچ کردووە زۆر تووڕە بوو ، وتی بۆ چوون بۆلای ئەو خوێڕییە ئەوە کەی پیاوە .. تۆ بچیت هانای بۆ بەری و نەعلی ماچ بکەیت ، حەزم نەکرد مەرگی منتان بە چاوی خۆتان بدیایە بەڵام نەعلی ئەو ناپیاوەتان ماچ نەکردایە ..

پاش چەند مانگێ .. کاتێکمان زانی رۆژێ لە دەرگایاندا، کە چووین بە دەنگیەوە کابرایەکبوو بروسکەیەکی پێبوو ، لە بروسکەکەدا نووسرابوو کە بچین بۆ مواجەهەی عەزیز لە بەندیخانەی موسڵ.. هەر ئەو سەعاتە ئاگاداری ماڵی (ئازادو عادل) مانکردو ئێمەو ماڵی ئەوان یەکسەر چووین بۆ ماڵی نازەنین ، دایکیشم لەوێ بوو ، کەهەواڵەکەمان دانێ ، هەموو خزمان و برادەرانی کە پێیانزانی کۆبوونەوەو ئوتومبیلیان گرت شەو کەوتینەڕێ بۆ موسڵ ، بەیانییەکەی گەیشتینە موسڵ ، ئەو رۆژە رۆژی مواجەهە بوو،

بەردەم بەندیخانەکە زۆر قەرەباڵغبوو ، دەرگا کرایەوە و ئێمە چووینە ژوورەوە لەبەندەکان پرسیارمانکرد . وتیان مامۆستا عەزیز لەبەشی ئیعدامە .. کەچوینە بەردەمی بەشەکە .. لەپەنجەرەیەکەوە چەند کەسێك سەریان ئاشکرابوو .. سەیریان دەکرد . عەزیز کڵاوێکی لەسەردابوو . دەرگایانکردەوەو عەزیز هاتە دەرەوە ، کەگەیشتە ئاومان بەدەنگی بەرز هاواریکرد دایکم ماوە ؟ یەکەم کەس باوەشیان پیاداکرد سەبریە و ئاشتی بوو . ئەویش بەپێکەنینەوە باوەشی بە سەبریەدا کرد و بەرزی کردەوە . ئینجا یەکەیەکە باوەشمان پیاداکرد و ئەویش بەهەمان شێوە باوەشی بەخەڵکەکەدا دەکرد و بەخێرهاتنی دەکردن . کاتێ دانیشتین .. وتی با قسەتان بۆ بکەم .. دەسی کردە ملی رەووف و وتی من زۆر قەرزاری تۆم ، زۆر ئازارمان داویت چاکەتم لەبیرناچێتەوە ، ئێمە گریاین وتی مەگرین .. ئەگەر یەك کەستان بگری جێتان دێڵم و دەچمەوە ژوورەکەی خۆم ..

وتی کەلەسلێمانی لەماڵی عومەر منیانگرت ، سەعات یەکبوو ، دەمانچەکەم لەکەنتۆرەکەیاندا دانابوو .. کەهاتنە ژوورەوە من چام دەخواردەوە ، وتیان ئەوە چا دەخۆیتەوە ، ویستم بچم بۆ دەمانچەکەم ، هەرزوو کەلەپچەیان کردم نەیانهێشت دەستم بگاتە دەمانچەکە . ئەگەر دەمانچەکەم لەبەردەستدا بوایە تەقەم دەکرد، وا بەئاسانی خۆم بەدەستەوە نەدەدا .. من لەگەڵ کەسێکی تردا ، مەوعیدێکمان لەسەعات پێنجی ئێوارە لەماڵی عومەر هەبوو .. کەئەو هێزە هاتن بۆ گرتنم تێگەیشتم کە پیلانەو بەدەسیسەی ئەو ناپاکە بۆ گرتنم رێکخراوە .. ئیتر ئێمەی تێگەیاند کەهۆی گرتنەکەی چی و چۆنبووە ؟ بەدەسیسەی کێبووە . جێگای داخە ئەو ناپاکە نەلەکاتی شۆڕشدا و نەلەکاتی راپەڕین و نەلەم چەند ساڵەی ئازادی

کوردستان ، تۆڵەی عەزیزی برامی لێنەکرایەوە ، تائێستا بێباکانە وەکو بەرزەکی بانان لەئازادی کوردستاندا دەسوورێتەوە . عەزیز شەرواڵێکی کونکونی وەکو گوێنی لەپێدابوو . کراسێکی سپی کۆنەی لەبەردابوو . پاك سەری تاشرابوو . کڵەپچەی لەدەستابوو .. دەرگای ژوورەکەیان قفڵی گەورە گەورەی پێوەبوو .. وتی دوای چەند رۆژێ بردمیانە کەرکووك و دواجار هەولێر .. (شادمانی عوسمان بەگ) لەگەڵ ئەواندا بوو .

ئەویش حوکمی رەمی درابوو ، کەهاتنە دەرەوە روویکردە هەموومان و وتی : هەرچیتان کردووە هەوڵبدەن مامۆستا ئیعدام نەکرێت .. با ئێمە هەموومان ئیعدام بکرێین ، تەنها ئەو بمێنێت گرنگ نییە .. ئەو (شادمان)ە ئەوەندە بەشێوەیەکی درندانە ئەشکەنجەو ئازار درابوو .. هەموو گیانی بریندار بوو زۆر بەزەحمەت دەیتوانی ئەندامەکانی لەشی بجوڵێنێ ..

عەزیز وتی رۆژێ بەڕێوەبەری بەندیخانەکە بانگی کردم .. وتی مامۆستا ئەگەر ئێستا بەرت بدەین وەکو جاران چاکەت و پانتۆڵ لەبەردەکەیت و بۆینباخ دەبەستیت ؟ وتی : منیش وتم : بۆ نا .. ئەرێوەڵلا چاکەت و پانتۆڵ لەبەردەکەم و بۆینباخیش دەبەستم ..

ئەو ماوەیەی لەبەندیخانەی موسڵبوو چەند جار چووین بۆ مواجەهەی ، هەرجارێك دەچووین . بۆی باسدەکردین کە چەند کەس ئیعدام کراوە ، جارێکیان گێڕایەوە وتی : کوڕێك بەناوی (هۆشیار) حوکمی ئیعدام درابوو . کوڕێکی یەکجار ئازابوو . ئەوڕۆژە بردیان بۆ بەردەمی سێدارەکە .. کڵەپچەکەی پچڕاند و لووتی پۆلیسەکەی شکاند .

لەیەکێك لەمواجەهەکاندا وا رێکەوت جەژنی مامۆستایانبوو . کەمواجەهە تەواو بوو (سەبریەخان) داوای لەبەڕێوەبەری سجنەکە کرد . کەلەبەر ئەو

جەژنە مواجەهەکە درێژکەنەوە . بەڕێوەبەری سجنەکەش لەسەر داوای سەبریە وتی لەبەر خارتری مامۆستا عەزیز (٢٠) دەقیقە مواجەهەکە درێژ دەکەمەوە .

لەیەکێك لەمواجەهەکانـدا کۆمەڵێ نامەی نووسیبوو لەکاتی چوونەدەرەوەماندا ، دایەدەست ئاشتی .. ئاشتی گەیاندییە سلێمانی و لەسلێمانی دایە دەست (ئازاد) ئیتر نازانم ئەونامانە چییان تیا نووسرابوو . یان بۆکێ و بۆ کوێبوون ؟

دوامواجەهە بەبروسکەیەك ئاگاداریانکردین کە بچین بۆ مواجەهەی .. خەڵکێکی یەکجار زۆر لەخزم و کەس و برادەرانی هاتبوون . رۆژێکی بارانبوو . بەردەرگا و دەوروبەری بەندیخانەکە بەهێزێکی زۆر گیرابوو .. کاتی مواجەهەکە پێیانڕاگەیاندین کەتەنها خوشك و دایکی و خێزانی دەتوانن ببینن و نابێت کەسیتر بێتەژوورەوە .

من و نازەنین و دایکم چووینە ژوورەوە ، رەعناخانی دایکی یونس خۆیکرد بەنەنکی و مەلا عەبدولقادری مامیو حەمە فەرەجی مامیشی هاتنە ژوورەوە . خوشکەزاکانی (منداڵەکانی من و نازەنین) چەند هاواریانکرد و لەوبەردەمی سجنەدا خۆیان تلاندەوە نەیانهێشت بچنە ژوورەوە . کەئێمە چووینە ژوورەوە بردیانینە ژوورێکی بچووك و دایاننایین ، عەزیزیان بەکەلەپچەکراوی هێنایە دەرەوە و هێنایان بۆلامان .. هەر کەیشتە لامان وتی کوان .. هەر ئەوەندە هاتوون .. کوا خوشکەزاکانم و سەبریە بۆ دیار نییە .. وتیان خەڵکێکی زۆر زۆر هاتووە .. هەمووی لەبەر دەرگایە و نایەڵن کەسیان بێنە ژوورەوە . سەبریە لەبەغدایە بۆ ئیشی تۆ چووە .. لەبەرامبەری ئەو معاونێك و چەند پۆلیسێك راوەستابوون .. عەزیز رووی

تێکردین و پێیوتین بۆ نایەڵن خوشکەزاکانم و ئەو خەڵکە بێنەژوورەوە ، دەستی بەکەلەپچەکەوە بەرزکردەوە و وتی ئەم کەلەبچەیەی دەستم کەلەپچەی ئاڵتوون و زیوی کوردە . کەلەبچەی شەرەف و مەردایەتییە .. نیشانەی ترسنۆکی رژێمەکەتانە لەکورد و شۆرشگێرەکانی.

معاونەکە .. روویکردە عەزیز و وتی مامۆستا هەرچییت بۆ بکەین کەمە بەلام بێ دەسەلاتین بێ دەسەلات ، نمەنمە باران دەباری .. عەباکەم دابەسەریا و دەستم کردە ملی و دەستم بەریشیدا هێنا و وتم بەقوربانتبم بۆ ریشت نەتاشیوە ، وتی ئاخر ئازادیان لەم رۆژانەدا ئیعدامکرد .. ویستی جگەرە بخوات بەکەلەپچەکەوە دەستیکرد بەگیرفانیا پاکەت و شقارتەکەی دەربهێنێ . لەگیرفانیا نەبوو وتی لەژوورەوە لێم بەجێماوە ، حەمە فەرەجی مامم جگەرەیەکی بۆ داگیرسان ونای بەدەمییەوە .. روویکردە مامە عەبدولقادرو وتی : مامە بیرتە کەهەمووجار کتێبت بۆ دەگرتمەوەو رۆژێك وتت تووشی موشکیلەیەك دەبیت کەس فریات ناکەوێت؟.

لەو رۆژەوەی بەندکراوم ، قسەکانی تۆم دێتەوە یاد کە لەکتێب گرتنەوەکاندا بۆتەگێرامەوە ، لەدڵی خۆمدا دەموت .. قسەکانی مامم راست دەرچوون .. هەرچەند من باوەرم بەو جۆرە قسانە نەبوورەو نییە و بەشتی خەرافیم دەزانین .

دوای ماوەیەك کاتێکمان زانی سەبریەخانیش پەیدابوو . وتی سەبرییە .. درۆیان لەگەڵتانا کرد . ئەوە من ئەمشەو ئیعدام دەکرێم . ئەمرۆ بەیانی سەعات (٦) بریارەکەیان بۆ خوێندمەوەو ئەمشەو سەعات (١٢) بریارەکە جێبەجێ دەکرێت .

دەسـیکرد بەگیرفانیـدا ئەڵقەکـەی دەسـتی و سـەعاتەکەی دەرهێنـا .. ئەڵقەکەی دایەدەست سەبریە و سەعاتەکەشی دایە نازەنین و وتی بیدەرە (جیهان) . سەبریە دەستیکرد بەگریان و وتی من دوای تۆ چی لەئەڵقە بکەم .. وتی مەگری .. تۆش وەکو ژنـی هـەموو ئەو تێکۆشەرانەی وەکو منیان بەسەرهاتووە . ئەڵقەکە بپارێزە و سەربەرزانە هەڵسوکەوتبکە . من هەرلەو شوێنەداو لەدواماوەجەهەدا ، وتم عەزیز رەبی دوای تۆ منیش نەژیم و بەم چاوانەم نەکەس و نەدنیای رووناك نەبینم ... لەو ماوەیەی کەلەگەڵیابووین چەندجار دەستی بەکەلەپچەوە بـەرزنەکردەوەو، دەیـووت ئـەم کەلەبچەیە کەلەپچـەی ئـاڵتوونی کـوردەو شـەرەفی کوردپەروەرانـەو شـەرمەزارییە بـۆ فاشییەکان ، ئێستا هەرچەند دەکەم ئەو رۆژ و سات و قسانەم بیربچێتەوە کوێرتر بم بیرم ناچێتەوە ناچنەوە .. من دوای شەهیدکردنی عەزیز .. ئاواتم ئـەوەبوو . کەئـەو رژێـم و سـەرۆکە دیکتـاتۆرەی رۆژێ لـەرۆژان بەسـزای تاوانـەکانیان بەرامبـەر گـەلی کـورد بگـەن . ئەوەشـی ناپـاکی و خیانـەتی لەعەزیز کرد بەسزای خۆی بگات ئێستا ئاواتێکیانم هاتوتەدی ، ئەویش بەندکردنی سـەدامی دیکتـاتۆرەو خۆزگا دەیاندایە دەستی من بۆ ئـەوەی تۆڵـەی عـەزیزم لێبکردایەتـەوە ، بەچـەقۆیەکی کـول رۆژێ پارچـەیەکم لێدەکردەوە .

کەگەڕاینـەوە .. چـەند کەسێك لەموسڵ مانـەوە ، بۆئـەوەی بـزانن لـەکوێ دەینێـژن .. ویستمان پرسـەی بۆ دابنێین رێگایـان نـەدا .. ناچار بەدزیـەوە پرسەی ژنانی لەماڵی نازەنین دانراو دواجار گواستیانەوە بۆ ماڵی باوکی سەبری و نەیانهێشت پرسەی پیاوان دابنرێت .

**دوای باسکردنی سەردانەکانی بۆلای عەزیز و دوا مواجەهەی کەوتە باسی چوونیان بۆسەر گۆڕستانەکەو هەڵدانەوەی گۆڕەکەی و وتی :**

دوای پرسەی ژنان بەچەند رۆژێ ، ژمارەیەکی زۆر لەژن و پیاوی خزم و کەس و کار ، چوویین بۆسەر گۆڕەکەی لەگۆڕستانێ لای موسڵ .. نەماندەزانی بەراستی کامە گۆڕی ئەوە . دوو گۆڕی تازەی لێبوو .. دەورمان لەگۆڕێکیانداو کەوتینە هەڵدانەوەی .. قیان و ئاشتی خەریکی هەڵدانەوەی خۆڵی سەر گۆڕەکە بوون، کە گەیشتنە سەر تەرمەکەی هەردووکیان بوورانەوە، ئازاد و سەلاحیش کە چاویان بەتەرمەکەی کەوت ئەوانیش بوورانەوە، زۆر شتم لەدڵدایە بەڵام لەدانیشتنێکی وادا ناتوانم هەرهەمووی بگێڕمەوە و باسی بکەم.. لەکۆتاییدا دەڵێم عەزیز هاوڕێی زۆری هەبوو.. ئەگەر هەریەکەیان لاپەڕەیەك لەبیرەوەرییان بنووسنەوە، کتێبێکی گەورەی لێدەردەچێت . ئیتر نازانم چەندیان بەدەنگی تۆوە هاتوون.. ئەگەر ئەو هاوڕێیانە تۆزێ وەفایان بۆ ئەو هاوڕێیەیان هەبێت شتیان لەسەر عەزیزی برام دەنووسی... توخوا ئیتر لێمگەڕێ بابەس دەردی دڵی خۆم هەڵبڕێژم.. ئەگەر تەسجیلێکم لادابنێی و رۆژانە بیرەوەرییەکانم لەگەڵ عەزیزدا بگێڕمەوە رەنگە ببێتە کتێبێکی گەورە .. عەزیز عەزیزی من و رەئوف و منداڵەکانم بوو. عەزیز لەئێمە رۆیشت .. حەز دەکەم پێتبڵێم درۆش ناکەم، بەسات عەزیزم لەبیرناچێتەوە، کەئەنووم خەوی پێوە دەبینم و هەر لەگەڵیام و کەبەخەبەریشم، هەموو هەڵس و کەوت و قسەو پێکەنینەکانی لەپێش چاومە.. کەناندەخۆم وا هەستدەکەم دەستی لەملمدایەو بەبانگ بانگم

دەکات ، کەدەرگا دەکرێتەوە گوێم لەدەنگی (باجە خانی) ئەوە . بیستوومە ئەوەی پلانی گرتنی دانا .. تووشی دەردێکی کوشندە بووە .. دوعام ئەوەیە پانزەساڵ بەو دەردەوە بناڵێنێ و کەسێك پێیبڵێت ئەو دەردەت ئەنجامی خیانەتتبوو لەمامۆستا عەزیز .

# حاجی مەمۆ و شەهید عەزیز

عەباس محەمەد حسێن

(حاجی مەمۆ)

لەرۆژانی یەکەمم لەژیانی خوێندنی زانکۆ لەبەغداد ، چەند برادەرێك هەرچەندە لەپۆلەکانی پێشەوەی من بوون ، ئەو هاورێیانە بەزوویی سەرنجیان راکێشام کە لەپێشی پێشەوە جوانەمەرگ (یاسین ئەنوەر کەرکوکی) بوو کە داخی گرانم لەهاوینی سالی (١٩٧١) بە رووداوی ئۆتۆمبێل لەنێوان بەغدا و شاری کوت گیانی لەدەستدا ، ئەوجا مامۆستا عەزیز مەحمود بوو، کەخەڵکی شاری سلێمانی بوو .. بەجۆرێك ئاشنای یەکتری بووین ، زۆربەی رۆژان هەتا دوای خوێندنیش ، کاتەکانمان بەیەکەوە بەسەردەبرد .. مامۆستا عەزیز و یاسین دوو هاورێی جوامێری چالاکی رێبازی کوردایەتی بوون ، دوو هاورێی خاکی و دڵسۆزی هەڵکەوتووی خەباتی رۆژانی سەرەتای دامەزراندنی کۆمەڵەبوون ، ئەو دوو مرۆڤە لەناو قوتابیانی کورد لەزانکۆی بەغدا تابڵێی خۆشەویست و بەرچاو بوون . هەردووکیان نێوانیان زۆرتر لەگەڵ ئەو خوێندکارانە خۆش بوو کە هەم لەرووی ئابوورییەوە هەژار بوون و هەمیش خەڵکی شارەکانی دیکە بوون ، بەتایبەت لەخانەقین و بادینان و هەولێر ..

سالی (١٩٧١) بوو کە رژێمی روخێنراوی بەعس ئەو رۆژانە سەرقالی راوەدوونان و دەرکردنی کوردە فەیلییەکانی شاری بەغدا و دەوروبەر بوون،

یــەکێتی قوتابیــانی کوردســتان لەناوشــاری بەغــدا وەك ڕێکخراوێکــی بەجورئەت و چاونەترس ، بەدەرکردنی بەیاننامەو هەتا ڕووبەڕووبوونەوەی نارەزایی دەربڕینی خۆپیشاندان و کۆبوونەوە و مانگرتن کەوتبووە ئاستی بەربەرچدانەوەی ئەو شاڵاوە دڕندانەیەو ئێمەش لەکۆلێجی ئاداب بەشی کــوردی و تێکــڕای قوتابییــە کوردەکــانی بەشــەکانی دیکــەی کۆلێجەکــە خەریکی کۆبوونەوەو ناڕەزایی دەربڕین بووین لەلایەن چەند قوتابییەکی بەشی کوردییەوە دەستکرا بەدابەشکردنی بەیاننامەکەو لەماوەیەکی کەمدا بەناو هەموو کولییەی ئادابدا ، بەباشی بڵاوکرایەوە.. دوای دابەشکردنی بەیاننامەکە بەرپرسانی یەکێتیی نیشتمانیی قوتابیانی عیراق شپرزەبوون و چەند کەسیان لەوانە بانگکرد کەبەیانەکەیان بڵاوکردبۆوە .

ئەوەی لەبیرم بێت و بەهەڵەدا نەچووبم .. شێخ محەمەد و قادر حەمەئەمین و عەبدولستار خانەقینی بوون. بردیاننە ژووری (اتحاد).. ئێمەش هەموو قوتابیانی بەشی کوردی و بەشەکانیتر ، بەسەرپەرشتیی شەهید عەزیز.. هــەر هــەموو کۆبووینــەوەو وەکــو خۆپیشــاندانو نــاڕەزایی دەربــڕین بــۆ دەرکردنی کوردە فەیلییەکان و گرتنی ئەو برادەرانەمان.. چووینەبەردەم ژووری (اتحاد).. کاتێکمان زانی کاك عادل موراد لەگەڵ چەند برادەرێکی تردا پەیدابوون. کاك عادل بەشەق دەرگای ئیحادی کردەوە، شێخ محەمەدو برادەرەکانی هێنانە دەرەوەو ئێمەش بەدوایاندا تاسەرجادە ڕۆیشتین. دوای ئەوە بەرەو کولێژی قانوون چووین، چونکە بیستبوومان لەوێش قوتابی گیراوەو شەڕ لەنێوانی قوتابیانی سەر بەئیتحاد و قوتابیانی (یەکێتیدا) ڕوویداوە بۆ ئەوەی فریای ئەو قوتابییانە بکەوین و پێشەنگی ئەم خۆپیشاندانە شەهید عەزیز بوو..

بەعسییەکان کەچاویان بەئێمە کەوت دلوای هێزی پۆلیس و ئەمنیان کرد بۆ ئەوەی پەلامارمان بدەن، پێش ئەوەی ئەوان لێمان بێنەدەست ئێمە بلاوەمان بەخۆپیشاندانەکە کرد.

سالی (١٩٧١) بوو کە بڕیاری خۆماڵیکردنی نەوت دەرچوبوو ، یەکێتی قوتابیانی کوردستان و بەشێکی زۆری قوتابییە کوردەکان لەگۆڕەپانی (مەیدان)ی سەرەتای شەقامی (الرشید) گردبیوینەوە ، ئەو رۆژە ریزەکانی قوتابیان پەرەوازەو لاواز بوو ، عەزیز مەحمود و یاسین ئەنوەر دوو لەو کەسە دیارانە بوون وەك کوڕی تەنگانە ؛ هاتنە دەست و تێکڕای قوتابیانی کوردیان ڕێکخست و بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش ئێمە قوتابی کورد هەموو دروشم و هوتافەکانمان لەناوەڕاستی بەغدا دەشەکایەوە و (عەزیز) و (یاسین)ی جوانەمەرگ (عومەر مستەفا) کەخەڵکی رەواندوز و دۆستی کۆمەڵەبوو ، هوتافیان هەڵدەدا و تێکڕای قوتابییان بەیەك دەنگیی دەیانگوتەوە ، بەشێوەیەك یەك سیمفۆنیای شۆڕشگێڕانەی سازاندبوو کە لەناو تێکڕای ڕێڕەوەکە ، دەنگی کوردان بەسەرەوەبوو ، ئێستاش لەبیرمە ، قوتابییە عەرەبەکان هاواریان دەکرد (نفط العرب للعرب) و ئێمەش بەدەسپێشکەری برادەرانی ناوبراو بەهەموو دەنگمان دەمانقیژاند (نفط العراق للعراق) و (شط العرب للعرب) و بەکوردیش هاوارمان دەکرد ، (نەفتی خۆمان بۆ خۆمانە) ئەم کاروانە هەتا نزیکی گۆڕەپانی (التحرير) بەردەوام بوو، کە تێکڕای ڕێڕەوەکان لەوێ یەکیان دەگرتەوە ، لەو بەیەك گەیشتنەی ئاپۆرەی جەماوەری زۆرو زەبەنی خەڵکی دەنگی زولالی هوتافەکانی عەزیز مەحمود و هاوڕێیەکانی وەك تریشق و هۆری هەورێکی تورە ئاسمانی ئەو ناوەی کۆنترۆڵ کردبوو ، ئەوەبوو دیسانەوە جەلادەکانی رژێم پێی قەڵس

ببون و لەهەموو لایەکەوە پەلاماری ئێمەی قوتابیانی کوردیاندا ، بەلاّم ئێمە لەوان بەدەست و بەردتر بووین ، خێرا خۆمان دەربازکرد و کەسیان پێنەگیرا.

هاوینی سالّی (١٩٧٣) بوو لەگەلّ برایەکەم کە هەندێ نەساغ بوو ، بۆلای دکتۆر چوبومە شاری بەغدا، لەوێ مامۆستا عەزیزم دیتەوەو بۆ شەو چوینە ئەو (شوقەیە) کەشوێنی نیشتەجێی هاوڕێیانی کاك ئارام (شاسوار جەلال) و (حەمە قەرەداغی) و (نەجمەدین عەزیز) بوو، چەند شەوێك لەوێ ماینەوە ، هەر بۆ رۆژی دوایی شەهیدی سەربەرز (جەمالە رەش) هاتە ئەوێ و بۆ شەوەکەی لەگەلّ مامۆستا عەزیز چوبوونە دەرەوە ، منیش لەگەلّ برایەکەم چوبوومە لای دکتۆر . ئەو رۆژانەش سەردەمی (ابو طبر) بوو ، مامۆستا عەزیز و جەمالە رەش چوبوونە لای ئەبو نەواس و سەری خۆیان گەرم کردبوو ، درەنگانێ هاتبوونەوەو ئێمەش لەسەربان خەوتبووین ، بۆ بۆخۆیان بەهەلّە ناچن لەدەرگایەکی کۆلاّنێکی پشتەوە نادەن ، ئەو مالّەش سەربانەکەیان نەوی و نزم بووە ، خەلّکەکەی کەبەخەبەر دێن ، دەبینن بەو شەوە درەنگە ، دوو کەس لەسەری کولاّن و ماشێنێك رایانگرتوەو هاتوون لەدەرگا دەدەن ، ئیتر دەیکەنە هاوار هاوار بەناوی ئەها ئەبو طبر ، ئەبو طبر و بەکەرپوچان (خشتی سەر تارمەی سەربانەکان) دەکەونە وێزەیان ، لەو دەرفەتە ئەوان دێنەوە هۆش خۆیان تێدەگەن هەلّەیان کردووە و بیریان دەکەوێتەوە کە هەردووکیان دەمانچەیان پێیەو بەهەلّەداوان رادەکەن و دەگەنەوە سەیارەکەیان و بەهەزار نالّی عەلی خۆیان دەرباز دەکەن و ئەو شەو دەچن لەئوتێل دەخەون و ئێمە بەیانی بەم بەزمەمان زانی .

کاتێ شەهید عەزیز گیراو لەبەندیخانەی موسڵ سەری هەڵدا، لەخزم و کەس و برادەرانی بۆ بینینی دەچوون بۆ مواجەهەی. ڕۆژێ لەگەڵ هاوڕێم کاک ئەنوەر مەحمود چووین بۆ مواجەهەی. ئێمە پێش ئەوان گەیشتینە بەردەمی بەندیخانە. چاوەڕوانی خوشك و خێزان و کەسوکارەکانیمان دەکرد .. کەئەوان گەیشتن بەیەکەوە هەموو چووینە ژوورەوە.. من نامەیەکی سەرکردایەتی کۆمەڵەو (ی.ن.ك) پێبوو بۆی.. لەناو ئاپوورەی خەڵکەکەدا و لەو کاتەی کەباوەشمان بەیەکدا کرد.. نامەکەم خستە دەستێوەو لەناو خەڵکەکە خۆی دزییەوە بۆ ئەوەی بزانێت چییە.. بەرووی گەش و ورەی بەرزو قاقای پێکەنینەوە چووەوە ناو خەڵکەکە.. هەر دانیشتین ئەو هەموو جۆرە خواردنەی کەلەسلێمانییەوە بۆیان هێنابوو.. سفرەیان ڕاخست و لەسەر سفرە ڕیزکراو بەکۆمەڵ لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا دەستکرا بەنان خواردن من کیسەیەکم پێبوو. کیسەکە شووشەیەك عەمبە بوو. کەبۆم بردبوو. مامۆستا عەزیز وتی مردوو ئەو کیسەیە چییەو چیت بۆ هێناوم.. منیش وتم عەمبە.. دەزانم حەزت لێیەتی بۆیە بۆم هێناوی. وتی ئەوە بۆ نایخەیتەسەر سفرەکەو یەکسەر عەمبەکەم لەکیسەکە دەرهێناو خستمە سەر سفرەکە.. وتی زۆرم حەز لەعەمبەبوو. وا ئیعدام نەکرام و عەمبەشم خواردەوە.. ئەمەش بیرتیژی کاکە عەباسە. کەلەبیری ماوە من چەندم حەز لەعەمبە دەکرد.

ئەو ڕۆژە سەیرمانکرد یەکێك لەزیندانییەکان دەستوپێی کۆتکراوە، لەمامۆستا عەزیزمان پرسی ئەوە کێیە؟ وتی ئەوە ناوی (سەیدە)یە پێشمەرگەی لای مەحمود یەزیدی بووە، لەبادینان گیراوە. حوکمی لەسێدارەدانی دراوەو ئێستا بانگی ئەکەم نانمان لەگەڵدا بخوات، بانگی

کرد، بەدەست و پێی زنجیرەوە هاتە سەر سفرەکەو نانەکەی لەگەڵدا خواردین.. لەگەڵ نانخواردنەکە، پەیتا پەیتا مامۆستا عەزیز قسەو نوکتەی خۆی بۆ دەکردین بەرووی گەش و بەپێکەنینەوە نانەکەمان خوارد.. ماوەی مواجەهە دوو سەعات بوو.. هەر نانەکەمان خوارد پۆلیس پەیدابوو.. ئاگاداریانکردین کەمواجەهە تەواو بووە با خەڵکەکە بڕۆنە دەرەوە. من و کاک ئەنوەر پێش خەڵکەکە ئەملاولای یەکمان لەگەڵ مامۆستا عەزیزدا ماچکرد و بەچاوی پڕ لەفرمێسک و قوڕگی پڕەوە بەجێمانهێشت.

لەکۆتاییدا دەمەوێت بڵێم ئەمەی کەنووسیومە بەشێکی زۆر کەمە لەیادگاری و بیرەوەرییەکانم لەگەڵ ئەو کەڵە پیاوە قارەمانەدا.

# خاڵەم کەم ژیاو کەڵ ژیا

فرمێسک محەمەد

لەو ڕۆژەوەی فامم کردۆتەوە .. خاڵەم وەکو مامۆستایەك و ڕێنیشاندەرێك هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکردین .. بەبەردەوامیی ئامۆژگاریی دەکردین و بەخەممانەوە بوو . کەئەمانە ماڵمان بەدایکمی دەوت (باجە خان) سەد باجەخان لەدەمی دەکەوتە خوارەوە .. هەرجارێك بهاتایە .. بەدەستی بەتاڵ نەدەهات ، دیارییەکی بۆ دەهێناین ، دەیوت فرمێسك گیان ئەوەم لێبگرە و مەڵێ جوان نییە .. منیش دەموت خاڵەگیان .. هەموو شتێکی تۆ جوانە ، دیاریت ، قسەت ، پێکەنینت نانخواردنت ، هەڵسانت ، دانیشتنت ، خەوتنت .. هاتنەژوورەوە و چوونە دەرەوەت ..

هەرچەندە خاڵەم لەبنەماڵەیەکی هەژار بوو ، بەڵام دڵ و دەروونی ئەوەندە دەوڵەمەند بوو .. باوەڕناکەم کەسێك بووبێ شانی لەشان دابێ چەند بڵێی ئەوەندە سەخی بوو ، هەمیشە دەم بەپێکەنین و ڕووخۆش و گەشبینبوو .. بیرم نایەت ڕۆژێك بەتووڕەیی قسەی لەگەڵدا کردبێتم . خاڵەم خاوەنی بیروباوەڕی کوردایەتی پاکبوو، مامۆستایەکی پێشکەوتوخواز بوو. عەشقی کوردو کوردستان و شارەکەی سلێمانی بوو .. لەمنداڵییەوە ژیانی تەرخانکردبوو بۆ میللەتەکەی .. بۆیە ئێمەش بەبیرو باوەڕی کوردایەتی گۆشدەکرد ، فێری دەکردین دڵسۆزی گەل و نیشتمانەکەمان بین.. خاڵەم ماڵی کردبووە بنکەی پەروەردەکردن و ئەنجامدانی چالاکی سیاسی،

تەنانەت خوشکەکانی و دایکیشی کردبوونە هاوکاری خۆی و ڕۆژانە کاری بەسەردا دەدان، خزمە نزیکەکانیشی وای لێکردبوو کەوەکو خۆی پەرۆشی ڕێبازی کوردایەتی بن .. من لەبەر ئەوەی منداڵ بووم ، هەموو کارە سیاسییەکانی ئاگادار نیم .. بەڵام ئەوەم زۆر باش لەیادە کە خاڵەم بوو بەپێشمەرگەو لەناو شارەوە چووە دەرەوە بۆ ناو هێزی پێشمەرگە .. دوای چوونە دەرەوەی زۆر جار دەهاتەوە سلێمانی، دەهاتە ماڵی ئێمەو زۆر جاریش دەمایەوە ، ئێمە لەخۆشەویستی خاڵمان ، هەر بەدەوریدا ئەهاتین و ماچمان ئەکرد و گوێمان بۆ قسەکانی رادەگرت .

ئەوەشی لەبیرمە کەجارێك لەجارەکانی هاتنەوەی بۆ ناو شار لەلایەن دەزگاکانی رژێمەوە کەوتە بەر شاڵاوی گرتن و گیرا .. دوای چەند مانگ بێ سەرو شوێنکردن ، ڕۆژێك ئاگاداری دایکم و نەنکمیان کرد کەوا لەموسڵە و خۆمان ئامادە کرد و لەگەڵ دایکم و هەموو خزماندا بەرەو موسڵ کەوتینەڕێ.. کەچووینە ژوورەوە من بەحاڵە حاڵ خاڵەم دەناسییەوە.. ئەو خاڵە بەزەوق و شەوقەم کەدیمان شەرواڵێکی کۆن و دڕاوی لەپێدابوو ، کلاوێکی چڵکنی لەسەردابوو ، هەرچاوی بەئێمە کەوت بەزەردەخەنە جوانەکەی تا دەرگایان لێکردەوە بەخێرهاتنی یەکەیەکەمانی دەکرد . کەهاتە دەرەوە .. ئەو بۆ ئێمە و ئێمە بۆ ئەو تامەزرۆ بووین ، باوەشی بەیەکەیەکەماندا کرد و بەپێکەنینەوە ماچی دەکردین .. دایە خورشە ئەوەندە لەباوەشی گرت و بەخۆیەوە نووسان و بەرزی کردەوە وتی: من ئائەم دایکم بوو شەرەفی لەسێدارەدانم لەپێناوی گەلەکەمدا پێ بەخشرا، من دایکم هەبوو، دایك، ڕووی کردە خەڵکەکە و وتی داواتان لێدەکەم ئاگاداری دایکم بن. کەمن لەسێدارە درام پێی لێمەبڕن..

خاڵــەم لەســەرباری خــەمی گرانــی خۆیــەوە . دڵخۆشــیی یەکەیەکــەی زیندانییەکانی دەدایــەوە، وەکو مامۆســتایەك ئامۆژگاریی دەکردن ، دیارە هەر ئەوەبوو وای لەزیندانییەکان کردبوو هەرهەموو هاواریان دەکرد .. ئێمە تەنها مامۆستامان بۆ بمێنێ هیچی ترمان ناوێت ئێمە بشمرین گرنگ نییە .. خاڵــەم لــەو بارودۆخــەی زیندانــدا لەخــەمی شــۆڕش و پێشــمەرگە و گەلەکەیدا بوو .. بەقاقای پێکەنین کۆڕی دانیشتنی خۆش دەکردو دەیوت دوژمن خەیاڵی خاوە کورد بە لەناوبردنی ئێمە لەناوناچێت .

ئــــای .. ناخۆشــــترین ڕۆژ و ســــامناکترین ڕۆژ لەژیانمــــدا ڕۆژی (١٩٧٩/٣/٢٣)بــوو کــەدوایین ســەردانمانبوو بــۆلای کەبۆشــەو بڕیــاری جێبــەجێکردنی لەســێدارەدانی درابــوو. ئــەو فاشــییانە نەیانهێشــت ئێمــە چاومان پێی بکەوێت ، ئێمە پەرۆشی ئەو ئەویش پەرۆشی ئێمەبوو .. ئێمە هاوارمان دەکرد . دەبێت بچینە ژوورەوە و خاڵەم ببینین .. جەندرمەکانی بەندیخانــەش کــەزانیان گوشــاریان بــۆ هــاتووە هەرەشــەی کوشــتنیان لەخەڵکەکــە کــرد ، بــەم شــێوەیە خاڵــەم بەتەمــەنێکی کورتــەوە ، خــەباتی لەپێناوی مافــە ڕەواکانی گەلەکەیــدا کــرد و بەســات لــەڕێبازی بزووتنــەوەی کوردایــەتی دوور نەکەوتــەوە .. ســەد مــەخابن . خاڵەم کــەم ژیــا ، بــەڵام زۆر جەربەزانە و دلێرانە و کەڵانە ژیا .. ئاخ .. ئاخ بۆ خاڵی میهرەبانمان ..

# شەهید عەزیز و چەند بیرەوەرییەك

گۆران قەرەداغی

هەردووکمان قوتابی هەمان ناوەندی بووین ، باش لەیادم نییە ، ئەو پۆلێك یان دووان لەپێش منەوە بوو . راستەوخۆ یەکدیمان نەدەناسی ، وەلێ سلاوی سەرەڕێمان لەنێواندا هەبوو . عەزیز مەحمود لەقوتابخانەکەدا دەناسرا ، تابلێی قسەخۆش و خۆشمەشرەف بوو ، لەهەمان کاتدا خاوەن کەسایەتییەکی رێزدار بوو . قوتابییەکان بەخۆشی و شانازییەوە لێی کۆدەبوونەوە و گوێیان بۆ رادەگرت . لەدامرکاندنەوەی دەمەقالێ و پێکهەڵپژانیاندا رۆڵێکی کاریگەری هەبوو ، گەلێ جار کاریگەرتر لەرۆڵی بەڕێوەبەر و مامۆستاکان. عەزیز بەپێچەوانەی منەوە کەڵەگەت هەڵکەوتبوو، تێکسمڕاو و بەخۆوە بوو ، هێندە بۆشناخیش بوو وەکی دەڵێن ((خوشکی خۆی حەیرانی دەبوو)) ، منیش وەکو قوتابییەکانی دی سلاوم لێدەکرد ، هەستم بەگەرمیی سلاو و وەلامدانەوەکانی دەکرد . واپێدەچوو سووسەی بیروباوەڕی کوردانەمی کردبێ ، ئاخر من دەمزانی کەئەویش سەر بەهەمان رێبازی فیکریی منە.

<u>لێکنزیکبوونەوەمان</u> :

سەرلەبەیانییەك (٣-٤) قوتابی هەم لەخۆم بەتەمەنتر ، هەم بەقەلافەت گەورەتر لەبەر دەروازەی قوتابخانەکەماندا رێگایان پێ گرتم . لەپرسیار و

گفتارەکانیاندا دیاربوو نەیاری بیروباوەرم بوون . دوانیان توند گرتمیان و ئەوانی دی وەکی پۆلیس کەوتنە پشکنینم . بەیاننامەیەکی یەکێتی قوتابیانی کوردستانیان لەباخەڵم دەرهێنا ، ئیدی بەشەق و شەقازلە تێمکەوتن . نایشارمەوە دوو دڵ بووم لەدەستکردنەوە . لەپڕ لەدوامەوە دەنگێکی بڵندی دلێر وتی : (نەکەن کورە .. نەکەن ، واهاتم بۆتان) کە ئاورم دایەوە بینیم عەزیز مەحمود فریشتە ئاسا وا بەفریام دێ . هەرکە گەیشت خۆی هاویشتە نێوانمانەوەو یەکدوو زللەی گەیاندە دوژمنەکانم ، منیش ترسم ڕەوایەوەو هەندێ شەق و بۆکزم وەشاند . ئیدی کاری راستبێ ، کلك لەناوگەڵ دوورکەوتنەوەو چی دی نەیانەوێرا تەماشایشم بکەن . عەزیز مەحمود پرسی : چیە ئەوە ، بۆ رێگەیان پێ گرتیت ؟ لەوەڵامدا وتم نازانم ، ئیدی دانەویمەوەو بەیاننامەکەم لەسەر زەوی هەڵگرتەوە ، کەدیاربوو لەشپرزەییدا لێیان بەربووبۆوە . کاك عەزیز تەماشایەکی کرد و وتی : هەڵیگرە با کەس نەیبینێ ، من بۆخۆم دەمزانی کەتۆیش لەخۆمانیت . ئەوانەش کە گەلەکۆمەکییان لێکردیت زۆڵە کوردن و لێیان مەترسە ، برات لەپشتتە .

لەو روداوە بەملاوە پەیوەندیمان بەهێزتربوو ، ناوبەناو پێکەوە دەوەستاین و چەند وشەیەکمان دەگۆڕییەوە .

ڕۆژان هاتن ، ڕۆژان ڕۆیین . کەم کەم لێکدابراین . شەهید عەزیز چووە ئامادەیی و پاشان کۆلیژی ئاداب لەبەشی کوردی لەزانکۆی بەغدا . منیش ڕۆژگار دەرفەتی خوێندنی بالای بۆ نەرەخساندم و لەشارەوانی بوومە فەرمانبەر . سەرەڕای لێکدابران و دوورکەوتنەوەمان جاروبار ، بەتایبەت

لەوەرزی هاویناندا ، لەرێگەوباندا بەدیدارى یەکدى شاد دەبووینەوەو کەمێك دەمەتەقێمان دەکرد .

منیش وەك گەلێك لە دڵسۆزانى رێبازى رزگاریخوازانەى کوردستان ، پارچە پارچە بوونى پارتى دیموکراتى کوردستان نیگەرانى کردبووم . لەکارى حیزبایەتى خۆم کێشایەوە و لەتوێى کتێبە چەپرەوەکاندا بەدووى ئەڵتەرناتیڤێکى نوێدا وێڵ بووم . لەنیوەى دووەمى ساڵى (١٩٦٩)دا ، لەگەڵ چەند برادەرێکى موتمانەداردا ئەڵقەیەکى رۆشنبیریمان بۆ خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە سازکرد . پاش چەند کۆبوونەوەیەك تێگەیشتین کەئەڵقەکەمان یەکێکە لەزنجیرە ئەڵقەیەك کە بەشێوازێکى سیستێماتیك بەرەو دیتنەوەى ئەڵتەرناتیڤێکى لەپێشەوە فیکرى و پاشان سیاسى هەنگاو هەڵدەگرێ . بەڵێ ئەم زنجیرە ئەڵقەیە وردەوردە زەمینەى هاتنەکایەى کۆمەڵەى خۆش کرد .

کاتێ لەکۆبوونەوەو مشتومڕەکانماندا باسى کادێرى لێوەشاوەو لەناو خەڵکدا خۆشەویست دەکرا ، ئەمن ئۆتۆماتیکى کاك عەزیزى هەنووکە شەهیدم دێنایە پێش چاو. لەدڵى خۆمدا دەموت (ئەو دەبێ ئێستا زۆر لەجاران چست و چالاکتر بێ، لەجاران خۆشەویستتر و جەماوەریانەتر بێ. ئەو جاران کە قوتابى بوو لەناو هەموو توێژاڵە کۆمەڵایەتییەکاندا دۆستى هەبون ، لەگشت لاوە خەڵکى دڵى خۆیان بۆ ئاواڵە دەکرد و ئەو جێگاى موتمانەیان بوو ، دڵنیام ئێستا زۆر لەوە زیاتریشە).

چەند جارێك پێشنیارى دۆزینەوەو پەیوەندى پێوەکردنیم کرد، بەبیانووى پاراستنى نهێنییەکانەوە ، یاجارێ زووە و نامانەوێ زۆر گەشەبکەین ، پێشنیارەکەیان رەتکردەوە .

چەند مانگێک دواتر لەگەڵ هاوڕێیەکدا لەناو بازاڕ رێکەوتی مامۆستا عەزیزمان کرد ، چۆنیو چاکییەکی زۆر لەجاران گەرمترمان کرد . کەکاتی دۆعا خوازی هات ، چەندم دەکرد لاقەکانم لەدووم نەدەهاتن ، نەمدەویست ، دڵم نەدەهات نهێنییەکانی دڵمی بۆ دەربکێنم و باسی کۆمەڵەی بۆ نەکەم . هاوڕێیەکەم پەلی گرتم و لەمامۆستا عەزیزی جوێ کردمەوە و دۆعاخوازیمان لێکرد . زۆر سەرزەنشتی هاوڕێیەکەم کرد ، باسی بلیمەتی مامۆستا عەزیزم بۆ کرد ، وتم دەبێ تێم بگەیەنن بۆ خۆتان لەو پیاوە کەموێنەیە دوور دەگرن ، خۆ خوانەکردە ......، هاوڕێیەکەم قسەکەی پێ بڕیم و وتی : بەسە بەس عەزیز لەمێژە لەگەڵدایە ، ئیدی دڵت تێر ئاو بخواتەوە ، دەی خۆت بگرەو لای هیچ کەس مەیدرکێنە .
ئاو کرا بەئاگردا و سوکناییم هات ، لەوەش دڵنیابووم کە کۆمەڵە زۆر لەوە فراوانتر و گەشەدارترە کەتا ئەودەمە بەندە بەبیریا دەهات .

<u>شەهید عەزیز و شاخ :</u>

هاوینی ساڵی ١٩٧٧ ، بەداخەوە تەواو دڵنیانیم کام رۆژی چ مانگێک . بەلای زۆرەوە رۆژێکی گەرمی مانگی تەمموز بوو لەگەڵ شەهیدی سەرکردە ، پێشەواو بنیاتنەری مەفرەزە سەرەتاییەکان ، رێچکەشکێنی رێبازی دیموکراسی و پلۆریالیزم هاوڕێ ئارام و مەفرەزەیەک پێشمەرگەدا کەبە دەستەکەی شەهید ئارامیشەوە ژمارەیان لەژمارەی پەنجەکانی دوو دەست تێنەدەپەڕین ، لەکوزەرێکی (جەولە) پێشمەرگانە ، بەرەو گوندی گورباز دەگەڕاینەوە ، ئەوێ رۆژێ گورباز لەتەک تەنگیسەردا ببونە دوو قەڵای

مەفرەزە سەرەتاییەکان ، دوو پێتەختی چالاکییەکانی کۆمەڵە . پێش ئەوەی بگەینە گوندەکە ، هەواڵی هاتنی هاوڕێیەکی نوێمان پێگەیشت ، وەك گشت جاران رووممان کردە ماڵی (مام ساڵح)ی بابی (مەولود گوربازی) . هاوڕێ نوێیەکەش هەر لەوێ چاوەڕوانیی گەڕانەوەمان بوو . هەواڵی گەڕانەوەمانی پێدرا ، بەپیرمانەوە هات بەندەو شەهید ئارام چاویلکە پزیشکییەکانمان شکابوون . بەرلەوەی هێندە نزیك ببینەوە تا هاوڕێ نوێیەکە بناسینەوە ، ئەو هەر وەك خۆی ، وەك جاری جاران ، لەدوورەوە کردیە هەڵاو خۆشی و جۆنییەکی پڕ لەگاڵتەو گەپ : (ئەوە ئێوە لەکوێن مردوو ؟ خۆ من مردم ، هێندە دارو بەرد و گوندەکانی ناوچەکەم لەدووتان شێلا ، منیش واهاتم ، دەبمە پێشمەرگە ، با هەر ئەمشەو هەڵکوتینە سەر حکومەتی قەرەداغ و پڕ فیشەکی کەین ، دەی کوا بێنن کلاشینکۆفێکم بدەنێ) . هەر کەزاری هەڵهێنایەوە من و شەهید ئارام بەدەنگە بڵند و زوڵاڵ و پڕگاڵتەکەیدا هاوڕێ نوێیەکەمان ناسییەوە کەمامۆستا عەزیزە . تێر ئەملاولایمان ماچ کرد و بەخێرهاتنێکی گەرممان لێکرد.

مامۆستا عەزیز ڕانکو چۆغەیەکی سپی، وەك شیری پۆشیبوو، کراسەکەشی هەر سپی جوتێ کلاشی دۆمی نوێی لەپادابوو چوون چۆڕی شیر. پێدەچوو بۆ سەیران هاتبێ نەك پێشمەرگایەتی .

لەگەڵ شەهید ئارام و شەهید حەمەئەمین پۆلا و کاك ئاوات قارەمانیدا ، مامۆستا عەزیزمان ڕێنمایی کرد بۆ ماڵی ئاوات قارەمانی. پشتی نانخواردن و کەمێك حەوانەوە ، سەرمان کردە سەر مامۆستا عەزیز، هەر یەکەو لای خۆیەوە دامانە بەر توانج : (بۆ پێشمەرگایەتی هاتووی یان گەشتوگوزار، جا چۆن ئێمە نازی ئەم هەموو قۆزێتییەو پاکوخاوێنێتییەی تۆمان بۆ

هەڵدەگیرێ ، مەگەر دەستێ جلوبەرگی شڕو چڵکنت بۆ پەیدا بکەین ، دەنا شەرمەمان پێدێت لەگەڵ خۆمانت بگێڕین) مامۆستا عەزیزیش وەك خۆی ، وەك هەمووکات ، لەبەرپەرچدانەوەی توانجەکانمان دانەدەما ، هەمیشە وەڵامی حازر و گونجاوی بۆ هەر توانجێك پێبوو .

ئەو دەمە ناچاری دەبوایە شەو پێشمەرگە لەگوندا نەدەمایەوە . بۆ یەکەم شەوی پێشمەرگایەتی مامۆستا عەزیز ، وتمان جێگەیەکی خۆش هەڵدەبژێرین، یاڵێکی بەرزو شەماڵگر ، یان دۆڵێکی کپ و بێدەنگ. یاڵەکەی پشت گوربازمان هەڵبژارد کەپشتی بەدامێنی چیای چالاوەوە بوو. لێفەیەکی تارادەیەك خاوێنمان لەناو لێفە خواستراوەکانماندا بۆ مامۆستا عەزیز هەڵبژارد. من و شەهید ئارام هەمیشە لەتەنیشت یەکەوە دەنوستین ، یان هەر لێفەکانمان رادەخست و لێفەکەی دیمان پێکەوە دەدا بەخۆدا ، ئەوێ شەوێ من جێگەکەی تەنیشت شەهید ئارامم بۆ مامۆستا عەزیز چۆڵ کرد ، دەمزانی باس و خواستی زۆری رێکخستنەکانی کۆمەڵەیان لەناوشاردا دەبێ ، شەو تادرەنگانێك ئاگاداربووم ، پێکەوە ورتەورتیان بوو . رۆژی دوایی ، بەیانی زوو ، بەرلەگزنگ بەلێفەکانەوە گەڕاینەوە گوند . هەر لێفەیەك پێشمەرگەیەکی لەگەڵ خۆدا ، بۆ بەرچایی ، بۆ ماڵی خاوەنەکەی داوەت کرد . ماوەی بەرچایی خواردن دەبوو کورت بێ، دەبوو بەر لەکاتی هەستانی هەلیکۆپتەرەکان ئاواییمان جێهێشتبێ و خۆمان لەئەشکەوتێکدا، کەندەلانێکدا یان کۆمەڵە دارو دەوەنێکی چڕو پڕدا حەشار دابێ.

## مامۆستا عەزیز و برنەوەکەی :

بەرلەوەی دنیا تەواو رووناك بێتەوە گوربازمان بەجێهێشت ، بەئاراستەی تەنگیسەر کەوتینەرێ ، لەخۆراوای کونەکۆترەوە بەدامێنی چیای کەلەوریدا بەرەو دارستانەکەی بنار هەلگەڕاین . جێگەیەکی گونجاومان هەلبژاردو قوتاغمان خست . دەبوو تا خۆراوایەکی درەنگ لەو نا دارانەدا سەتار بگرین. ئەوجا بەپێی نەخشەی ئەو رۆژەمان بچین بۆ گوندی تەنگیسەر و لەوێ شێویکەین ، مامۆستا عەزیز چەند جارێك باسی چەکی هێنایە ئاراوە، داوای کلاشینکۆفێکی دەکرد . کلاشینکۆفێکی زیادەمان نەبوو. شەهید ئارام پێی وت : برنەوێکی درێژمان هەیە ، لەسەرزەل دامان ناوە ، سبەی یان دەچینە سەرزەل یان دەنێرین بۆت بهێنن . دیاربوو مامۆستا عەزیز حەزی لەتفەنگی برنەو نەبوو ، ئەو دەمە هیچ پێشمەرگەیەك برنەوی پێنەبوو ، برنەو نەك هەر باوی نەمابوو ، کەلکێکی ئەوتۆشی بۆ شەڕی پارتیزانی لێ وەرنەدەگیرا .

مامۆستا عەزیز تێکەڵ بەگاڵتەو گەپ وتی : بڕوا ناکەم برنەوتان هەبێ ، نابینم کەس لەپێشمەرگەکان برنەوی هەلگرتبێ ، بۆیە ئەگەر برنەویشتان هەبێ ، من هەر کلاشینکۆفم دەوێ . شەهید ئارام دلنیای کرد لەوەی کەحالی حازر کلاشینکۆفمان نییە ، وتی : تۆ جارێ دەرهەق زەمانە برنەوەکە هەلگرە ، بەهیمەتی ئەو پێشمەرگە دلێرانە ، بەمزووانە کلاشینکۆفیش پەیدا دەبێ . مامۆستا عەزیز وتی باشە ، چارم نییە ؟ ئەگەر برنەوەکە هەلنەگرم خەلکی گوندەکان بەجاش و زیندانیم تێدەگەن .

رۆژی دواتر مامۆستا عەزیز بڕنەوە درێژەکەی کردە شانی ، کەمێك لەخۆی وردبووەوە ، ئەوجا تەماشایەکی ئێمەی کرد کەکلاشینکۆفمان هەلگرتبوو . ئەنجا بەدەنگێکی بەرز وتی : توخوا خەلکینە بۆ منتان نەبێ ، بۆ خواتان بێ ، ئەمەی بەمنە چەکە یان دارشەق ؟ باشە من شەڕە تفەنگی پێبکەم یان شەڕە تێلا ؟ هەموو پێکەوە دامانە قاقای پێکەنین .

هێندەی نەخایاند ، رانکوچۆغە سپییەکەی لەچلکدا خاکی دەینواند . مامۆستا عەزیز بۆ خۆیشی زۆر زوو لەتەك بارودۆخی سەختی پێشمەرگەیەتیدا راهات . ئەوی دانووی لەگەلدا نەدەکولا خۆی وتەنی تەنیا دارشەقەکەی بوو .

چەند هەفتەیەك گوزەرا ، جاشێك کلاشینکۆفێکی بۆ مامۆستا عەزیز کردە دیاری! لەخۆشیاندا پێی لەعەرد نەدەکەوت کەلە قەدو بالای خۆی ورد دەبووەوە و دەستی لەمەخزەنەکانی دەدا ، دەیگوت : کوڕینە تەماشام کەن، ئێستا لەپێشمەرگە دەچم ، ئەو دارشەقە نەگریسە هەر حەیای بردم. کردبوومی بە فورسان . بەس نەبوو بەبڕنەوەکەوە نەکوژرام ، وەلاهی نە پلەی شەهادەتم وەردەگرت نە تەرەماش . تۆ تەماشاکەن ، پێشمەرگەیەکم بمبژێری ، تازە شەهیدیش بم چش .

<u>یەکەمین بەشداریکردنی مامۆستا عەزیز لەچالاکییەکی پێشمەرگانەدا</u> :

کات پاشنیوەڕۆیەکی یەکێ لەرۆژە دواییەکانی مانگی تەمموزە . دوو لە (٤) مەفرەزەکەی ناوچەی قەرەداغ و گەرمیان بۆ گوزەرێکی پێشمەرگانە یەکیان گرتبوو . لەهەیوانی مزگەوتەکەی گوربازدا خڕبووبوونەوە ، شەهید

ئـارام دەربـارەی گوزەرەکـەیان قسـەی بـۆ دەکـردن . لـەناکاو سـلاوێکی بچڕبچڕی کابرایەکی هەناسە سوار باسەکەی بەشەهید ئارام بڕی و دڵـی هـەمووانی داخوڕیان . بەدەنگێکی بەرزی بانگەواز ئاسا و خـەمین وتـی : (فریاکـەون ، مەفرەزەکـەی کـاك ئـازادی – سـەگرمە "ئازاد حەمـە غـەریب" لەتـەختایی مـەزراکانی دامێنـی گوندی بـاپیری‌دا لەلایـەن جاشـەکانەوە گـەمارۆدراون و رێگـەی دەربازبوونیـان لـێگیراوە ، حاڵیـان شـڕە و ئەگـەر هەلیکۆپتـەرەکانیش بگەنـە سـەریان هـەموویان شـەهید دەکـرێن ، یـان بەزیندوویی دەگیرێن . من جوتیارێکی باپیریم و لەوێوە یەکبینە بەراکردن هاتووم پێتان رابگەیەنم ، مەردی خوابن و خێرا هەر ئێستا بەفریادیانەوە بچن) .

شەهید ئارام و کاك ئاوات قارەمانی دەنگیان لەپێشمەرگە کرد و ئەوەندەی بڵێی یەك و دوو پێشمەرگەکان خۆیان کۆکردەوەو ئامادەبوون .

نایەتـەیادم بـۆچ کـاك ئـاوات کـەئامێر کـەرتی قـەرەداغ بـوو ، تـەنیا دەمانچـەیەکی پێبـوو . رووی دەمـی لـەمن کـرد و داوای کلاشـینکۆفەکەی لێکردم . منیش وتم مەگەر خۆم پێویستیم پێی نابێ ؟ شـەهید ئارام وەڵامـی دامـەوە : نـەخێر تـۆ و سـامی شـۆڕش (کـەتازە لەسـووریاوە گەیشـتبۆوە کوردسـتان) لەگـەڵ منـدا دەمێننـەوە ، تفەنگەکـەت بـدە بـەئاوات بـا ئـەویش دەمانچەکەی بدات بەتۆ . دیسـان من پێم شەرم بوو لـەو کاتـە ناسـکەدا ، لەبـەردەم پێشـمەرگەکاندا چەکەکەم لـەخۆم دامـاڵم و بیـدەم بەکەسێکی تـر . مامۆستا عـەزیز بەتوڕەییەوە نەڕانـدی بەسـەرما : ئاخر مزەمـەعیل تۆ بـەبێ چاویلکە دنیت چ دەکەی ، جاشـەکان لەسـەنگەردان و خۆیـان حەشـارداوە ،

تۆش فیل لەدووری (١٠) مەترەوە نابینیت ، مەگەر تەقە لەخۆمان بکەیت ..
یاڵلا تفەنگەکەی بدەرێ و دوامان مەخە .

ئا لەو کاتە ناسك و تراژیدیاییەدا پێشمەرگەکان خۆیان پێنەگیراو دایانە قاقای پێکەنین . منیش بێ دەنگ چەکەکەو مەخزەنەکانم دانە دەست ئاوات و دەمانچەکەم لێوەرگرت. پێشمەرگە چست و چالاکانە، بەهەڵەداوان بەرەو گوندی بارۆیی کەوتنەرێ .

## پاسەوانییەکەی سامی شۆرش :

ئەو شەوە من و شەهید ئارام و سامی لەگوندی گورباز ماینەوە . شەو لەسەربانی ماڵی مەولود گوربازی جێگەمان راخست ، گەلێك لەپیاوانی گوندەکە لێمان خڕبوونەوە . زۆر نیگەران بووین دڵمان لای پێشمەرگەکان بوو . درەنگانێك خەڵکەکە چوونەوە ماڵەکانیان . ئێمەش وتمان ئەگەر هەریەکەی (٢-٣) سەعاتێك بنوین چاکە ، کێ دەڵێ سبەینێ ئێمەش بەرەو بارۆیی ناکەوینەرێ ؟ لەناو خۆماندا رێکەوتین کەیەکەم دوو سەعات من پاسەوان بم ، ئەوجا سامی و دوای ویش شەهید ئارام . من دوو سەعات پاسەوانی خۆم گرت و سامیم بێدارکردەوە . زەردە دابووی لەشاخ بەئاگاهاتم دیتم کەس بێدار نییە . دەنگم لێکردن و بەخەبەرم هێنان . پرسیم بۆ کەس پاسەوان نییە ؟ کامتان لەنۆرە پاسەوانییەکەیدا خەوتووە ؟ شەهید ئارام وتی کەس منی بێدار نەکردۆتەوە ، ئەگەر تۆ سامیت بەئاگاهێنابێ ، ئەوا ئەو خەوی لێکەوتۆتەوە و ئەو تاوانبارە . بەڵێ سامی لەنۆرە پاسەوانییەکەیدا خەو زەفەری پێبردبوو . هەردووکمان رووی

سەرزەنشتمان کردە سامی و بەرەخنەو تانە و توانج دامانگرتەوە . دەمانگوت هەر پاسەوانێك لەدۆخێکی ئاوەها ترسناك و ناسکدا خەوی لێبکەوێت ، دەبێ سزاکەی لەمردن بەولاوە چ بێ ؟

هەر ئەو رۆژە نزیك چێشتەنگاو پێشمەرگەکان بەمەفرەزەکەی ئازادی سەگرمەشەوە گەڕانەوە لامان . کاك ئاوات و دوو مەفرەزەکە لەکاتی خۆیدا گەیشتبوونە فریای گەمارۆدراوەکان . جاشەکانیان هەڵپڕیبوو ، تەرمی سەرەك جاشەکەیان بەکلاشینکۆفێك و دەمانچەیەکی چواردەخۆرەوە لێبەجێمابوو . زیانی پێشمەرگەش سووکە زامێکی تەوێڵی مام رۆستەم بوو. گوللەیەك دابووی لەبەردێکی بەردەم مام رۆستەم، هەڵگەڕابووەوە و لەنێوچاوانی چەقیبوو* .

پێشمەرگەکان باسی حەماس و ئازایەتی و نەبەردیی مامۆستا عەزیزیان دەکرد . دەیانگوت نەعرەتەی ئەو نەبوایە جاشەکان بەئاسانی نەدەشکان . کەچی مامۆستا عەزیز بۆ گاڵتەو گەپ رەحمی بەخۆیشی نەدەکرد، دەیوت: راست ناکەن ، من نەمتوانی بەشاخەکەی بارۆییدا سەربکەوم . ماندو بووم و لەسەر چەقی رێگاکە خۆمدا بەزەویدا . بەپێشمەرگەکانم وت ئێوە بڕۆن ، منیش پشوویەك دەدەم و لەدووتان دێم . خەو بردمیەوە ، لەخەومدا خوا بەخێری بگێڕێ جاشەکانمان تێکشکان و دوو دانە تەرممان پێ بەجێهێشتن. خەریکبووم چەکەکانیان هەڵگرمەوە ، ئاوات قارەمانی بێداری کردمەوە. وامزانی تازە خەوم لێکەوتووەو ئەوانیش گەڕاونەتەوە سەرم تا

---

* سەرگوزشتەیەکی ئەو زامەی مام رۆستەمیشم لایە ، بەهیوام بتوانم لەبوارێکی دیدا باسی بکەم .

لەگەڵیان بڕۆم، تومەز ئەمە ڕۆژی دووەمەو ئەوان لەگەڕانەوەیاندا خەبەریان کردووەمەتەوە.

## قاز و پاسەوان :

پاشنیوەڕۆی ڕۆژی گەڕانەوەی مەفرەزەکان بەرەو گوندی قازانقایە کەوتینەڕێ. لەوێ بۆ حەوانەوە لاماندا . شەهید ئارام بێ ئەوەی باسی پاسەوانێتییەکەی سامی بکات ، مەسەلەی خەولێکەوتنەوەی پاسەوان و ئاکامە ترسناکەکانی زۆر بەجیدی باسکرد . هێمای بۆ هەندێ بزووتنەوەی پارتیزانی کرد کەسزای مەرگیان داوە بەهەر پاسەوانێك خەوی لێکەوتبێتەوەو ژیانی هاوڕێکانی خستبێتە مەترسییەوە . لەو کاتەدا مامۆستا عەزیز دەمی نایە بناگوێی ئاوات قارەمانی و چرپانی بە گوێیدا . ئاوات خۆی پێرانەگیراو لەگەرمەی قسەکانی شەهید ئارامدا دایە قاقای پێکەنین . شەهید ئارام زۆر تووڕە بوو ، ئاواتیش بۆ پاساودانەوەی قاقاکەی وتی : مامۆستا عەزیز چرپانی بەگوێمدا : (ئێمەی پێشمەرگە کەهەمیشە شەو ورۆژ دەدەینە دەم یەك ، ئێمەی کەمخەو و ماندوو ناوبەناو لەکاتی پاسەوانیدا خەومان هەر لێدەکەوێ ، ئەگەر مەفرەزەکان سەرو قاز پەیدا نەکەن تالەگەڵ خۆیان بیگێڕن شتاقمان دەرناچێ ، هەموومان سزای مەرگ بەرودوا مسۆگەر دەکەین ، قاز لەسەر یەك لاق رادەوەستێ ، کەخەوی لێدەکەوێ لەترێك دەدا و خێرا بەئاگا دێتەوە و دەیکاتە قیڕەقیڕ . جاگەر پاسەوانەکە خەوی بێت یان خەوی لێکەوتبێ ، قازەکە زوو زوو بێداری دەکاتەوە و لەسزای مردن قورتاری دەکا) . هەموومان بەشەهید ئارامیشەوە

دامانە قاقای پێکەنین . پاشان شەهید ئارام وتی : ((شکور وشیارە "محی" تێدەگا دونیا خەراباتە))* .

لەکۆتاییدا دەمەوێ بڵێم مامۆستا عەزیز سەرەڕای ڕۆڵی گرنگی لەکۆمەڵەو یەکێتی نیشتمانی کوردستاندا ، تابڵێی سادەبوو ، لەرەفتاردا تا حەزکەی سەرڕاست و بێ پێچ و پەنا بوو ، هەمیشە و بۆ هەموو هاوڕێکانی دڵسۆز و ڕاستگۆ بوو .لەبەر بەجێهێنانی ئەرکەکانیدا نەفەسدرێژ بەرگەگر بوو ، پرنسیپەکانی بەهەند دەگرتن و سازشی لەسەر نەدەکردن . بەقسە خۆش و گاڵتەو گەپەکانی نەیدەهێشت گەردی نیگەرانی لەسیمای هاوڕێیەکانی بنیشێ . بوێر بوو ، هەرگیز بۆچوونەکانی نەدەشاردەوەو هیچ حیسابێکی بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی نەدەکرد . ئەو چەند مانگەی پێکەوە بووین بۆ تاکە چرکەیەکیش نەمدی ڕەشبینی و ماتەمینی زەفەر بەگەشبینی و زەردەی سەر لێوەکانی ببەن . هەمیشە گفتار و کرداری چوونیەك بوون ، ورەی وەك پۆڵا قایم ، هەستی وەك گوڵاڵە ناسك و گفتاری چوون شەکرەسێو شیرین بوو .

هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی مامۆستای شەهید
عەزیز مەحموودی هەمیشە زیندوو

سلێمانی
٩ی مایسی ٢٠٠٤

---

* ناوە پارتیزانییەکەی مامۆستا عەزیز "محێدین" بوو. بۆیە شەهید ئارام لەو نیوە بەیتە شیعرەی مەحویدا ناوی (مەحوی) گۆڕی بە (محی).

## بانگەوازێك بۆ هەموو هاوڕێیانی شەهیدی سەکردە مامۆستا عەزیز مەحمود

بەپێی بەرنامەیەکی داڕێژراو ، خەریکی نووسینەوەی مێژووی ژیاننامەی شەهیدی سەرکردە (مامۆستا عەزیز مەحمود)ین ، داوا لەهەریەك لەو بەڕێزانە دەکەین ، کەهاوڕێیەتی شەهیدیان کردووە ، لەخەباتی سیاسیی و ڕێکخراوەیی و پێشمەرگایەتیی و کۆمەڵایەتیدا ، ئەو یادەوەری و بیرەوەرییانەی لەگەڵ شەهیدا بوویانە .. بۆمان بنووسنەوە ، بەنامە یان بەڕێگای فاکس بۆمان بنێرن .. بەدەنگەوە هاتنتان وەفایە بۆ هاوڕێی شەهیدتان .

لەگەڵ ڕێزدا ..

محەمەد عەبدولکەریم سۆڵەیی
مامۆستا (شێخ محەمەد)
بەڕێوبەری گشتی
چاپ و بلاوکردنەوە لەوەزارەتی رۆشنبیری

E-mail:knwe@aol.com
Knwe2002@yahoo.com
(Homepag)
(www.puk.org)
(www.pukmedia.net)

## بانگەوازێك بۆ هەموو هاوڕێیانی هەردوو شەهیدی سەرکردە
## (مامۆستا جەمال تاهیر) و (مامۆستا عەزیز مەحمود)

بەبەرنامەیەکی داڕێژراو ، دەستمانکردووە بەنوسینەوەی مێژووی ژیاننامەی هەردوو شەهیدی سەرکردە مامۆستایان (جەمال تاهیر و عەزیز مەحمود) داوا لەهەریەك لەو بەڕێزانە دەکەین کەهاوڕێیەتی هەردوو شەهیدیان کردووە لەخەباتی نهێنی و ڕێکخراوەیی ، زیندانی و کۆمەڵایەتی و پێشمەرگایەتیدا ، هەریادو بیرەوەرییەکیان هەیە بەڕێگای ئەم ناونیشانەی دەینووسین بۆمان بنێران ، بەدەنگەوە هاتنتان نیشانەی وەفایە بۆ هاوڕێی شەهیدتان .

لەگەڵ ڕێزدا ..


<u>ناونیشان</u>

سلێمانی گەڕەکی (۱۰٥) ئەندازیاران

کۆڵانی (۲٥) . بەرامبەری مەکتەبی

ناوەندی ڕاگەیاندنی یەکێتی نیشتمانی کوردستان

بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

ژمارەی تەلەفۆن / ۳۱٥۰۹۹٤

E-mail:knwe@aol.com
Knwe2002@yahoo.com

بۆ هەڤاڵی بەڕێز ..................

سڵاوێکی شۆڕشگێڕانەی گەرم

## بابەت / نووسینەوەی ژیاننامەی شەهید مامۆستا عەزیز مەحمود

بەڕێزتان .. هاوڕێی شارو شاخی شەهید بوون ، یاد و یادەوەریتان بەیەکەوە بووە ، لەو یاد و بیرەوەریانە چیتان لەیاد ماوە ، لەسۆنگەی ئەم پرسیارانەوە . بفەرموون بەدوور و درێژی بیرەوەرییەکانمان بۆ تۆمار بکەن .. هاوکاریتان وەفایە بۆ شەهید .

پ١/ کەی ، چۆن ، لەکوێ ، یەکترتان ناسی ؟

پ٢/ رۆژانەی ژیانتان چۆن بەیەکەوە بەسەردەبرد ؟

پ٣/ پلەی لەکاری حیزبی و رێکخراوەییدا چیبوو ؟

پ٤/ کەی و لەڕێگای کێوە تێکەڵاوی خەباتی سیاسی و کوردایەتی بوو ؟

پ٥/ کەی و لەکوێ بوو بەپێشمەرگە ؟ پلەی لەپێشمەرگایەتیدا چیبووە ؟ چەند ساڵ پێشمەرگە بووە ؟

پ٦/ کی ، بۆ ، لەکوێ گیرا ؟ لەکاتی گرتندا پلەی چیبوو ؟

پ٧/ کەی و لەکوێ لەسێدارە درا ؟

پ٨/ نووسینی هەبوو ؟ لەچ بوارێکدا دەینووسی ؟ نووسینەکانی لەچ بڵاوکراوەیەکدا بڵاوکردۆتەوە ؟ هیچ نووسینێکیت هەیە ؟

پ٩/ لەنوکتەو قسە خۆشەکانی چی لەیادماوە ؟

پ١٠/ لەکۆاییدا چیتر بەشایستە دەزانیت لەسەر شەهید بینووسیت ؟

**سەرنج**

١- بەڕێزاتان ئازادن لەوەڵامدانەوەی پرسیارەکان ، یەکەیەکە یان سەرجەم لەدووتوێی پەرەوەریدا بیاننووسنەوە .

٢- وەڵامی پرسیارەکان لەماوەی (١-٢) مانگدا دەبێت .

٣- هەر وێنەیەکتان لەگەڵ شەهیددا هەیە ؟ نووسخەیەکمان بۆ بنێرن ، لەدواجاردا بۆتان دەگێڕینەوە .

٤- کەوەڵامەکانتان تەواوکرد . بەڕێزتان سەرپشکن بەکەسێکی متمانەپێکراوی خۆتان بۆم بنێرنەوە یان تەلەفۆن بۆ ئەم ژمارەیە بکرێت بینێرین لەبەڕێزتانی وەرگرنەوە .

١- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە ٢١٥٠٩٩٤

٢- محەمەد سۆڵەیی / ماڵەوە ٢١٥١٠٦٥

محەمەد عەبدولکەریم سۆڵەیی

بەڕێوەبەری گشتیی

چاپ و بڵاوکردنەوە

لەوەزارەتی رۆشنبیری

وێنەکان

دیکۆمێنتی وێنەکان

لەوێنەکانەوە گەشبینیو مێژووی

ژیانی شەهید دەردەکەوێ

سەرچنار / ١٩٥٦
راوەستاوەکان : ٢١
٢- قادری فۆتەدروو
دانیشتووەکان : ١-
٢- محەمەد بابز
٣- مامۆستا عەزیز٤ فازل جەلال

شەهید عەزیز
١٩٥٩/١١/١
سەرچنار

## شەهید و وەرزش

١٩٦٢

لەراستەوە بۆ چەپ : نوری حاجی عەلی – رەفیق عومەرە گۆج – شەهید عەزیز
فائیق عومەرە گۆج – کامیل شەفیق – محەممەد بابز – سالار عەزیز حیکمەت
دوانەکەی تر نەناسراونەتەوە

بەغداد / شەقامی کفاح

١٩٦٤/٢/٢٩

نەوزاد - حەمید کەریم

مەسعود - شەهید عەزیز

سەرای سوبحان ئاغا

١٩٦٤/٤/٢

یونس - رەزا - کەمال-

مەسعود - عەزیز نوری

سلێمانی / بەردووکانی

نوری وەستا غەفور

عادل یونس - عەزیز

١٩٦٥/٩/٤

**شەهید عەزیز و بووکردنەوە**

بەربەستی ئاوی دوکان

١٩٦٥/٧/١٢

بەربەستی دوکان ، ١٩٦٧/٤/١٤ بەجلی کەشافەوە

لەراستەوە بۆ چەپ ، سامان عەبدوڵڵا – ئەنوەر مەحمود – بابە عەلی شێخ – حەسەن قەروان –

حەمەی شێخ ئەحمەد - جەلال فەروخ – شەهید عەزیز

یونس غەطور و شەهید عەزیز ١٩٦١/٢/١

شەهید عەزیز - خورشیدە خانی دایکی

شەهید عەزیز و وەرزش

لەم وێنەیەدا تەنها شەهید عەزیزو شەهید یاسین و تەحسین گەرگووکی ناسراونەتەوە

بەغداد ١٢/٤/١٩٦٩

بەغداد ١٩٦٩/٤/٢

عەلی جاف. شەهید عەزیز. محەممەد جووجەر. دلشاد مەریوانی. حەمە سەعید

سەیرانی سامەرا مانگی ١٩٦٩/١

یەکەم ساڵی خوێندنی زانکۆ

شەهید عەزیز. شێخ محەممەد. مەحموود زامدار. شەهید یاسین

سەدری قەنات ١٩٧٠/٦/٤

دانیشتووەکانی ریزی یەکەم: حەسەن حاجی تەیب – رۆستەم محەممەد – فازل حاجی لەتیف

دانیشتووەکانی ریزی دووەم: ئەوزاد کامیل – د. جەمیل – شەهید عەزیز – بورهان شەرعی – ئەنوەر مەحمود

سامەرا / ١٩٦٩

شەهید عەزیز. شێخ محەممەد. سەباح عومەر عەلی. ئەنفەسراوە. حەمید کۆیی. یوسف ئاکرێیی. مومتاز حەیدەری

سەیرانی حەبانیە ١٩٧١

د. شوکریە رەسول ئەسغەر تالیب ئەنفسەراوەتەوە عەبدولڕەحمان محەممەد دکتۆر مارف خەزنەدار شەهید عەزیز گێلاس عەل قادر مەعروف شێخ محەممەد سامی شۆرش

سەیرانی سامەرا ١٩٦٩

شەهید عەزیز شێخ محەممەد نوری حەیران د. مارف خەزنەدار تەحسین کەرکوکی

سەیرانی سەڵان پاک - ١٩٧١/٢/٢٤ جەژنی نەورۆز

لەتوم مەحمود مامۆستا نەجات عوسمان خەزنەیی شەهید عەزیز حەمە جوجە نەناسراوەتەوە نەوزاد کامل

<u>شەهید و شەماڵ</u>

شەهید عەزیز. (لەبیشتەوە) سامی شۆڕش

راوەستاوەکە:

مامۆستا جەباری حاجی محەمەد قزلەری

گوڵێزی ئادەب

شەهید عەزیز خوالێخۆشبوو
یوسف ئاگرتیی هونەرمەند

نەناسراوە حەمید بڵبلی پشتییەوە (جەمێ) شەهید یاسین نەنوەر شەهید عەزیز

سەیرانی بەسرە ١٩٧٢

نەسرین قوربانی- شەهید یاسین- مامۆستا عومەر شەهید عەزیز - عەبدولقادر حەسەنحسین- ئەنوەر مەحمود-
عەبدولقادر مەعروف- شێخ محەممەد- عومەر رەشید

شەهید عەزیز- تاهیر عومەر- گێلاس عەل- دلشاد مەریوانی

**<u>شەهید عەزیز و هەڵپەرکێ</u>**

ئیبراهیم ئیسماعیل - مامۆستا نەجات مامۆستا عوسمان خەزنەیی شەهید عەزیز

سەیرانی بەسرە - ١٩٧٢ لەناو قیتاردا

شەهید یاسین، شەهید عەزیز، نەجم خانەقینی

سەعیرانی بەسرە مانگی ١/١٩٧٢

عومەر ڕەشید مامۆستا عومەر شێخ محەممەد نەناسراوەتەوە شەهید عەزیز عەبدولقادر حەمەئەمین

سەعیرانی بەسرە / مانگی ١/١٩٧٢

شەهید عەزیز نەرمین قادر شێخ محەممەد هیوا عەلی قادر حەمە ئەمین مامۆستا عومەر

سەفەرانی حلله

نەسفەر تالیب- مامۆستا عەبدولڕەحمان محەممەد  عومەر محەممەد ڕەشید  دکتۆر مارف خەزنەدار  شەهید عەزیز  گەلاس عەلی قادر مەعروف  شێخ محەممەد- سامی شۆڕش

سەفەرانی بەسرە / مانگی ١/١٩٧٢

شەهید عەزیز  شەهید یاسین نەنوەر  نوری حەیران

سەفەرانی بەسرە ١٩٧٢

نەسرین قوربانی، شەهید یاسین، مامۆستا عومەر، شەهید عەزیز، عەبدولقادر حەمەحەسەن، ئەنوەر مەحمود

عەبدولقادر مەعروف، شێخ محەممەد، عومەر رەشید

سەفەرانی حلە

لەچەپەوە بۆ راست شێخ محەممەد، گێلاس عەلی، سامی شۆڕش، شەهید عەزیز، د. مارف خەزنەدار، د. فاروق عومەر

سەیرانی گوڵبە لەنەورۆزدا / بەغداد ١٩٦٩/٣/٢١ سلمان پاك

عادل جەلال محەممەد بلێز نەمیر قەصاب محەممەد جووجە عوسمان خەزنەیی شەهید عەزیز بەخشان جەلال

نازەنین سەکار عەلی ناجی

لەراستەوە: ئەنیس سامی شۆڕش شەهید عەزیز مەحموود عەبدولقادر محەممەد ئەمین

لەم وێنەیەدا ئەم کەسانە ناسراونەتەوە

نەرمین قادر- شەهید عەزیز- گێلاس عەل- سەلاح شوان حەمید بڵبلس دڵشاد مەریوانی- سوعاد ساڵح

سەبریە عارف

وێنەی دەرچوون / ساڵی ١٩٧٢

ئەم وێنەیە لەدوا ساڵی خوێندنی زانکۆدا لەبەردەم کۆلێژی ئادابی بەغدا لەساڵی ١٩٧٢ گیراوە کەسەرجەم خوێندکارەکانی پۆل چواری ساڵەکەن لەگەڵ ژمارەیەک لەمامۆستایانی بەشی کوردی وەکو د. عیززەدین مستەفا رەسوڵ ، د. ئیحسان فوئاد ، د. مارف خەزنەدار ، د. ساڵح ئەمی. لە

هەروەها شەهید عەزیز - سەعیە خان، خێزانی.

وێنەی دەرچوون / ١٩٧٢

ئەم وێنەیە تەنها قوتابییەکانی گرووپی ئەلف ، بەبۆنەی دەرچوونەوە گیراوە لەساڵی (١٩٧٢) لەبەردەم- کۆلێژی ئادابدا لەبەغدادو ئەم بەڕێزانەش لەوێنەکەدان : (مامۆستای وانەی علم النفس ، د. عیزەدین ، د. ئەحمەد عوسمان ، د. ساڵح ئەلی ، مامۆستا عەلادین سەجادی ، د. ئیحسان فوئاد ، د. مارف خەزنەدار ، شەهید عەزیز - سەبریەی خێزانی)

سالی ١٩٧٨

لەچەپەوە (کاک مولازم عومەر - پ.م/ حەبیب خالە شێخ سدیق- شەهید عەزیز- پ.م/ کاروانچی)

ئەم وێنەیە لەکاتی گەڕانەوەی کاروانی پێشمەرگەدایە لەناوچەی بادینانەوە بۆ ناوچەی سلێمانی

ریزی پشتەوە : مامۆستا سەلام عەبدوڵڵا - شەهید عەزیز شەهید جەمال عەل بەپیر . سەباح جەلال - شێخ بەکری ماوەت - مستەفا چاورەش - وەهبی سەرتیپ

ریزی دواوە : شێخ فەتاح - پ.م کەنعنانسراوەتەوە

ئەم وێنەیە لەکاتی گەڕانەوەی کاروانی پێشمەرگەدایە لەبادینانەوە بۆ ناوچەی سلێمانی

کۆبوونەوەی سەرکردایەتی (نۆکان)

دانیشتووەکان: قادر جەباری ، دکتۆر مەحمود ، سەید کاکە ، مولازم عومەر ، مەلا ناصح ، رەسوڵ مامەند

مام جەلال ، شمس الدین موفتی ، ئازاد هەورامی

راوەستاوەکان : دوو پێشمەرگە نەناسراونەتەوە سێهەم نەوشیروان مستەفا ، مامۆستا عەزیز

ئەم (٢) وێنەیە لەئەرشیفی کاک مولازم عومەرەوە دەستمان کەوتووە

## مەراسیمی هێنانەوەی تەرمی شەهید عەزیزو هاوڕێکانی لە موسڵەوە بۆ سلێمانی

## دوای ئازادی عێراق لە ١٨ / ٦ / ٢٠٠٣

# پێرست